زانا دانایە، دانا توانایە

و

# لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی

عەلائەددین سەجادی

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | سجادی، علاءالدین، ۱۹۰۷ - ۱۹۸۴م. |
| عنوان و نام پدیدآور | : | ئەدەبی کوردی و لیکولینەوە لە ئەدەبی کوردی: باوەری ئەدەبی تازە، لە کلاسیک، رومانتیک، سەریالی.ئەدەبی کوردی لە ژیر خیوەتی ئەم باوەرانەدا.هونراو و پەخشان لە ئەدەبی کوردیدا و بەشکردنیان، لیکوڵینەوە لە ئەدەبی کوردی/ دانراوی عەلائەددین سەججادی. |
| مشخصات نشر | | سنندج : کردستان ، ۱۴۰۰. |
| مشخصات ظاهری | | ۳۹۶ ص.؛ ۲۱/۵×۱۴/۵ سم. |
| شابک | | ۹۷۸-۹٦٤-۹۸۰-٤٤۳-۹ |
| وضعیت فهرست نویسی | | فیپا |
| یادداشت | | کردی. |
| عنوان دیگر | | باوەری ئەدەبی تازە، لە کلاسیک، رومانتیک، سەریالی. ئەدەبی کوردی لە ژیر خیوەتی ئەم باوەرانەدا.هونراو و پەخشان لە ئەدەبی کوردیدا و بەشکردنیان،لیکوڵینەوە لە ئەدەبی کوردی. |
| موضوع | | ادبیات کردی -- تاریخ و نقد |
| موضوع | | Kurdish literature -- History and criticism |
| رده بندی کنگره | | PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | | ۸۱۹/۲فا |
| شماره کتابشناسی ملی | | ۸۵۱۹۹۱۵ |
| اطلاعات رکورد کتابشناسی | | فیپا |

# لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی

«باوەڕی ئەدەبی تازە، لە کلاسیک، ڕومانتیک، سەریالی.
ئەدەبی کوردی لە ژێر خێوەتی ئەم باوەڕانەدا.
هۆنراو و پەخشان لە ئەدەبی کوردیدا و بەشکردنیان،
لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی»

دانراوی:

**مامۆستا عەلائەددین سەجادی**

سنە

# ئەدەبی کوردی

## و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی


| | |
|---|---|
| ✓ ناوی کتێب (نام کتاب): | ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی |
| ✓ دانەر (مؤلف): | عەلائەددین سەججادی |
| ✓ پیتلێدان (حروفچینی): | موحەممەد دانشگەر |
| ✓ پێداچوونەوە و نووسینی پەراوێز + دیزاین (بازخوانی و صفحەآرایی): | ڕەفیق ڕۆستەمی |
| ✓ کەڕەتی چاپ (نوبت چاپ): | یەکەم ١٤٠٠ـ٢٠٢١ |
| ✓ بەرگەژمێر (تیراژ): | ١٠٠٠ جلد |
| ✓ ژمارەی لاپەڕە (تعداد صفحات): | ٤٠٠ لاپەڕە (رقعی) |
| ✓ دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە (ناشر): | بڵاوکردنەوەی کوردستان (انتشارات کوردستان) |
| ✓ شابک: | ٩٧٨-٩٦٤-٩٨٠٠-٤٤٣-٩ |

✓ نرخ (قیمت): ١٢٠،٠٠٠ تمەن ـ ٨،٠٠٠ دینار

سنندج، چهارراه شهدا، پاساژ عزتی، انتشارات کُردستان، تلفن: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٠٨٧

سنە، پاساژی عیزەتی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردستان، تەلەفوون: ٣٣١٦٥٣٨٢ ٨٧ ٠٠٩٨

بەناوی خودا

ئێمە وەکوو بنەماڵەی مامۆستا عەلائەددین سەججادی «ئازدار سەججادی، دانش سەججادی»
ئیجازەمان داوەتە «ئینتیشاراتی کوردستان لە شاری سنە» هەموو بەرهەمەکانی باوکمان «مامۆستا
عەلائەددین سەججادی» چاپ و بڵاو بکەنەوە.
جگە لەوان هیچ کەس و لایەنێکی تر حەقی چاپکردنیان نییە!

نازدار علاءالدین سجادی
8-12-2016

دانش علاءالدین سجادی
8-12-2016

ئێمە وەکوو بنەماڵەی مامۆستا علاءالدین
سجادی مافی لە چاپدانی سەرجەم بەرهەمی
باوکمان داوەتە ئینتشاراتی کوردستان
لە شاری سنە وە هیچ کەسی و لایەنێکی تر
بۆی نییە چاپیان بکات جگە لەم دەزگایە
وە مافی لە چاپدانەوەی
پارێزراوە بۆ بنەماڵەی
مامۆستا علاءالدین سجادی

دانش علاءالدین سجادی
٢٠١٦/١٢/٢٩

# ناواخن

# پێشەکی

دوو جۆرە ڕاستی هەیە: ڕاستییەک بە چاو ئەو شتەوە کە تۆ وەیا من دەری ئەبڕین، کە ئەمە بەلامانەوە ڕاستە و لەگەڵ بیروباوەڕمانا بەرانبەری ئەکا، ڕاستییەکیش هەیە کە چۆنیەتی و حەقیقەتەکەیە، جا با من و تۆیش بە پێچەوانەوە بۆی بچین، نەئەنگاوتنی بیروباوەڕی هەندێ جاری من و تۆ بۆ ڕاستییە بناغەییەکە، ڕاستییەکە لە ڕاستی ناخا.

نەتەوەیەک هەیە کە «کورد»ە، دان نەنانی هەندێ کەس بەو نەتەوەیەدا، ئەوە نادا بەدەستەوە: کە ئەو نەتەوەیە بوونیەتی نییە، چونکە مادام ئەو لە ڕاستیدا هەبوو، ئەم باوەڕەی ئەم، بۆ نەبوونەکەی، ئەو بوونیەتییە بناغەییە ناکا بە نەبوونی.

بە وێنە: نەتەوەیەکی وەکوو «ئنگلیز» وەیا «عەرەب» کە من دانیان پێدا نەنێم، ئەم دان نەنانەی من بەوانا، ئەوان لە بوونیەتییە واقیعییەکە ناخا.

لەسەر ئەم بنچینەیە، ئەمەمان بۆ دەرکەوت: کە نەتەوەی کورد هەیە و هەبووە، لەبەر ئەوە کە ئەدەب لەگەڵ نەتەوەدا ئەچێ بەڕێوە، ئەبێ ئەدەبیش هەبووبێ، وەکوو چۆن دان‌نەنانی یەکێک بە نەتەوەکەدا، ئەوە نادا بە دەستەوە کە ئەو نەتەوەیە نییە، کۆشش نەکردنی ڕابوردووانی ئەو نەتەوەیەش بۆ پێگەیاندن و بەرزکردنەوەی ئەدەبەکەی، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەدەبەکە نەبووە.

نەتەوەی کورد گەلێ تەنگوچەڵەمەی وای لە لاپەڕەی مێژوویا هاتۆتە ڕێ، کە نەوەک نەیتوانیوە خەریکی ئەدەبەکەی بێ، بەڵکوو نەیتوانیوە خەریکی خۆیشی بێ!. لێرەدا پێویست بە باسکردنی ئەوانە ناکا، چونکە لە باسەکە لائەدا.

لە ساڵی «١٩٥٢»دا توانیم کتێبی «مێژووی ئەدەبی کوردی» بۆ یەکەمجار لە گێتی ئەدەبی کوردیدا بهێنمە بەرهەم، دیارە ڕەوڕەوەی گەردوونە ڕووە و پێشەوە ئەڕوا. پاش ئەوە کە لە ساڵی «١٩٥٩»دا بەشی ئەدەبی کوردی لە دانشساری زانکۆی بەغدادا دانرا، ڕوو لە من نرا کە ئەرکی بەشی ئەدەبییەکەی ئەو بەشە بگرمە ئەستۆ، هەرچەندە بە ئەرک بوو، بەڵام چونکە بۆ کورد بوو؛ بۆ ئەو کوردە بوو کە لە هەموو ڕوویەکەوە لە هەموو شت بێبەش کراوە، ئەو ئەرکە هیچ نموودێکی نەبوو، کەوتمە سەر ئەوە کە ئەو لاپەڕەیە لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا هەیە بەرانبەر بە ئەدەبی کوردی، ئەبێ تەماشای دیوەکەیتری بکرێ؛ تەماشای ئەوە بکرێ: کە ئەم ئەدەبی کوردییە ئایا چۆن لەگەڵ ئەم زانیارییانەی کە بەرانبەر بە ئەدەب داهاتوون، دەست ئەکەنە مل یەک؟.

بەو ناوەوە کە ئەدەبی کوردیش ئەدەبە، دیارە نابێ لە کاروانی گۆڕانی ئەدەبی نەتەوەکانیتر دوا کەوێ، پێویستە ئەو چەمکانە کە زانایانی ئەدەبی کۆن و نوێ بەرانبەر بە زانینی ئەدەب دایان ناوە، ئەبێ لە ئەدەبی کوردیشدا بێتە جێ، چەمکە زانیارییەکان لەمیشا پیشان بدرێ، ئەو ئاگاداری و بەشکردنە هەموو جۆرانە، کە بۆ ئەدەب هەیە، ئەوان بەسەر ئەدەبی کوردیشدا باڵ بکێشن، وەیا ئەدەبی کوردیش

ئەبێ بچێتە ژێر ئەو خێوەتەوە، چونکە ئەگەر لە مەیدانەکە دوا بکەوێ، وەیا پێی نەکرێ بچێتە مەیدانەکەوە، ئەوە، ئەوە ناگەیەنێ کە ئەم ناتەواوییەکی تێدا هەیە، لەگەڵ ئەوەشا ـ وەکوو لەناو لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا بۆمان دەرئەکەوێ ـ ناتەواوی و لە کاروان دواکەوتنی تێدا نییە، ناتەواوییەکە هەر ئەوەندە بووە کە ئێستا بە جۆرێکی ڕێکوپێک کۆ نەکراونەتەوە و لەسەر لاپەڕەی چاپ کراو نەخراونەتە بەر چاو، بە جۆرێکی ئەوتۆ کە هەموو لە شوێنێکا کۆ بینەوە و بیروباوەڕەکان دەرببڕێن.

بەڵێ، ئەدەب ئاوێنەی بیروباوەڕ و ئاوێنەی گەلە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانرێ: کە بە چ جۆر وە لە چ ڕوویەکەوە ڕووناکی ئەو ئاوێنەیە پیشان ئەدرێ؟.. ئایا هەر لە شوێنی خۆیا ئەوەستێ؟ یا وەکوو ئاوی ڕەوان، چۆڵ و دۆڵ ئەگرێتە بەر و ئەڕوا تا ئەگاتە شوێنی خۆی؟.. دیارە ئەبێ لە ڕەویشتنا بێ. جا ئەم ڕەویشتنە گەلێ چەشنی هەیە، ئەبێ لەو چەشنانە تێ بگەین، بۆ ئەوە ئەدەبی ئێمەش وەکوو کاروانی ئەدەبی نەتەوەکانی تر لە تەکاندانا بێت و لەوەدا بێ کە هەموو پەردەکانی بە جۆرێکی دیاری بەرە بەرە بکەوێتە بەرچاو.

هەروەها لەبارەی لێکۆڵینەوەوە، ئەمەیان لەلایەن گەشە پێنەدانەوە لە خودی ئەدەبەکە ناهومێدترا!. چونکە بە جۆرێکی وا کە لەگەڵ زانیاری تازەدا ڕێ بکەوێ، لێکۆڵینەوەی تێدا نەکراوە. لەم ڕووەشەوە دیسان من ئەوی شایان بێ و لە دەسەڵاتی بیری یەکێکدا بێ، ئەوەشم هەر خستە بەرچاو.

چەمکەکانی ئەدەبی تازە و چەمکەکانی لێکۆڵینەوەی ئەدەبی تازە

بەرانبەر بە ئەدەبی کوردی، هەردووکم لە بەینی دوو بەرگی ئەم کتێبەدا کـۆ کـردەوە و بە دیارییەکی پچووک ناردم بۆ ئەو نەتەوەیە کە بە هەموو شانازییەکەوە خۆم بە یەکێکی بچووک لەوان ئەزانم.

دیارە لە کەموکوورییەکەی لێم ئەبوورن و هیوادارم کە خوێندەوارانی ئەم نەتەوە خۆشەویستە، لە ئیمڕۆژ بەدواوە، ئەدەبی کوردی لە لایەن چەمکەکانـی زانیـاری و چەمکەکانـی ئەدەبـی بـەرزەوە، ئەگەیێننـە چڵەپۆپەی هەرە بەرزی بەرزیی.

**١٩٦٣/٦/٢٥ ـ بەغدا**

**عەلائەددین سەججادی**

# سەرەتا

بێگومـان، بـە جۆرێکـی تێکڕایـی، ئێمـە وامـدار[1] و نازکێشـی پێشـینەکانی خۆمانیـن؛ ئەو پێشـینانەمان کـە ژیانی ڕۆژانـەیان تەنها بریێتی بوو لەوە کە بە هەر جۆر بووبێ، شتێک پەیدا کەن بۆ خواردن، با ئەو شتەش گۆشتێکی کاڵ وەیا دڕندەیەکی ناقۆڵا بووبێ!!.

وامداری ئەوانین، چونکە ئەگەر سروشتی کۆشش بۆ چوونە پێشەوە لەوانا نەبوایە، ئەوانەی پاش ئەوان و ئێمەش نەمانئەتوانی بگەینە ئەو شوێنە کە لە ڕەوڕەوەی گێتی ورد بینەوە!.

ئـەوان ئاوێکـی وا بـۆ چوونە پێشـەوەیان ڕشـت، کـە نەتەوەکانی ئەوان بە چەن هەزاران سـاڵ پاش ئـەوان بتوانن کە بزانن: لە تاریکی ناو گەرووی ئەشـکەوتەوە بچنە ناو کۆلێتێک کە بە شـەو وەکوو ڕۆژی گـەرووی ئەشـکەوتەکە تاریـک بـێ و بـە ڕۆژیـش بە هـۆی چوونە ژوورەوەی ڕووناکی هەتاو، ڕووناک بێ بە کەمێک لە ڕووناکی دەرەوە.

نەتـەوە بـە نەتـەوە بەمانـەوە نەوەسـتا، هـەر ڕۆژێ هەنگاوێکـی ئەهاویشـت و هەر چەرخێک ملەتاتکێیەکیتری ئەکرد[2]، تا وای لێ هات باسکی پڕهێزی درێژ کرد بۆ هەڵکۆڵینی بەرد و بە پەنجەی ڕاستی، جوانی باوەڕەکانی خۆی ئەکرد بە وێنەیەکی بەردین و ئەیدایە دەسـت

---

١. وام: قەرز.

٢. [ملەتاتکێ: ملەقوتێ، قیتەقیت، ملکێشان بۆ تەماشای شتێک].

چەرخی گەردوون. بۆ ئەوە ئەویش بیدا بەدەست نەتەوەی ئەوانەوە!.

ڕۆژگار بینی ئەنا بۆ پێشەوە[١]، نەتەوە تەکانی ئەدا بۆ پێشتر، کەچی ئەوەنـدە زانرا پەنجـەی ئادەمیزاد بـۆ دەربڕینی باوەڕی خۆی، لەسـەر بەردەوە کەوتە سـەر پێسـتی ئەو گیانلەبەرانە کە دوێنێ بە کاڵی و ئەو ڕۆژە بە کوڵاوی ئەیخواردن.

وێنەی هەردوو لایان بۆ ئیمڕۆژی ئێمە ماونەتەوە؛ وێنەی بەردەکان نووسراوە هەرە کۆنەکان، وەیا هێروگلیفییەکانن[٢]، وێنەی پێستەکانیش وەکوو مووزەخانەکانی[٣] دەرەوە ـکە هەتا دەوروبەری سـێ هەزار ساڵ پێش میلاد ئەمەمان پیشان ئەدەن ـ وەکوو ئەمە ماوەتەوە؛ ئەوەش هەر ماوەتـەوە کە باوەڕ لەسـەر پانیی لقی دارخورما نووسـراوەتەوە، ئەوەندە هەیە ئەمەیان گەلێ گەلێ پاش ئەوانیتر کەوتووە.

بەڵـێ! نەخش و نیگاری سـەر بەردی وڵاتی گەلێ لـە نەتەوەکان، وەیا شـێوەی نووسراوی بابلییەکان لەسەر خشت و پارچەی وردەواڵەی قوڕیـن، بیـروباوەڕی ڕابوردووەکانیـان دەور ئەکـردەوە، هـەتا هەسـتی ئادەمیزاد پلەیەکیتر بەرز ئەبووەوە، نووسینی لەباتی لەسەر بەردی ڕەق و خشتی زوو شکاو، خستە سەر ئەو پێستە خۆشەکراو و لوولدراوە کە بتوانێ لەگەڵ خۆی بیگێڕێ و بەشوێن باوەڕیا بیسووڕێنێتەوە.

بەڕاسـتی پێسـتەکان خزمەتێکی گەورەیان کرد بە لاتینی و یونانی،

---

١. [ببین: هەناسە، پیش].

٢. [هێڵـی پیـرۆز، یەکێکـە لە هێڵە کۆنەکان کە لەجیاتی نووسـینی ناوی شـتەکان وێنەیان کێشاوە].

٣. مووزەخانە: موتحەف [، عەنتیکەخانە].

چونکە هەر ئەوان بوون ئەدەبی بەرزی لاتینی و یونانییان خستە بەرچاوی مەردمەکەی تر. وەیا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا قەشەکان و گۆشەنشینی ئەشکەوتەکان بە هۆی نووسینی خۆیانەوە نووسینی «ئینجیل» و «تەورات»یان لەسەر پێست بە خەڵکی تر فێر ئەکرد.

وەنەبێ هەر ئەمانە بووبن، بەڵکوو لە وڵاتی ڕۆژهەڵاتیشدا فینیقییەکان لە لێواری ڕۆژهەڵاتی دەریای سپییەوە بە ماوەی هەزار ساڵێک پێش میلاد توانییان نەخشەی هێرۆگلیفی بگۆڕن بە بارێکی‌ترا، کە باری پیتە و بەرەبەرە هەموو جۆرە کەسێکی پێ ڕا هات.

ئەمانە و دیسان شتێکی‌تریش هەر هەبووە کە خزمەتی کردووە بە ئێمە و بە گێتی ئەدەب، ئەوەش ئەو «گیا» ئاوییە بوو کە پێیان ئەوت «بەردی». لە دەوروبەری سەدەی چوارەمی پێش میلاد کە لە ڕۆما و ئەسینادا کتێبە جوانەکانی «ڤەرجیل» و «هۆمر» ئەنووسرانەوە، هەر لەسەر ئەوە بوو کە خوێنەری ئەوان موزیقای دەنگی خۆی دەرئەبڕی.

هەر لە نەتەوەی ئادەمیزاد هی وا پەیدا بوو کە بکەوێتە سەر هەڵهێنانی ئەو نووسراوە جوانانە کە لە ماوەیەکی زۆر درێژی پێش ئەوانا لەسەر بەردەکان نووسراون و درێژیی گەردوون خوێندنەوەیانی لە بیر بردبووەوە.

هەر لە دەوری «بۆسار» موهەندسی هاوڕێ ناپلیۆنەوە ڕچە شکێنرا، بۆسار نووسراوی سەر بەردە کۆنەکانی ئەو وڵاتەی بە جوانی خوێندەوە و تێگەیشت کە ئەمە قەشەکانی دەوری پێشوو بە باڵای پادشاکان وەیا خوایەکانی دەوری خۆیانا هەڵداوە.

وەکوو لەو وڵاتانەدا ئەوانە ڕووی ئەدا، لە وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتیشدا

نووسراوی سەر بەردەکانی «تەختی جەمشێد» و «ئیستەخر» و «بێستوون» و «دارا بگورد» هەڵئەهێزان.

تاوسی ئەدەب لە بەرەبەیانی خۆی و ئادەمیزادەوە هەر بەسەر ئەو جۆرە شتانەوە ئەنیشتەوە و ئەوەندە خۆی پیشانی هەموو کەس نەئەدا، تا کەوەتە ناوەڕاستی سەدەی پانزەهەم. لێرەدا «گوتەنبەرگ»ـی ئەڵەمانی لە دووکانە بچکۆلەکەیا بە ڕاهێنان و دروستکردنی «پیت»ـی چاپ، ئەدەبی لە بەستنەوەی سەر بەرد و پێست و ڕوونووسی دەستخەتی کاغەزی دەستڕوەیشتووەکانەوە ڕزگار کرد و وای لێ هات ئەگەر باوەڕ هەبێ و بنووسرێ، ئیتر هەر لەلای ئەو چینە نەمێنێتەوە، بەڵکوو هەموو چینێک بە سانایی[1] ئەتوانێ بیگاتێ.

---

١. [سانا: ئاسان، سادە].

# ئەدەب و گوزارەی ئەدەب[١]

ئەدەب، بە جۆرێکی تێکڕایی بە «بەسە»ی[٢] زیرەکی و شەرم و ڕاگرتنی هەر شتێکە لە ئەندازەی خۆیا. زانیاری ئەدەب، شت زانین و زانیارییەکە کە هەرکەسێ بەهۆی ئەوەوە ئەتوانێ خۆی بپارێزێ لەو شتە ناشایستانە کە بەهۆی زمان وەیا کردەوەیەوە بەسەریا دێت.

بە جۆرێکی تایبەتیش ناوە بۆ ئەو کۆمەڵە زانینانە کە هۆنراوە و نووسینی جوان و هونەری نایاب و مووزیقای دڵڕفێن و پیشەی قەشەنگ ئەگرێتەوە، کە ڕابوردووان مرواریی قسەی جوانیان لە دەم هاتۆتە دەرەوە، کەوتبێتە سەر کاغەز یا نەکەوتبێ، ئەو گەوهەرانە ماونەتەوە. ئەو نیگارانە کە گەلێ داستان لە لاپەڕەکانی ڕۆزگاردا بە وێنە و وێنەکاری لەسەر بەردەکان شت ئەگێڕنەوە، ئەو هونەرە بەرزانە کە لاپەڕەیەکی زێڕینی ئادەمیزاد دەرئەبڕن، لەگەڵ نەوای تەلی مووزیقاکانا، دڵ و مێشک ئەگەشێننەوە و ئەبووژێننەوە. ئەدەب ئەمانە هەموو ئەگێڕێتەوە و ناوە بۆ ئەمانە.

ئەمە گوزارەی ئەدەب و زانیاری ئەدەب بوو بە چەشنێکی گشتی و تایبەتی بۆ هەموو گەل و قەومێک. ئێمە ئەمانەوێ لێرەدا لە ئەدەبی کوردی بکۆڵینەوە و قسەی لێوە بکەین، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو

---

١. گوزارە: مەعنا.

٢. بەسە: مەعنا.

چەمکانـە[1] کە واژەی[2] ئەدەبییان بۆ دانـراوە، واژەکە بزانین لە زمانی ئێمەدا ـکە زمانی کوردییە- چی پێ ئەڵێن و چی پێ بڵێن؟؟.

وەکـوو سـەیر ئەکەین ئەو چەمکانـە بەو جـۆرە واژەی ئەدەبیان بۆ دانـراوە، وەنەبـێ واژەکە بـۆ ئەوانە لەسـەر دەمێکـی زۆر کۆنەوە هەر هەبووبێـت، بەڵکـوو ئـەم باوەڕە ـباوەڕی چەمکەکانـی ئـەدەب- لەم سەردەمەی دواییەدا داهات و کاتێ کەوتە ناوەوە کە زانیارییە هۆنراوە و پەخشانەکان کۆکرانەوە و خرانە بەینی هەردوو بەرگی کتێبەوە. ئەمانەش وەنەبێ تەنها سـووچێ لە سووچی زانیاری بووبن تا بەپێی چەمکی ئەو تاقـە زانیارییـە ناوی بۆ دابنێـن، وەکوو بە وێنە زانیاری «سـەرف» وەیا «بەلاغـە»، بەڵکـوو ئەم هەموویانـی ئەگرتەوە و پەلیـش ئەهاوێژێ بۆ شۆخی و مەتەڵ و واژەی قەشەنگ و قسەی نەستەقیش.

لەبـەر ئـەم هەمـوو شـتانە و لەبەر ئەم هەمـوو بەسـەیانە، واژەی ئەدەب ـکە لە پێشـەوە زانیمان چەمکەکـەی چییە- دایان نا بە ناو بۆ ئەو کۆمەڵە زۆرە بەسەیانە. دیارە ئاشنایەتیش لە بەینی واژەکە و یەکێک وەیا چەند دانەیەک لە بەسەکانا هەیە، بۆیـە هەر ئەم ناوەیان بۆ دانا.

گەلـی کورد ـکە یەکێکـە لە گەلەکانی ڕۆژهەڵات- بەهۆی سروشـتی ئاریـەتییـەوە هەڵسـوکەوتی زمانەکـەی لە پێش داهاتنی ئیسـلامەتیدا، لەگەڵ ئارییەکانیترا بووە، لە پاش ئیسـلامەتی چەشـنی هەڵسوکەوتی لەگەڵ زمانی عەرەبیشدا پەیدا کرد. وای لێ هات بۆ ئەو کەسەی بیەوێ لە بنج و بناوانی زمانەکە و لە ئەدەبەکەی تێ بگا، ئەبێ ئاشنایەتییەکی

١. چەمک: مەفهووم.

٢. واژە: کەلمە.

تەواویشی لەگەڵ زمانی عەرەبی و زمانی فارسیدا ـبەتایبەتی ـ هەبێ.

ئەم ئاشنایەتییە لەگەڵ زمانی عەرەبیدا لە پێش هەموو شتێکا ئەوەمان پیشان ئەدا کە واژەی ئەدەب، بۆ ئەو گوزارانە کە لە پێشەوە زانیمان، تازە لەناو عەرەبەکانیشا داکەوت و کردیان بە ناو بۆ ئەو مەبەستە. ئەمەش لە سەردەمێکا بوو کە ئەدەبی خۆیانیان خستە ئەم دیمەنەی ئێستەوە، ئەو وەختە توانییان ناوەکەی بۆ دابنێن، واتە لەپاش کۆکردنەوەی هەموو چەشنە ئەدەبێکیان.

فەرمانی ئیسلامەتی ئەم واژەیە خستە ناو کوردیشەوە، ئەمە و دیسان کورد لەبەر ئەو شتانە ـکە لەمەودوا باس ئەکرێ ـ بۆی نەلواوە لە گێجەکانی پێشوودا خەریکی زمانەکەی بێت و هەموو شتێکی بخاتە قاڵبێکی ڕێکوپێکەوە، بەتایبەتی بۆی نەکراوە چەمکی ئەدەبەکەی خۆی پێکەوە بنووسێنێ تا ئەو وەختە ناوی بۆ دابنێ.

کەوابوو، ئێستە ئێمە هەر لە ژێر ناوی «ئەدەب»دا جارێ ئەمێنینەوە و هەر بەو ناوەوە قسە لە ئەدەبی زمانەکەمان ئەکەین، کە ئەدەبی کوردییە.

❀❀

ئەدەب، ڕاستە هی هەموو گەلێکە، ئەوەندە هەیە: هەر گەلێک بە جیا بۆ خۆی هەندێ شتی تایبەتی هەیە، کە دوور نییە لە گەلێکیترا ئەو شتە بەو جۆرە نەبێت، بەو بۆنەیەوە هەریەکە سەربەخۆ ئەتوانێ باسی خۆی بکا. ئێمەش باسی ئەدەبی کوردی ئەکەین؛ ئەدەبێک کە هی نەتەوەیەکی تایبەتییە. کەوابوو، پێویستە ـوەیا ئەدەب پێویستیەتی ـ

بزانین ئەو نەتەوەیە چییە و چۆن بووە.

ئەو شتانەی کە تاکە تاکەی گەلێک پێکەوە ئەنووسێنن و ئەیانکەن بە نەتەوە، برێتین لە: زمان، ڕەوشت، وێنە و هەڵکەوتی هەندام، چۆنیەتی ئابووری، سنوور و خاک، خوێن، هەندێ جاریش ئەڵهای بیروباوەڕ ـکە ئەگەر لەمەیان زۆر بکۆڵینەوە، ئەچێتە ژێر سێبەری خووڕەوشتەکە ـ کەوابوو، هەر برە مەردمێک ئەگەر هات و ئەم شتانەی تێدا هاتە دی، ئەوە ئەبێ بە نەتەوەیەک و لە نەتەوەیەکی‌تر جیا ئەبێتەوە.

وەکوو تەماشا ئەکەین، ئەم شتانە هەموو لەو گرۆهە[1] مەردمەدا کە پێی ئەڵێن «کورد» کۆ بوونەتەوە؛ کورد لە زمانا و لە ڕیشەی زمانا هەموو یەکن، لە شادی و شیوەن و سروود و ئەڵهادا یەک شتن، لە هەڵکەوتی هەندام و جومگەکانیان و ڕواڵەتی پانی و درێژی سەر و ڕوومەت و ئەندامەکانی‌تریانا یەک ڕێگەیان گرتووە، لە سنوور و خاکدا هەموو لە یەک بەشە زەویدا ئەژین و ژیاون، لە تووڕەیی و لەسەرخۆیی و هێمنیدا ـکە ئەمانە ئاو و خاک و هەوا دروستیان ئەکەن ـ وەکوو یەک وانە، ئاوێنەی بیروباوەڕیان یەکە، وەیا بە تەنیشت یەکەوەیە، لە توندی و ڕوونی خوێندا یەک خوێنیان هەیە.

دەستەیەک کە ئەم هەموو شتانەی تێدا کۆ بووەوە، ئەوە دەرئەخا: کە ئەوانە نەتەوەیەکی تایبەتی و سەربەخۆن و ڕیشەیەکی قایمیان لەناو ڕیشەی نەتەوەکانا هەیە. مەسەلەی تۆزێ جیاوازیی لە بەینی هەندێ لە شێوەکانیاندا، ئەمە سروشتی جیاوازیی شێوەی زمانی هەموو

١. گرۆه: دەستە، جەماعەت.

نەتەوەیەکـە، بێجگە لەوە کە: هاتوچۆی کۆچەرایەتیش پاڵێکی هەر پێوە ناوە.

# مێژوویەکی کورتی کورد

کـورد، کـە ناوە بۆ ئـەم نەتەوە تایبەتییـە و لە ڕیشـەی نەتەوەکانی «ئاری»ـــن، سـەرچاوەی لێشـاو و بزووتنەوەیان ئەگەڕێتەوە بۆ ماوەی «٣٥٠٠» سـاڵ پێـش میـلاد. لـە سـەرەتای ئەو مێـژووەدا لـە جنووبی ڕووسـیاوە بەسەر باکوور ـشِمال ـ ـی قەوقاس و دەریای ڕەشدا هاتن بۆ دەوروبەری ڕۆژاوای ئاسـیان. لێرەدا بوون بە دوو بەشـەوە؛ بەشـێکیان ڕوویان کـردە ئـاورووپا و نەتەوەکانـی ئەوێ وەکوو: «سـوید، نەرویژ، لیتوانیا، بۆڵۆنیا، چیکۆسلوڤاکیا، ئەڵەمانیا و ئنگلیز» لەم بەشە کەوتنەوە، بەشـەکەیتریان کـە لە ئاسـیادا بوون، هـەر لە دەشـتەکانی جنووبی ڕووسـیاوە هاتنە ڕۆژاوای ناوەڕاست و ڕۆژاوای نزیـکیەوە ـواتە ئاسیاوەـ لـە تورکوسـتانی[1] ئیمڕۆژی ڕووسـیادا، ماوەی هەزار سـاڵێک مانەوە و پاشان بە تەنیشت ئەفغانستانی ئێستاوە، ـکە کەوتۆتە ڕۆژهەڵاتی ئێرانەوەـ ڕوویان کـردە جنووبی ئێران. لەپاش ماوەیـەک ئەمانەش بوون بە دوو ڕێچکەوە؛ ڕێچکەیەکیان بەسـەر «هیمـالا»یادا ڕوویان کردە ڕۆژهەڵات و ڕووبەڕووی «هیند» بوونەوە و لە «پەنجاب» گیرسـانەوە و نەتەوەی هینـدیان لـێ کەوتـەوە؛ ڕێچکەکەیتریان هەر بەناو بانـی ئێراندا بڵاو

١. نـەوەک هـی ڕۆژاوا کـە بـەر «چیـن» نەکـەوێ، بەڵکـوو ئـەو تورکوسـتانە کـە لەوانەیە جنووبی ڕووسیا ئەگرێتەوە و کەوتۆتە لای دەریای ئاراڵەوە و تاشقەند و ئەوانە لەوێدان.

بوونەوە و ناو نران: «ئێرانی».

ئەمانەیان کە لەناو بانی ئێراندا بڵاو بوونەوە، بەرەبەرە زۆر بوون و پەرەیان سەند، ئەوانەیان کە هەر لە دەشتەکانی ئێراندا مانەوە، جێگیر بوون و بە «پارسی» ناویان دەرکرد. ئەوانەشیان کە هەر بە ڕەوشتی کۆچەرایەتی مانەوە، ڕووبەڕووی شاخەکانی «زاگرۆس»[1] و لەوێدا پەل‌پەل بوونەوە، «گۆتی، لۆلۆ، کاسی، کاردۆش، مانای، کاردۆها، خاڵدی و ماد» لەم دەستەی زاگرۆسە هەموو دروست بوون. بەتایبەتی لە بەرەی «پارسی»ـیەکان «هەخامەنشی» هاتە ناوەوە، لە بەرەی «زاگرۆسی»ـیەکانیش «ماد» دروست بوو. فارسەکان ئەچنەوە سەر هەخامەنشی و پارسی، کوردەکانیش ئەچنەوە سەر ماد و بەرەی زاگرۆس.

مادەکان لە «٧٠٠ ـ ٥٥٠» پیش میلاد کیشوەرێکی[2] بەناوبانگی هەرە بەهێزیان هەبووە، بە هەموو جۆرێکی کیشوەرداری لە وڵاتی زاگرۆس و وڵاتەکانی‌تردا دەوڵەتێکی تیشکدار و بەدەسەڵاتیان هەبووە.

## وشەی «کورد»!

وشەی کورد، چەند بەسەیەکی هەیە؛ یەکێ لەوانە ناوە بۆ ئەم نەتەوەیە کە قسەی لێوە ئەکەین و خاوەنی زەوی‌وزار و ڕەگەز و ڕەوشتێکە.

---

١. زاگرۆس: ڕیزە شاخێکە لە کێوەکانی ئاراراتەوە دەست پێ‌ئەکا تا ئەگاتە خووزستان، سنوورێکە بۆ بەینی ئێران و تورکیا، وە بەینی هەندێ لە عێراق و تورکیا.

٢. کیشوەر: دەوڵەت، حکومەت.

بەسـەیەکی‌تری لە زمانی پەهلەوی کۆندا بـە زەوییەک ئەوترێ کە هەرچوار دەورەکەی بە گڵ بەرز کرابێتەوە و ناوەکەی کرابێ بە تەڕەکاڵ وەیا کشـتوکاڵ. وەکـوو چـۆن ناوە بـۆ زەوییەکیش کە بشـێ بە کەڵکی کشتوکاڵ بێت.

بەسـەیەکی‌تری دیسان هەر لە سەرچاوەی زمانی کۆندا بە «شوان» ئەڵێن.

وەکوو سەیر ئەکەین، ئاشنایەتی لەبەینی چۆنیەتی کۆچەرایەتی ـکە خاوەنداری ماڵاتەـ وە نیشتەجێتی ـکە خاوەنداری کشتوکاڵەـ وە بەینی ئەو گەلە کە ناوی کوردە، ئاشنایەتییەکی تەواوە.

ئەگونجێ بووترێ: بە ناوی شوێنی نیشتەجێتییەوە ناویان دەرکردووە، وەیا بە ناوی یەکێ لە ئیشی کۆچەرایەتییەکەیانەوە ناوبانگیان سەندووە. لـە هـەردوو بارەکـەدا ناوبردنی ئـەم گەلە بـە «کـورد»، یا ناوە بە ناوی جێگەوە، وەیا ناوە بە ناوی «پاژ ـ جُزْء»ـێک لە کردەوەیەوە.

## وڵاتی کورد!

ئـەو وڵاتە کە پێی ئەوترێ: «کوردوسـتان» و کوردی تێدایە، بەشـە خاکێکـی پان و فراوانە و هەموو لە یەک پارچە زەویـدا کۆ بوونەتەوە و وڵاتەکە بە وڵاتی ئەوان ئەناسرێ.

سـنووری خاکەکە: لە ڕۆژهەڵاتەوە خەتێکە لە خووزسـتانەوە دەست پـێ ئەکا بە عێراقـی عەجەمدا، تا ئەگاتە ڕووباری «ئـاراس» و «کەڕ» لـە قەوقاسـی جنووبـی. لـە ڕۆژاواوە ئاگاتـە «ئایەنە» و «سـیواس» لە

ئـەنادۆڵ. لـە شـیمالەوە قەوقـاس و لیـوای لازسـتان[1]. لـە جنووب و جنووبی ڕۆژهەڵاتیەوە ڕیزە خەتێکە لە خووزستانەوە ـ کە ئێستە ئوستانی شەشەمە لە ئێران ـ دەست پێ ئەکا و ئەگاتە کێوی حەمرین و لەوێوە بۆ جنووبی کێوی «سەنجار» لە دەشتی شام، لەوێشەوە بۆ «گرداغ» تا ئەچێتە سنووری ئەسکەندەروونە.

ئەم پارچە زەوییە کە بەم جۆرە ڕێ کەوتووە، بە هەزاران و بە سەدها سـاڵ لەو بەروبوومـە نەتەوەی هێناوەتـە دی، بە خوڕەی ئاوی سـافی ڕەوان و بـە هەوای فێنکی بەری بـەیان، لایەلایەی بۆ چێوی هەلۆرکی نەمامی جگەرگۆشەی خۆی کردووە، لە داری دارستانەکانیشی بێشکەی بۆ دروست کردوون، لە گوڵاڵەی ئاڵ و والای مێرگەکانی چەپک چەپک بارانوویـە بەسـەریانا، کۆرپەی جگەرگۆشـەش بە مووزیقـای دەنگی ئـەو خوڕەیـە، بە شنەشـنی ئـەو هەوایە، بـە سـەمتووری کرچەکرچی تافـی نەمامیی داری جۆلاناکەی، بە بۆنی گوڵاڵەی سـەر بێشـکەکەی، گەشاوەتەوە و بووژاوەتەوە و هەستاوەتەوە؛ کە هەستاوەتەوە ناوی خۆی ناوەتە «کورد» و لە کۆشی دایکی نیشتمانی کورددا بەرە بە بەرە و پشت بە پشت ئەو هەزاران ساڵە ژیاوە.

کەوابـوو، ژیانـی کـورد ژیانێک بوو تێکڵاو بە ئاو و بـە با و بە دار و بـە مەڵبەند بوو، لە ڕەوشـتدا لە هەرچواری وەرگرتـووە و ئاڵاوە بە باڵای هەرچوار بەشە سەرچاوەکەی ژیانیەوە!...

**ژیانی کورد!**

---

١. لازستان: بەشی ڕۆژاوای گورجستانە، گورجستانیش لە جنووبی قەوقاسەوەیە.

جۆری ژیان، ڕابواردنی هەموو نەتەوەیەک، پەردەیەکی کۆمەڵایەتی و سیاسـی و ژیری ئەو نەتەوەیە پیشان ئەدا. وەکوو ئەمە هەیە، شوێن و مەڵبەند و ئاو و هەواش چەشـنی شت دروست ئەکەن، بەڵکوو هەر ئەمانەن کە جۆری ژیانەکە لە نەتەوەکەدا بە تەواوی دروست ئەکەن.

ئـەو خاکە کـە پێی ئەڵێـن «خاکی کوردوسـتان» وڵاتێکە پـڕ بە پڕ سروشـتێکی کوێستانیی هەیە؛ شاخ و چیا و بەراوی هەیە، سەرچاوەی ئاوی بەهۆی بەفری کوێستانەکانیەوە، زۆرە؛ ئاوەدانە بە دار و دارستان. لەگەڵ ئەمانەشـا پێی دەشـت و زەویوزاری کشتوکاڵ و سەوزەڵانی بۆ لەوەڕگای مەڕ و ماڵاتەکەی، وەنەبێ لە شـوێنە شـاخاوییەکان کەمتر بـێ. جا ئەمانە هەموو کار ئەکەنە سـەر جۆری ژیانی دانیشـتووەکان و جۆری ڕابواردنیان و چەشنی خوو و ڕەوشتیان.

سـەرەتا لەبەر ئەم هەوای مەڵبەندە، کورد بـە ژیانی کۆچەرایەتی و ڕەوەندییەوە خەریـک بووە، بەشوێن لەوەڕا گەڕاوە بۆ ماڵاتەکەی ـ ئەو ماڵاتـەی کە بەهۆی ئەوەوە ژیاوە ـ لە خـوری و بەرگنەکەی جلوبەرگی دروسـت کردووە و ماست و ڕۆنەکەشی کردووە بە سەرمایەی خواردنی ژیانی ئەو کۆچەرایەتییەی. بە شـەو لە تەنیشـت مۆڵی مەڕەکەیەوە لە گۆشەی دەوارەکەوە سەیری جریوەی ئەستێرەی ئاسمان، وەیا ڕەهێڵەی بارانـی کـردووە، بـە ڕۆژیش لـە گیاجـاڕی ئاژاڵەکەیا سـەیری گوڵاڵەی مێرگەکانی کردووە.

ئەم جۆرە ژیانە ـ ژیانێکی وا سـادە و سـاویلکە ـ بە سروشـت هەر ئەوندە دروسـت ئەکا کە بیر لە دۆزینەوەی شـوێن لەوەڕی بکاتەوە بۆ ئەو ماڵاتەی کە ئەو بەشـوێنیا عەوداڵە. بەڵکـوو ئەگەر بۆ پەیداکردنی

ئەو مەبەستەی هەزاران کۆسپیشی بێتە ڕێ، ئەو ئەبێ ئەو کۆسپانە ساف بکا، با بە دانانی گیانی خۆیشی بێ!. لەبەر ئەمە ڕەوشتێکی جەنگاوەری و پەلاماردانی تێدا پەیدا ئەبێ. بەم هۆیەوە کورد لە پایەی یەکەمدا بەجەرگ و جەنگاوەر و سڵ نەکەرە لە هیچ شتێک.

پاش ئەم سەردەمە کە وردەوردە ژیانی کۆچەرایەتی گۆڕییەوە بە نیشتەجێبوون، هێزێکی‌تری زیاد کرد، کە هێزی کشتوکاڵ و زەوی هەڵدڕینە، کەوتە سەر ئەوە: لەباتی ئەوە کە لە ژێر سێبەری ڕەشماڵدا ستار بگرێ، با بکەوێتە ژێر سێبەری کۆڵیت و کەوێڵ، وەیا بکەوێتە ژێر سایەی ئەو خانووچکەیە کە لە پاشا ئەتەنێتەوە بۆ کۆشکی ڕەنگاوڕەنگی شارنشینیی نەتەوەکەی!. هێنای لە قوڕی خاکەکەی چوار دیوارێکی دروست کرد و بە داری وڵاتەکەی دارەڕای کرد، کەوتە ناو ژیانی جووت و دەستەدووەوە. بە هێزی باسکی و بە دەنگی «هۆهەو»ی مەردانەی، هەوجاڕ و مژانی ئەگرت و بە یارمەتی ئەو گایانە کە دوێنێ باریان بۆ هەڵئەگرت، کەوتە هەڵدڕینی زەوی بۆ ئەوە نانی خۆی بە عەرەقی ناوچەوان لەناو جەرگی زەویدا دەرێنێ!..

وەکوو سەیر ئەکەین، ئەم دوو ڕەنگە ژیانەی کورد هەردووکی ژیانێکی کارکردن و سنگ بۆ پێشەوە بردن بووە، بۆ ئەوە خۆی بە خۆی بژی، نەوەک بەهۆی یەکێکی‌ترەوە. دیسان لەم پەردەیەشدا چەشنە کۆمەڵایەتییەکی‌تر دروست ئەکا، کە جیاییەکی زۆری هەیە لەگەڵ ئەوی پێشوویدا؛ لە پێشا ئەبوایە بە ژیانێکی زۆرتر تاقانە، بە چیا و هەوارگەکانا بسووڕایەتەوە بۆ ماڵاتەکەی، لەمی‌ترا ئەبوایە بە ژیانێکی هاریکاری لەگەڵ هاوماڵەکانیا لە پێدەشتەکانا نیشتەجێ بوایە و خۆی و

ماڵ و منالّی بکەوتایەنە ناو بەربەرەکانێی جووت و کێشەوە.

لە سەردەمی پێشوودا ئارەزووەکەی شەڕ و جەنگی ئەویست، لەم سەردەمەدا هێمنی و لەسەرخۆیی، لە تافی پێشوودا شانازی بە شیر و تیرەوە ئەکرد و دەستی بەو پەندەوە ئەگرت کە ئەیوت: «ناوم بە دەسکی شیرەکەمەوەیە!»، لەم ساتەدا بە دانەوێڵە و بەووەوە، لە بەری ڕەنجی ئەم، کەسانیتر نان ئەخۆن و ئەژین. لە کاتی پێشوودا نووکی ڕمەکەی بە ئامانجێکی زۆر گەورەی ژیان ئەزانی بۆ بەخێوکردنی ماڵاتەکەی، بەڵام لەم دواییەدا سەری گاسنەکەی شوێنی ئەو ئامانجەی گرتەوە بۆ لە پێشا بۆ خۆی و ئەمجا بۆ ئاژاڵەکەی!.

لەم دوو ژیانە وەکوو پەردەی ڕابواردنی گۆڕا، پەردەی ژیری و بیرکردنەوەشی گۆڕا؛ چاخی پێشوو بەلای جەنگدا ئەڕۆیشت، گێجی دوایی بەلای ئاشتیدا، دیارە گەلێ جیاوازی لەبەینی جەنگ و ئاشتی و تووڕەیی و هێمنیدا هەیە.

**

**ئەمە لەم ڕوانەوە، ئەمجا بە جۆرێکی تێکڕاییتر:**

کورد ئازان، حەز بە ڕاو و شکار ئەکەن، بێزیان لە ژێردەستەیی دێتەوە، کۆچەرایەتیی سەربەخۆیی تاکیی ئەوێ، ئەو ڕەوشتە لە خوێن و پێستیانا جێگیر بووە، ئیشی سووکیڕەوشتیی نازانێ، خاوەنی قسەی خۆیەتی، بەقنیات و بوردەبارە، تەنانەت ئەوی بە دەستیشیەوەیە وەنەبێ لەبەر خەمی سبەینێ دەستی پێوە بگرێ، بەڵکوو ئاڵاوە بەو پەندەی خۆیەوە کە ئەڵێ: «خوردە ماڵ، مەندە میرات!».

نەفسی بەرزە، مەڵبەندی خۆی خۆش ئەوێ، مەڵبەندی لە نان خۆشتر ئەوێ؛ واتە با دووریش بکەوێتەوە، هەر دڵی بەلایەوەیەتی، بەلایەوە خۆشە کە ئەڵێ: «من کوردم». هەوای سافی وڵاتەکەیان و گۆڕانی چوار وەختەی وەرز، ئەو کارەی تێکردوون: کە هۆگری ئەدەب و دەنگ و ساز و ئاواز بن؛ شێوەی دەنگی زمانەکەیان خۆی بۆ خۆی مووزیقایان پێ فێر ئەکا، لەگەڵ بێگانەدا ئەوپەڕی نەوازشیان هەیە، کە دوژمنی خۆیان بە زەبوونی چاوپێکەوت، وازی لێ دێنن، مردووەکانیان ئەلاوێننەوە، سرروودەکانیان زۆرتر بەلای شادیدایە تا شیوەن، سەر لە شوورەیی ئەکەنەوە، لەبەر ئەوە کە زۆر دەست بە جەرگی ئەو پەندەوە ئەگرن کە ئەڵێ: «خزم ئەگەر گۆشتت بخوا، ئێسقانت ناشکێنێ»؛ با دووژمنایەتیش لەگەڵ خزمدا بکەوێتە بەینیانەوە، هەر نایگەیێننە ئێسک.

لە چۆنیەتی ناو ماڵدا پیاو سەرۆکی خێزانە، خاوەنی بڕیاری دواییە، کوڕ و کچ ناتوانن لە قسەی دەرچن، کچ سەربەستی شوو کردنی هەیە، بەڵام لەسەر بڕیاری باوک.

ئافرەت لەناو کورددا پایەیەکی هەرە بەرزی کۆمەڵایەتی هەیە، سەرۆکی ماڵ و قسەڕەوایە، هەر لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە بە گەورە دانراوە و لە ناو خێزاندا بە «کەیبانوو» ناو ئەبرێ. بوونی ناوی کەیبانوو بۆ ئافرەتی ماڵ، ئەو شوێنە کۆمەڵایەتییەی پیشان ئەدا، چونکە وشەی «کەی» لە کوردی کۆندا بە بەسەی بەرز و گەورە و خاوەنە، «بانوو»یش بە گوزارەی خانمە؛ واتە: خانمی گەورە، وەیا خانمی بەرز. ئەم واژە کۆنە، بێگومان پایەی ئافرەت لە کۆمەڵایەتی و ژیانی کورددا دەرئەخا.

لەگـەڵ ئەمەش لـە تەکاندانایە لەگـەڵ مێردەکەیدا بـۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکـی ئەو ماڵە، بەڵکوو زیاد لە پیـاو خەریـک ئەبێ، چونکە لەگەڵ ئـەودا کـۆچ‌وبار بار ئەکا وەکوو ئەو؛ لە جووت، لە کێشـە، لە باخ و ڕەز و تووتن، بەخێوکردن شان‌بەشـان ئەچێ بەڕێـوە، زیاتریش لەوە ماڵ و منـاڵ بەخێـو ئەکا، هەویـر و نان و تفـاق ڕێک ئەخا، لە شـوێنی پیاو ـکە بەدەسـتەوە نەبێ ـ بەدەم میوانەوە ئەچێ و خزمەتی ئەکا، لە سەروسواریشـدا شۆڕەسوار و تفەنگچێتیشـی هەیە، چۆن سەربەستە، بـەو جـۆرەش داوێنپاکە، لـەلای ڕانەبێرە و لە مـازوو و گەڵاکردندا بە دەنگی چریکەی گۆرانی، خورۆشـێک ئـەدەن بەو ناوە، ژنانی کورد لە شەرم و شکۆفدا لەگەڵ پیاوانا هەموو وەکوو خێزانی ماڵێک وانە.

کـورد لـە هەمـوو چەرخەکانیانـدا پابەنـدی ئایین بـوون، لە پێش داهاتنـی ئایینـی ئیسـلامەتیدا، زەردەشـتی بوون ـکە پەرستنی خوای تاقانەیە ـ لە پاشـا باوەشـیان کرد بە ئایینی ئیسـلامدا، کـەم گوند هەیە مزگەوتـی تیـا نەبـێ، لـەو وەختەشـەوە کـە تەریقەتەکانی نەقشـی و قـادری کەوتنە ناو ئیسـلامەوە، ئاشـنایەتییەکی زۆریان لەگەڵیانا پەیدا کرد، لە کۆبوونەوەکانی ژێر دەوارەکانیانا باسـی سەرگوزەشـتی ئازایەتی خـۆیان ئەگێڕنەوە، وەکوو لە لێواری ئاگردانی ناو خانووەکانی زسـتانیانا بـە خوێندنەوە و دەورکردنەوەی داسـتانی ڕابوردووەکانیـان، بە دەنگی سـتێر و لاوک، تەنگ بە شـەو هەڵئەچنن. سـەگ ڕاگرتن لەبەر ئەوە کە خزمەتێکی گەورەی پاسەوانییان ئەکا، زۆر زۆر بەلای کوردەوە باوە.

❊✾❊

# مێژووی ئەدەب

ئـەو ئاگادارییانـە کـە ڕابـوردوو بـۆ ئادەمیـزادی ڕوون ئەکەنـەوە، زۆر شـتن؛ دەسـتکرد و نەخش و نیگاری سـەر بەردەکان ئەگرێتەوە، ئاوێنەی باوەڕی نووسـەر و ئەدیبـەکان ئەگرێتەوە، پەردەی نازکی بیری هۆنەرەکان ئەگرێتەوە، ئەو هونـەرە جوانانە ئەگرێتەوە کە پاڵەوانەکانی ئەو مەیدانانە نواندوویانە، پیشـە قشـتەکانی پیشەسـازان ئەگرێتەوە، دۆزینەوە و داهێنانی دۆزەرەوە و داهێنەرەکان ئەگرێتەوە؛ ئەمانە هەموو ئەگرێتەوە، لەگەڵ ئەو هەستە تایبەتییەدا کە لە ئادەمیزاددا بە تەواوی هەیە و لە گیانلەبەرێکی‌ترا بە ناتەواوی.

بە جۆرێکی تایبەتی‌تریش: هەر شتێک لە چەرخەکانی ڕابوردوودا باوەری ئادەمیزادی پێ گەیشـتبێت ـ نووسرابێ یا نەنووسرابێ ـ مێژووی ئەدەبە و ئەدەب قسـە لەو شـتانەوە ئەکات؛ نەنووسراوەکان ئەفسانە و داستان و ڕازونیازی گوێ‌ئاگردان بن، وەیا ڕێچکەنووسراوی پەخشان و هۆنراوەی سەر پێست و کاغەزەکان بن؛ کە ئەمانە هەریـەکە کارەساتی ئابـووری و پیلانی و کۆمەلایەتـی نەتەوەیەک لـە نەتەوەکانی ڕابوردوو ئەگێڕنـەوە و ئاوێنەیەکـن بـۆ پیشـاندانی چۆنیەتی فرەچەشـنەی ئەو ڕۆژەی ئەو گەلە.

بۆچیش مێژووی ئەدەب ئەمە ئەگێڕێتەوە؟ وەیا چ پێویـستێک بەوە هەیە کە مرۆڤ ئەوەندە هۆگری زانینی مێژووی ئەدەب بێت؟

گومانـی تێـدا نییە زانینی ئەو شـتانە کـە لە بەر و کـردەوەی ژێری

و داناییــن، هۆیـەکی هــەرە گەورەن بـۆ بڵاوبوونــەوە و فراوانبوونەوەی ئاسۆی نیاز و خستنە سەر گازی پشتی دەروازەی زانایی، چونکە ئەمانە بناغەیەکی چەوڕێژن بۆ ئەو نەتەوەیەی بیەوێ مەردایەتی و کەسیەتی و تەنتەنەی خۆی لەســەر دابڕێژێ؛ بەهۆی ئەمانەوە، هەر نەتەوەیەک ئەتوانێ لە خۆی، لە ڕابوردووی خۆی ورد ببێتەوە و پەردەکانی یەکەیەکە بێنێتــەوە بەرچــاو و بزانێ لــە چ ڕۆژێکا ئەو پەردانــە تاریـک، وە لە چ چاخێـکا ڕووناک بــوون؟. ئەمجـا ئەکەوێتــە ســەر دۆزینــەوەی هۆی ڕووناکی و تاریکی ئەو پەردانە.

نەتەوەیەک ئەگەر توانی و بۆی کرا لەم شتانە ورد ببێتەوە، ئەوە، ئەوە ئەدا بەدەستەوە: کە پلە بە پلە ئەتوانێ بە پەیژەی سەرکەوتنا سەرکەوێ و بــگا بــە هەموو ئامانجێکی؛ خۆ ئەگەر بـۆی نەکرا، وەیا ڕێی لێ گیرا، ئەوە، ئەوە ئەگەیەنێ: کە خراوەتە ناو ئەشــکەنجەیەکی چەوســانەوە و ئــازارەوە، بــە هەموو جۆر و بە هەموو چەشــنە ئازارێـک، ئازار ئەدرێ، نــەوەک هەر ئــازار دراوە و ئەدرێ، بەڵکوو پەلوپــۆی لە هەموو ژیاندا، هێــزی لێ چنــراوە!. ئەمەش بۆیــە وایە، چونکە ژیان و خۆشــی ژیان چەند ڕووپەڕەیەکە:

ڕووپەڕەیەکیان ژیان ناخۆشــە، لەبەر ئەوەیە کە نەسـاغە و لەشــی ناخۆشــە. چەشــنێکیان ناخۆشــە لەبەر ئەوەیــە کە ڕێگای ئــازادی لێ گیراوە، جۆرێکیشــیان ناخۆشــە چونکــە دەرگای دەربڕینی هەســت و باوەڕی لــێ داخراوە. دووەکەی پێشــوو چاریان ئاســانە، بەڵام ڕێگرتنی بیــر، ڕێگرتنێکــە کــە بە هەمــوو لایەکدا پیاو ڕائەکێشــێ بـۆ دیلیەتی و کۆیلەیی. بێگومان ئەم نەخۆشــییە لە هەموو نەخۆشــییەک گرانتر و

کوشندەترە!.

جا هەر گەلێک ئەگەر توانی چاو بە ئەدەبیاتی خۆیدا و بە کاروباری ڕابوردووی باو و باپیری خۆیدا بگێڕێ، ئەوە وا ئەگەیەنێ: کە ئەو گەلە ئاشنای هەموو سانەئازادی و سەربەستییەکە و ئەتوانێ خۆی لە هەموو جۆرە نەخۆشییەک ڕزگار کا.

مێـژووی ئەدەبیی لەگەڵ مێژووی سیاسـی و کۆمەڵایەتیدا دوو لقی دارێکـن و شانبەشـانی یـەک بەرز ئەبنـەوە، وەیا ئـەڕۆن؛ بگرە لقی مێـژووی ئەدەبەکـە بەهێزتـرە لە لقەکەی‌تـر؛ چونکە ئەمیـان لە بیرەوە هەڵئەسـتێ و ئـەویان لە کـردەوەوە، هەموو وەخت بیـر پێش کردەوە ئەکەوێ. تا پیاو لەپێشـا لە شـتێک ورد نەبێتەوە، دەستی ناداتێ؛ بیر و هۆش لە دڵی هۆنەر و ئەدیب و زاناکانا جێی خۆیان ئەکەنەوە، پاشـان بەهـۆی ئەوانـەوە ئەچێتە دڵـی مەردمی‌تـرەوە و ئەو وەختـە کردەوە و مەبەست سەر هەڵئەدا!..

## چۆن ئەدەب داهاتووە؟

ئەدەب بە هەموو چەشـنەکانیەوە، هەسـتێکی نازکە و لە جەرگەی پەڕەکانی دڵەوە هەڵئەدا، وەیا «خورپـە ـ إلْهام»ـێکە ئەکەوێتە ناویـەوە. کـە وتمـان دڵ، هەمـوو گیانلەبەرێــک دڵـی هەیە و ئەبـێ هەمووی بگرێتـەوە!، بەڵـێ! هەمـووی ئەگرێتـەوە: باڵندەیـەک، دڕندەیـەک، ئادەمیزادێـک!. ئەتوانیـن بڵێیـن: ئەمانـەش هەمـوو ئەدەبیـان هەیە، ئەوەنـدە هەیـە: ئادەمیزادەکە هێزێکی‌تری تیایە کە هێزی قسـەکردن و دەربڕینی خواستەکەیەتی بە زمانەکەی، وەکوو چۆن هێزی بیرکردنەوە و

ژێری تێدایە، ئەوانیتر ئەو هێزەیان تێدا نییە، بەڵام وەکوو ئادەمیزادەکە جموجووڵ و بزووتنەوەیان هەیە، کە بەم هۆیەوە ئەتوانن هەستەکەیان دەربڕن.

پەلەوەرێک کە هونەرێکی بازدان ئەنوێنێ، وەیا گیانلەبەرێکیتر هونەرێکی هەڵپەڕکێ و یاریکردن ئەنوێنێ، ئەمە چی پاڵی پێوە ئەنێ بۆ ئەو کردەوەیە؟ هیچیتر نییە تەنها هەستەکەی دڵی نەبێ!. کەوابوو، ئەدەب نەوەک هەر بە تایبەتی لەگەڵ ئادەمیزاددا دروست بووە، بەڵکوو وەکوو خوێن و زیچکاو چۆن تێکڵاوە بە گەوهەری هەموو گیانلەبەرێکەوە، ئەویش بەو جۆرە تێکڵاوە لەگەڵیانا. بەڵام بێجگە لە ئادەمیزادەکە، ئەوانیتر لە کردەوەیان بەولاوە بە هیچ شتێکیتر ناتوانن دەری ببڕن، ئادەمیزادەکە ئەتوانێ بەهۆی کردەوەوە، وەکوو ئەوان وە بەهۆی زمانەوە، زیاد لەوان دەری ببڕێ.

هەر ئەو تێکڵاوییە هاوبەشیەیە، بۆیە گەلێ جار لەنجە و تەقڵەی کۆترێک، وە یا یاری و گاڵتەی بێچووە مەیموونێک، وەیا بێچووە شێرێک، ئەبێ بە سەرچاوەی خورپەی ئەدیبێک و ئەیخاتە پەردەی نووسینەکەیەوە.

ئەمەمان بۆ دەرکەوت کە ئەدەب لە بنچینەی ژیانی گیانلەبەرەوە هەبووە، ئادەمیزادیش وەکوو یەکێ لەوانە خاڵی نەبووە لەو سروشتە؛ خاڵی نەبووە، چونکە لەو چاخانەیا کە ژیانێکی لە ئەوپەڕی ساویلکەییەوە ڕابواردووە. بە شەو ئەو چەند کەسەی کۆ بوونەتەوە و -ئێمە ناویان بە خێزانی بن ئەشکەوتێک ئەبەین- کارەساتی ئەو ڕۆژەی خۆیان بۆ یەک گێڕاوەتەوە. بە چی گێڕاویانەتەوە؟ دیارە بەو

زمانە کە هێزی قسەکردنە و تەنها تایبەتی بووە بەوان و گیانلەبەرێکی‌تر تیایا بێبەش بووە.

ئەم گێڕانەوەی ئەوان بەو جۆرە ـبا نووسینیش لە کایەدا نەبووبێ‌ـ هەر ئەبێ بە سەرچاوەی بیر و باوەڕی ئەدەب. پاشان کە گەردوون پێش کەوتووە و ئەوانیش پێش کەوتوون، لەسەر ئەو بناغەیە بەرەبەرە هەموو چەشنە ڕەوشت و یاسایەکیان دامەزراند، تا کەوتە ڕۆژێک کە نووسین کەوتە ناوەوە، پاش ئەو ڕۆژە ئیتر ڕەوڕەوەی ئەدەب کەوتە خول خواردنەوە و بە خێرایی دەستی کرد بە ماوە بڕین.

## چەشنی ئەدەب

ئەدەب لە پێشا دوو چەشنە: ئەدەبی هۆنراوە ـکە پێی ئەڵێن ئەدەبی شیعریی. ئەدەبی پەخشان ـکە نەسری فەننی‌ـ ئەگرێتەوە.

لێرەدا دوو شت هەن کە سەرچاوەی هۆنراوە و پەخشانەکەن: یەکێ «ویژدان ـ زێڵ»[1]، یەکێ ژیری[2]. هۆنراوەکە ئەبێ بە زمانی ویژدانەکە و پەخشانەکەش ئەبێ بە زاری ژیرییەکە. ئاشکرایە هەموو کاتێکیش ویژدان لە پێش ژیرییەوەیە، واتە: ئادەمیزاد لە پێشا هەست ئەکا بە ویژدان، ئەمجا ژیری ئەکا، بە هۆی ئەوە کە بیر لە شت وەیا لەو ویژدانە بکاتەوە.

وەکوو ئەم ئاشکراییە هەبوو، ئەبێ ئەوەش هەبێ: کە هۆنراو لە پێش پەخشاندا لە ئادەمیزاددا پەیدا بووبێت. ئەمە ڕاستە، وایە؛ چونکە

---

١. ویژدان، زێڵ = ویجدان.

٢. ژیری = عەقڵ.

هەر ئەو گمەگم و زریکەزریک و نرکەنرکەی ئادەمیزادەکانی سەردەمی سەرەتایی بوو، بوو بە بناغەی ئەوە کە نەتەوەکانی ئەوان لەسەر ئەو بناغەیە باوەڕ و نیازی ناسکی جوان بخەنە ناو چوارچێوەی وشەی ڕێکوپێکەوە و ناوی بنێنە هۆنراو. ئیتر هەر لە هۆنراوەوە بوو کە ویژدان پاڵی نا بە ژیرییەوە و پەخشانیش کەوتە ناوەوە.

ئەوەندە هەیە هۆنراو لە چاخەکانی ڕابوردوویا گەلێ بەرزی و نزمی بەسەرا هاتووە؛ سەرەتا سادەیەکی ڕووت بووە و هەر لێبوردن و بەزەیی مەبەست بووە، پاشان ئاڵاوە بە باڵای جوانی وشەدا؛ لێرەدا بە جۆرێک پیا ئاڵا، لێبوردن و بەزەیی بە تەواوی لەبیر چووەوە، هەر واژەکەی جوان بوایە، با مرازیشی دەرنەبڕیایە، مەبەستی نەبوو؛ تا وای لێ هات لەناو ئەو بیرەدا نقوم بووا! پاش ئەم گێجە، هۆنەرەکە کوتوپڕ تاسێک بردیەوە و کەوتە سەر ئەو هەستە: کە کاتی خۆی هۆنراو بۆچی و لە کوێ دانراوە و ئەمئێستە بۆچی ئەیڵێ و بۆ کوێ ئەڕوا؟! ئەگەر هەر وا بەم ڕێچکەیەدا بڕوا، بە تەواوی ئەخنکێ و پرزەی لێ ئەبڕێ!. ئەمجا وردەوردە گەڕایەوە و کەوتەوە خزمەتکردنی لێبوردن و بەزەیی.

وەکوو ئەمە هەیە، ئەوەش هەبووە کە ئەڵێن: سەرەتا «هۆنراو» سادەیەکی ڕووت بووە، تەنانەت لێبوردن و بەزەییشی تیا نەبووە، بەڵکوو چەند وتەیەکی بە تەنیشت یەکەوە نووساو بووە و ئەو مرازەی تێدا بە مەرج نەگیراوە: کە ڕێکوپێکیی سەردەمەکانی دوایی تێدا هاتبێتە جێ؛ واتە: ئەو چیرۆک و ڕازونیازانە کە لەپاشا کەوتوونەتە ناو هۆنراوەوە، ئەوانە سەرەتا تیایا نەبوون، لەپاش ئەوە کە ئەو تا ئەندازەیەک بتەو بووەوە و خۆی گرت، ئەو وەختە سەردەمی پەخشان هاتە ناوەوە.

## هۆی هەڵقوڵینی ئەدەبی چییە؟

بەڵێ! ئەدەب هەستێکە لە گیانلەبەرەکانا بەتێکڕایی و لە ئادەمیزادا بەتایبەتی؛ بەڵام ئایا ئەمە هەر لە خۆیەوە و وەکوو ئەیڵێن: بەبێ خشە و بەبێ تێوەژەندن پەیدا ئەبێ؟ یا شتێک هەیە بۆ بزواندنی ئەم هەستە و ئەو گێتییە دێنێتە هەژان؟ بێگومان ئەبێ شتێک هەبێ؛ ئەبێ ئەوە هەبێ: کە سەرچاوەی هەڵقوڵینی ئەدەب، ئابووری و کارەساتی نان و خوان بێ، جا با لە هەر گیانلەبەرێکا بێت. هەر ئابوورییە کە بەردی بناغەکەی بۆ دائەنێ و ئەویش لەسەر ئەو بەردەوە کۆشکی خۆی بەرز ئەکاتەوە.

هەر پەردەیەک بەسەر باری ئابووری و گۆڕانی ژیانی ئادەمیزادا هاتبێت، بەپێی ئەوەش گۆڕان بەسەر ئەدەبەکەدا هاتووە. دیارە ئەو گێجە[1] کە ژیانی ئادەمیزاد ساویلکە بووە، ئەدەبەکەشی هەر بەو جۆرە سادە و ساویلکە بووە، کە ژیانی «مایە»[2] ڕۆژبەڕۆژ هەنگاوی بۆ پێشەوە هاویشتووە، ئەویش بەرگی خۆی گۆڕیوە و چووەتە ناو گێتییەکی ترەوە. نەوەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو هەر لەبەر ئەو «مایە»یە بووە کە یاسای گەورەیی و پادشایەتی و سیاسیش هاتۆتە کایەوە؛ لەبەر ئەوە بووە، چونکە ئەو شوێنانە کە پیتدار و خواردەمەنییان زۆر بووە، زیاتر دەستدارەکان توانیویانە بیگەنێ، لەمەشەوە سەرەوژوور بووەوە و کەوتنە دەست هەرە بەدەسەڵات؛ ئەمانە ناوی پادشایەتییان بۆ خۆیان دانا و مەردمی تر لەبەر چاوبڕین لەو نانە ـکە کەوتبووە ژێر دەستی

---

۱. گێج = قەڕن.

۲. مایە = مادە

ئەوانەوە- چوونە ژێر سێبەریانەوە.

ئەمجا ئەوانەی کە هەستی هۆنراو و هۆنراو وتن لە دڵ و مێشکیانا هەبوو، بە هۆنراو و بە داستانی هۆنراوە، هاتن بە باڵای گەورەکان لە پێشا و پاشان پادشاکاندا، بۆ ئەوە لەم سووچەوە ئەمانیش بگەن بەو نان و خوانە کە مەردمەکەیتریش هەر بۆ ئەوە ئەم کۆڕەیان لە چەنبەری ئەم گەورە و پادشایانەدا بەستووە!. لێرەدا کێ زیاتر بیتوانیایە گەورە و پادشا لە بەرچاوی مەردم بەرزتر بکاتەوە، ئەوە ئەو کەسە زۆرتر و زووتر بەو ئامانجە کە ئارەزووی ئەکرد، ئەگەیشت. دیارە ئەم کینەوەرییە لە بەینی هۆنەرەکانا ئەبێتە هۆی بیرکردنەوە و دۆزینەوەی گوزارەی بەرزبەرز و وشەی جوان‌جوان، ئەو گوزارە و وشانە، کە هەر زۆر زیاد بن لە پایەی گەورە و پادشاکانیشەوە. وە بەڵکوو لە لایەکی‌تریشەوە مەردمیان هەر هان ئەدا بۆ ژێردەستەیی‌کردنی پادشا و بۆ ئەوە کە: لە ژێر فەرمان‌دەرچوونی پادشا لە وزەی ژیریدا نییە!.

لەم خۆنواندنەی ئەمان، دوو شت ڕووی دا: یەکەم ئەدەب سوودی بینی، چونکە «بەسە»ی بەرز و «واژە»ی زۆری بۆ پەیدا بوو، دووەم «ئشکیل»ـێکی[1] بێ کێشە بۆ تاقە کەسێک -کە پادشایە-. پادشا ئشکیلێکی بەرەڵای بێ کێشەی[2] وەرگرت و کەوتە وێزەی مەردمی‌تر! لەم ئشکیلە بەرەڵاییەوە سیاسەت و سیاسەتداری کەوتە ناوەوە. دیسان ئەدەب «وارە»ی[3] ئەم سیاسەتداریەشە، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە

---

١. ئشکیل: حوکم، فەرمان.

٢. ئشکیلی بەرەڵا = حوکمی موتڵەق.

٣. وارە = قەرز.

پەردەی ئەم بەو چەشنە نەئەگۆڕا.

وەکوو ئەمە هەیە، ئەبێ ئەوەش بزانین: ئەو ئەدەبەی کە ئەم سەردەمە پیشان ئەدا، تەنها ئەدەبێکی هۆنراوەیە، نەوەک ئەدەبی پەخشان -نەسری فەننی-، چونکە هۆنراوەکە زمانی ویژدان بوو، ژیری هێشتا پیایا نەئالابوو، تا بتوانێ بارەکەی بگۆڕێ بە لایەکی تردا.

هۆنەر، بە هۆنراوەکانی ئەهات پەردەی شەڕ و شۆڕ و نەبەرد و دەستڕوەیشتوویی و گەورەیی و پاڵەوانیی پادشای لە شوێنێکی بەرزدا ئەدا بە گوێچکەی ڕەمەکی مەردمدا؛ لە لایەکەوە وای لێ ئەکردن کە بە تەواوی ئامادە بن بۆ ئەوە کە هەموو بە یەک زمان و بە یەک دەنگ بڵێن: پادشا گەورەیە و لە لای خواوە هاتووە، ببڕای ببڕای ئەوەیان بە دڵا نەیە کە ملپێچی لە فەرمانی پادشادا بکەن؛ لە لایەکی تریشەوە مەیدانێکی فراوانی بێکۆسپی بۆ ئەهێنایە ئەنجام کە بە هەموو ئارەزوویەکی خۆی لەو مەیدانەدا مەیداننداری بکات و خۆی بە خاوەنی ئشکیلێکی تایبەتی وا بزانێ: کە لە وزەی هیچ کەسێکدا نەبێ بەرەنگاریی بکا.

وەکوو ئەمە هەبوو، ئەوەش هەر هەبوو: کە لەم پاشاگەردانی ئیشکیلی بێ گیروگرفتییەدا ڕەگەز و خوێن و زمان هیچی نەئەخوێنرایەوە، بەڵکوو ئەمان هەموو ئەبوایە بچوونایە ژێر سێبەری پادشایەکەوە، بەبێ ئەوە یەکێکیان بێتە زمان و بڵێ: من خوێن، وەیا زمان، وەیا خاکم جیایە و نایەمە ژێر ئەو یاسایەوە. ئەمەی پێ نەئەکرا، چونکە فەرمانی پادشا لە سەرووی هەموو زمان و خوێن و ڕەگەزێکەوە بوو!.

بەڵێ! ئیشکیلی بەرەلا ئەم زیانەی هەبوو، بەڵام لە بارێکی تریشدا

و لەلایەکی‌ترەوە سـوودێکی گەورەشی هەبوو؛ ئەو سوودەی هەبوو: کە ئەو هەموو ڕەگەز و زمانە لەپاش ئەوە کە لە ژێر سـێبەری پادشـادا کۆ بووبوونـەوە، تێکڵاو بین بە یەک و لە ڕەوشـت و نیازی یەک وردەوردە تێ‌بگەن، لەمەوە ئەو ئەندێشەیەیان بۆ پەیدا ببێ: کە بۆچ ئەمانە هەموو پێکـەوە ببەسـترێن و بکەونە ژێر فەرمانی تاقە کەسـێکەوە؟! ئەمەش دیارە سەرئەکێشـێ بـۆ لای ئەوە کە هەموو جۆرە شـتێک بدۆزنەوە، وە هەموو چەشـنە باوەڕ و کردەوەیەک دابهێنن، بەڵکوو شـتی‌تریش هەر بخەنە ناوەوە. پادشاش لەم ڕووەوە هیچی پێ ناوترێ، وەیا نایڵێ، چونکە لە وڵاتی ئەوا شت دائەهێنرێ و لە ژێر فەرمانی ئەودایە!!.

ئەمـە بەم جـۆرە گۆڕانێکی «مایـە» کەوتە ناو ڕەمەکـی مەردمەوە، لەم مایەیەوە بێ‌گومان لالغاوەی ئاسـۆی هـۆش و بیر بڵاوتر ئەبێتەوە، لەوانەیـە ئیتـر ئەوەنـدە بەتەنگ ئەدەبی بـە باڵاوتنی پادشـاوە نەبێ، بەڵکـوو پێی ئەکـرێ ئەدەبی هۆنراوەی خۆی بکا بە ئەدەبی پەخشـان و قسـە لە شـتی ئەو گەلانەوە بکا کە وەکوو ئەم لە ژێر سـێبەری تاقە کەسـێکدان و قسەکردن لە کاروبارەکەی ئەوانەوە، ئەبێ بە هەوێنێک بۆ بەئەنجام‌گەیاندنی ڕزگارکردنی گەلەکەی خۆی لە ژێر ئەو ئیشـکیلە بێ‌پرسینەوەی پادشا هەرەهەرە بەدەسەڵاتەکەدا!..

لـە گۆڕینـی ئـەم باوەڕە یەک‌لەدوای‌یەکانـەدا کـە وردەوردە ڕووی کـردە قەومـەکان و تاک و تـەرای نەتـەوەکان، بەرەبەرە هەسـتی ئەوە پەیـدا بوو: کە هەرکەس بە جیا سـەربەخۆییەکی هەیە و لە بیروباوەڕا کەس نەبەسـتراوە بە کەسـەوە. بەتایبەتـی دەسـتەیەک کەوتنە ناوەوە بانگـی ئـەوەیان دا: کـە «بوونیەتی ـ شَـخْصیّت» تاک، نرخێکی هەیە

و بە هەموو سەربەستییەکیەوە ئەتوانێ بەشـدار بێ لە سەربەخۆیی «هەسـتیی، بەشین زاتی»ـدا، ئەمانەش ئەو کەسانە بوون کە چاکیان لێ بە لادا کرد بۆ دۆزینەوەی وڵاتان و بۆ داهێنانی شت و بیری نوێ.

دەستەیەک کە ئەمە ئەڵها و باوەڕی بێ، تازە ناتوانێ خۆی ببەستێ بە یاسـای دیکتاتۆری تاقە کەسێکەوە ـکە پادشایە بەوێنەـ، بەڵکوو بەلای ئەوەوە لە سەربەسـتی و دەربڕینی باوەڕدا پادشـایەک و بێنەوایەک، گەورەیەک و پچووکێک وەکوو یەک وانە.

ئـەم بانگـەی ئەمـان، بەم جـۆرە بوو بـە ئاگرێک و چووە لەشـی یاسـای ئوتوکراتی و ئیشکیلی تاکییەوە، بەرەبەرە لە شوێن هەواری ئەوا یاسـای دیموکراتی ـ ئیشـکیلی کۆمەڵی، گزنگی دا و وەکوو گزنگی کاتی خۆرکەوتن، هەر هات و پەرەی سەند تا باوەڕەکەی هەموو گێتیی داگیر کرد.

ئـەم گۆڕانـەی کە بەسـەر باوەڕ و یاسـادا هـات، کارێکـی تەواوی کـردە سـەر ئـەدەب؛ کارێکی وا کـە بەرگی پێشـووی لەبـەر داڕنی و بەرگێکی‌تری کرد بە بەرا.

لە سـای پێشـووا ئەدەب هەر ئاڵابوو بە باڵای تاقە کەسێکا، لەمەی دواییـدا وای لێ هات بەو چاوەوە کە سـەیری یەکێکی‌تری ئەکرد، هەر بەو چاوەشـەوە سـەیری کابرای پێشووی ئەکرد. لە سـەردەمی پێشوودا واژە و گـوزارە بەسـترابوونەوە، چونکە لـە دەوروبـەری دەزگا و دوکانی تاقە کەسـێک، وەیا تاقە خێڵێک بەولاوە هیچ شـتێکی‌تر نەبوو لێی کۆ ببنـەوە و شـتی بۆ دابنێن، بەڵکوو هەر شـتێک کە ئەوتـرا، هەر وەکوو دەورکردنـەوە وابـوو. لەم سـەردەمەدا مایەی ئەدەب ئەوەنـدە زۆر بوو،

ئەگەر بە درێژایی ساڵەکانی چەرخ، شتی بۆ بوترێ، هەر لە دوایی‌هاتن نەیە.

لێرەدا لە لایەکەوە مایەی بەزەیی پیاهاتنەوە و لێبوردن و ئاوڕدانەوەی بەلای تاکەوە بۆ پەیدا بوو، لە لایەکەوە بیرکردنەوە لە شت داهێنان و پەرەسەندنی هونەری بۆ پەیدا بوو، لە لایەکی‌تریشەوە کۆبوونەوەی مەردم لە شارەکانا و چاوبڕینیان لە سەرەنجامی ڕۆژانە و بەسەرهاتیان بۆ هاتەکایەوە. ئەمانە هەموو کردیانە کارێ: کە بەرگی ئەدەب بە تەواوی جیا بێ لە بەرگەکەی پێشووی؛ ئەو بەرگەی کە وەختی خۆی ئەدەبەکە ئەیوت: «تاک بۆ فەرماندار و کیشوەرە و ئەو تاکە هیچی بەدەست نییە»؛ کەچی کە گۆڕا، ئەدەب کەوتە ناوچەیەکی‌ترەوە و لێرەدا بانگی کرد: «وا نییە، بەڵکوو فەرماندار و کیشوەر بۆ تاکە نەوەک ئەم بۆ ئەوان».[1]

بەڵێ! ئەدەب گۆڕا، لە ناوچەیەکەوە بە تەواوی کەوتە ناوچەیەکی‌ترەوە، ئەوەندە هەیە، ئێمە ئەگەر بێت و گوزارە تایبەتییەکەی ئەدەب بگرین ـکە هۆنراو و پەخشانەـ ئەتوانین بڵێین: لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانەدا کە گۆڕا، وە گۆڕانیش هەرچەندە مەرج نییە بەلای چاکترەوە بڕوا، بەڵام ئەو بەرزبوونەوەیە کە بەپێی درێژیی ئەو ڕۆژانە بەسەر پەخشانا هات، بەسەر هۆنراودا نەهات، بەڵکوو هۆنراوی سەردەمی پێشوو ـکە سەردەمی ئیشکیلی تاکیی بووـ بەرزتر بوو، ئەمەش لەبەر ئەوەبوو: کە لە کاتی پێشووا هەموو هێزێک هاتبووە سەر هۆنراو، واتە: پەخشان ئەوەندە لە کایەدا نەبوو، هەموو جۆرە شتێک بە هۆنراو ئەدرا بەگوێی مەردما، لە گێجی دواییدا ـگێجی ئیشکیلی کۆمەڵییـ لقێکی‌تر لە

ئەدەبی هۆنراو بووەوە و بوو بە ئەدەبی پەخشان... لێرەدا بە ئاشکرا هێزی وتنیش ئەبێ بە دوو بەشەوە و هەریەکە ڕوو لە لقێک ئەکەنەوە. ئەو هەموو هێزە کە جاران لەسەر هۆنراو هەبوو، کەرتێکی کەوتە سەر پەخشان!.

لەمەوە بۆمان دەرئەکەوێ: کە هۆنراوەکەی تافی پێشوو بەرزی و قایمییەکی‌تری هەبوو لەچاو تافی دواییدا. ئەمە و دیسان لەبەر ئەوە: کە هۆنراوەکەی سەردەمی پێشوو، زۆرتر هەر چیرۆکیی بوو، واتە: بە هۆنراو هەموو شتێک ئەخرایە پێستی چیرۆکەوە، ئەوانەی دوایی ئەوەیان پێ نەئەکرا، بەڵکوو، زۆرتر چیرۆکەکان هەر بە شێوەی پەخشان ئەوتران و بە پەخشان بڵاو ئەکرانەوە.

❀❀

## ئەدەبی ئوتوکراتی و ئەدەبی دیموکراتی

بەپێی ئەم قسانە کە تا ئێستە لەم شوێنەدا کران، ئەدەب سەرەتا لە ناوچەیەکی ئوتوکراتییەوە پەیدا بووە و پاشان کەوتۆتە ناوچە دیموکراتییەکەوە!. ئەمە وا ئەگەیەنێ: ئەو سەردەمە کە سەردەمی ئوتوکراتی بووە، ئەدەب هەر لەو پایەدا بووە، ئەدەبی دیموکراتی بە هیچ جۆر لەو ڕۆژانەدا نەبووە؛ واتە: لە دوایی هاتنی ئەوا، ئەو وەختە ئەم هاتۆتە ناوەوە!. لەگەڵ ئەوەدا، باوەڕێکی‌تر هەیە کە ئەڵێ: ئەدەبی ئوتوکراتی هی دەستەی ستەمکار و ئەدەبی دیموکراتی هی دەستەی ستەمبارە. تا ستەمکار و ستەمبار هەبووبێ، ئەدەبەکەشیان هەبووە و ئەبێ، وە بەڵکوو لە بەرەبەیانی مێژوویانەوە شانبەشانی یەک

هاتوونەتــە خــوارەوە!. کە ئەمە هەبوو، ئەبێ ئەو ســەردەمە کە ئەدەبی ئۆتوکراتــی هەبــووە، ئەدەبی دیموکراتیــش هەر هەبووبــێ. کەوابوو ئەو قسەیە نەچووە سەر کە ئەڵێ: لەپاش دوایی هاتنی سەردەمە ئۆتوکراتی و ئەدەبی ئۆتوکراتییەکە، ئەو وەختە ئەدەبی دیموکراتی پەیدا بووە!!.

ئــەم باوەڕە هەیــە، بــەڵام ئایا باوەڕەکــە لەگەڵ ڕاســتی و چۆنیەتیدا ئەگونجــێ؟ یا هــەر بیروباوەڕێکــی ڕووتــە و دوورە لــە مەبەســتە دروستەکەوە؟!

ڕەنگبــێ ئەمــەی دواییــان بــێ، چونکە: ڕاســتە وەکوو ســەردەمی ئۆتوکراتــی ســتەمکار هەبــووە، ســتەمباریش هــەر هەبــوو، ئەگەر ئەم نەبووبێ، ئەوی پێشــوو نابێ بە ســتەمکار! جا کە ستەمکار و ستەمبار لــە ناوا هەبــوو، بە جۆرێکــی پێویســتیی ئەبێ ئەدەبی ســتەمباریش هــەر هەبووبێ، بەڵام قســەکە لێرەدا لەوەدا جیا ئەبێتــەوە کە ئەوترێ: سەردەمی ئۆتوکراتی ئەدەبەکەی هەر ئۆتوکراتی بووە، مەبەست ئەوەیە: بەشــی هــەرە زۆری ئــەو ئەدەبە لەو ڕۆژانــەدا هەر ئەدەبــی ئۆتوکراتی بــووە، ئەگەر ئەدەبــی دیموکراتیش هەبووبێ، لەبەر جەوری ســتەمکار نەیتوانیــوە خــۆی بنوێنێ! بگرە لەوانــە بووە لەبەر ئەوە هەســتی زۆری ستەمکار بە جۆرێ باڵی کێشابوو بەسەریا، هۆشی لێ چنیبوو، یا لەوانە نەبوو بە چەشــنێکی نیوە ئاشــکراش تەنانەت ســتەمبار ئەدەبی خۆی دەربــڕێ؛ وەیا ئەگــەر تاکەتاکەیەکیش بەبێ دەنــگ دەریببڕیایە، ئەو ماوەیە نەئەدرا کە بکەوێتە دەســت کەسانیتر، وەیا بتوانێ هەستییەک بۆ خۆی پەیدا کا!.

جــا لەبــەر ئەمــە، هەر فەرمــان بەوە ئەکــرێ: کە لەو ســەردەمەدا

ئەدەبـی دیموکراتـی نەبووە و نەکەوتۆتـە بازاڕەوە، بەڵکوو ئەو ئەدەبەی کە خۆی نواندووە هەر ئەدەبی ئۆتوکراتی بووە و هیچی‌تر. وێنە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەم جۆرە شتانە لە لایەن بەڵگەوە زۆرە.

❃❃

ئەم قسـانە هەموو ئەوەیان دەرخسـت، کە سـەرەتا ئـەدەب چۆن کەوتۆتە ناوەوە؟ بەبێ ئەوە تایبەتی بکا بە نەتەوەیەک و نەتەوەیەکی‌تری لـێ بێبـەش بـکا. بەڵکـوو ئـەدەب بوو بـە قەفـی دارێـک و هەموو نەتـەوەکان بوون بە لق و پۆپی دارەکە و لە ئاو خۆرکەکەیەوە ئەوانیش وەریان گرت.

ئەمـە و دیسـان وەکوو لـە پێشـترا بەجۆرێکی تێکڕایـی و تایبەتی سـەردەمەکانی پێشوو گوزارەی ئەدەب تێ‌گەیشـتین، ئەمجا ئەمانەوێ لە ڕاستیدا بزانین: ئایا ئەو گوزارەیە بە تەواوی بوو بە «بەسە»ی ئەدەب لە هەموو چەرخەکانا، یان نەء؟.

وا دیارە، وەکـوو ئـەدەب خـۆی گـۆڕا و گۆرانـی بەسـەرا هـات، لە گوزارەکەشـیا چەشـنی گۆڕانی بەسـەرا هاتـووە، چونکە ئێسـتا ئێمە بە جۆرێکی‌تـر لـە ئـەدەب تێ‌ئەگەیـن. ئەڵێیـن: «ئـەدەب ئاوێنەیەکە ڕووبـەڕووی گـەل ئەوەسـتێ، چـی لـەناو ئـەو گەلـەدا هەبـێ، تیایا دەرئەکەوێ. کەوابوو، ئەدەب ڕاستەوڕاست بوو بە ئاوێنەی گەلەکە، لە بەرزیی، لە نزمیی، لە خۆشـیی، لە ناخۆشـی و چەوسانەوە؛ هەمووی تیایا ئەبینرێ».

ئەمە ڕاسـتە: کە گـوزارەی ئەدەبی پێشـوویش هـەر ئاوێنە بوو بۆ

دانــەدواوەی کەینوبەینی ئـەو نەتەوەیە، بەڵام کەینوبەینەکەی پێشــوو ـسـەردەمی ئیشـکیلی تاکیـی- لـەناو چوارچێوەیەکی تەنگـدا بوو، لە ئاوێنەکـەدا بـە تەواوی دەرنەئەکـەوت، وەیا ئاوێنەکـە ئەوەندە فراوان نەبـوو بتوانــێ پیشــانی بدا، هــەر ســروود وەیا پیاهەڵوتنێ بــوو بۆ تاقە کەسێک، دیارە مەیدانی ئەمە مشەمەرییەکی وا نییە کە هەموو کەلێن و قوژبنەکەی بە پوختی بۆ دەرکەوێ.

هــی ســەردەمی دواییــش ـسـەردەمی ئیشـکیلی کۆمەڵیــی- بەڵێ مەیدان بڵاو بوو، بەڵام هێشتا بە تەواوی لە دیلیەتی سەردەمی ئیشکیلی تاکیــی ڕزگاری نەبووبــوو، تا بتوانــێ بــە گوزارەی ئێســتا لە «بەسـە»ی ئەدەب ورد ببێتەوە؛ ئێســتا لەبەر ئەوە کە وەکوو باســی کۆشکی خاوەن کۆشـکێک، وەیا ڕابواردنــی خــاوەن دەســەڵاتێک ئەکا، بـەو جۆرەش ئەتوانێ باســی کەوێڵێک، وەیا ڕابواردنی خــاوەن کەوێڵێک بە هەموو سەربەستییەکەوە بکات.

کەوابوو، ڕاســت بوو بە هەموو ڕەنگێک ئێســتا ئەدەب ئاوێنەیەکە و چۆنیەتی ئەو کۆمەڵە وەیا ئەو گەلە پیشــان ئەدا و گوزارەکەی لەگەڵ گوزارەی پێشوودا گۆڕانێکی زۆری بەسەرا هات، واتە فرە گوشاتر بووەوە.

❋❋❋

# بەشکردنی ئەدەب لەناو خۆیدا!

وتـرا: نیـگار ئەدەبە، پیشـە ئەدەبە، سـاز و ئـاواز ئەدەبە، نووسـین ئەدەبـە. ئەمە ئەوە ناگەیەنیّ: کە ئەدەب هـەر لەناو ئەم چوارچێوانەدا کـۆ ئەبێتەوە؛ واتە: تەنهـا ئەمانە ببن بە گوزارەی ئەدەب و ئیتر ئەدەب نەتوانێ لەم ناوچانە پێیەکی‌تر باوێژێ بەو لاوە.

هەموو شت لە «بُوِش ـ کەون»ـدا[1] «هاوگری ـ خدیە ـ نسبی»ـیە، ئەو شـتە لە مایەدارەکان ـ مادیات ـ بێ، وەیا چەمکیی ـ مەعنەویات ـ بێ.

ئێسـتە کە وتمان ئەدەب ئەوانـەن، واتە: لە بارێکا کە باری هونەرە؛ لـە کاتێکی‌ترا کە باسـی ئـەدەب ئەکەیـن و ئەڵێین: ئەمەیـە، لەگەڵ ئەوەشـا ئەو شـتە کە لە ناسـینەکەی دواییدا ئەیکەین بـە گوزارەکەی، لـەناو «کەمە ـ دایـەرە»ی[2] گـوزارەی پێشـوویا نەبـووە؛ ئەمـە ئـەوە ناگەیەنـێ کـە ئەوی‌تر کرا بـە ژێر لێـوەوە، وەیا ئەوی پێشـوو کراوە بە «چەنبەر ـ دایەرە»یـەک[3] و تەنهـا ئـەو گوزارانـەی تـێ خـراوە، وەیا تایبەتیی کراوە بەوانەوە، بەڵکوو هەموو هاوگرییەکە ئەگرێتەوە.

وەیا بە وێنەیەکی‌تر ئەڵێین: «هەر من چووم بۆ بازاڕ». لەم ڕستەیەدا چوونی بازاڕ تایبەتی بووە بە منەوە و کەسـی‌تر نەچوو، لە کاتێکی‌ترا کە ئەڵێین: «من چووم بۆ بازاڕ». چوونەکە وەنەبێ تایبەتی ـ حەسر ـ بووبێ

---

١. [«بُوِش»: بوون].

٢. [کەمە: چەنبەر، کەوانە، ئاخڵە، چەمەرە].

٣. [چەنبەر: کەوانە، ئاخڵە، چەمەرە، کەمە].

بـە منەوە، بەڵکوو من تایبەتیم بە چوونەکـەوە؛ واتە: ئەم چوونە بۆ من هەبووە، ئیتر وەنەبێ ڕێگا لە چوونی یەکێکی‌تر گیرابێ، ئەگەر ئەویش بچێت هیچ بەرهەڵستێکی بۆ نابێ.

مەسـەلەی گوزارەکانـی پێشـوویش بۆ ئـەدەب ئەو سـەمەرەیەی هەیـە؛ ئێمە ئەڵێین: ئەو شـتانە گوزارەی ئەدەبن؛ خـۆ ناڵێین: ئەدەب هـەر ئەم گوزارانـەی هەیە؛ لەبەر ئەوەیـە، بۆیە بە قووڵـی ئەچینە ناو جەرگی باسەکەوە و ئەڵێین:

ئـەدەب، ئـەو ئەدەبە کە ئێمـە مەبەسـتمانە، ئەبێ بـە دوو لقەوە: ئەدەبی پەخشان، وەیا ئەدەبی سادە «نەسری فەننی»، ئەدەبی هۆنراوە کـە ئەدەبـی شـیعرییە. هەریـەک لەم دوو لقـەش ئەبن بـە دوو وەیا سـێ بەشـی‌ترەوە: ئەدەبی چۆنیەتی، واتە: ئەدەبـی واقیعیی. ئەدەبی نیازیـی[1]، واتە: ئەدەبی عاتیفی. ئەدەبـی جەفەنگی[2]، واتە: ئەدەبی ڕەمزیی.

گومانێک لـەوەدا نییە کە ئەدەبی چۆنیەتی و ئەدەبی نیازی هەیە، بـەڵام ئەدەبە جەفەنگییەکە تـۆزێ وردبوونەوەی تیایـە. ئەمەش لەبەر ئەوەیە: کە تا ئێسـتا زۆرتر ئەدەب هەر بەو دوو چەشـنە دانراون، گۆیا وا چووەتـە دڵەوە کـە ئەدەبی جەفەنگی چووەتە ناو پێسـتی ئەوانەوە، لەگەڵ ئەوەشا وا نییە.

---

١. نیاز بۆ عاتیفە لەو شێوەیە وەرگیراوە کە ئەڵێ: «ئەی قەرە وە گردش کەفتم حەتا نیازی خاس وەپێم کرد».

٢. جەفەنگ بۆ ڕەمز لەو شـێوەیە وەرگیراوە کە ئەڵێ: «بە جەفەنگەوە پێی ئەیژێ» واتە: بە ئیما و ئیشارە و ڕەمزەوە.

وا نییـە، چونکـە دوور نییـە تێکڵاوییەکـی لەگـەڵ ئەدەبـە چۆنیەتییەکـەدا هەبـێ، بەڵام بـە هیچ جۆر ئاشـنایەتی لەگەڵ ئەدەبە نیازییەکـەدا نییە؛ بۆیـەش نیەتی، چونکە ئەدەبی نیـازی ئەگەر بێت و ڕاستەوڕاسـت شـتەکە دەربڕێ، ئەوە بوو بە ئەدەبێکی چۆنیەتی، خۆ ئەگەر لە ژێر پەردەدا هێشتیەوە، ئەوە گومانێکی تێدا نییە کە بێجگە لە دەستکردی ئەندێشەکە، پۆشراوییەکی‌تری هەر تێدا هەیە، کە مەبەستە پەنامەکییەکەی شـتێکە و هی ڕواڵەتییەکەی شـتێکی‌تر. کە پەنامەکی تێدا هەبوو، ئەوا ئەدەبی جەفەنگیش پەیدا بوو.

## ئەدەبی نیازی

تا ئێسـتە بە جۆرێکی زۆر کورت ناوی ئـەم ئەدەبانە هێنران، لێرەدا ئەمانەوێ «ناوک»ـی هەریـەک لەمانەمان بە تـەواوی بۆ دەرکەوێ؛ ئەدەبی نیازی ئەوەیە: کە یەکێ ئەیەوێ باسی شتێک بکا، لە باسەکەیا نیاز و ئەندێشـە بە هەموو لایەکدا پەل بڵاو ئەکاتەوە، وشـەی جوان و گوزارەی نایاب پەیدا ئەکا و شـتەکە وا لێ ئـەکا ئەیگەیەنێتە ئەوپەڕی جوانی؛ وای لێ ئەکا هەر کە پیاو گوێی لێ بوو، هەسـت بە چەشـە و گەشـەیەکی وا ئەکا، خۆی لەبیر ئەچێتەوە. ئیتر ئەو کەسەی ئەدەبەکە دائەنـێ، چاوی لەوەوە نییە کە ئەمە لەگەڵ ڕاسـتیدا یەک ئەگرێتەوە، یا ناگرێتـەوە؟ چـاوی لەوەوە نییە، چونکە کۆششـی ئەو هەر بۆ ئەوەیە هەست ببزوێنی، جا با بزواندنەکەی بۆ هەر مەبەستێک بێت.

بەڵـێ! لـە ئەدەبـی چۆنیەتییەکەشـدا بزواندنـی هەسـت هەیـە، بـەڵام بزواندنەکـەیان گەلێ لێک جیـان؛ بزواندنێک کە لـە ئەدەبی نیازیـدا هەیە، بزواندنێکە ڕوو لە ئاسـمانی ئەندێشـە و نیـاز ئەکاتەوە،

بـە پێچەوانـەی ئەدەبە چۆنیەتییەکـە، ئەو هەر ڕاستەوڕاسـت ڕوو لە کارەساتەکە ئەکاتەوە و هیچی‌تر. وێنەیەک بۆ ئەدەبی نیازی وەکوو لەم پارچە پەخشانەدا کە ئەڵێ:

«یا، کەڵە و کەڵکەڵەی کەڵان و لە نازی ئاوازی مامزی سـارا سـەما ئەکات و کافووری بەفری پیرەچیا لە سـامی جێ‌سـمی بەزمی هەناوی نسـرم و هـەتاوی، هۆنە ئەکات و نـزاری وەک کۆمەڵـی گەوهەر بریقە ئەدا».[1]

سـەیر ئەکەین ئەندێشە پەلی هاویشتووە و خۆی خستۆتە ئەوپەڕی عەزیـەتـەوە، جـۆرە گـوزارە و وشـەیەکی وای بـەکار هێناوە، کـە تەنها ڕازاندنەوەکـەی هەسـتێکی تایبەتی ئـەدا بە نەفس، بـۆ بووژاندنەوەی مێشـک لە بیستنی ئەم جۆرە شـتانە!. بەڵکوو ئەگەر بێنین ئەندێشەکە و ڕاسـتییەکە بخەینە دوو تاکی تەرازووەوە، ئەندێشەکە گەلێ گرانترە لە ڕاستییەکە، چونکە ڕاستییەکە لەم پارچەدا ئەوەیە کە بڵێت:

«ئایا ئەمە کەڵەکێوییەکە، لەبەر خۆشـی دەنگی ئاسکی دەشتەکان کەوتۆتـە سـەماکردن و بەفری نسـرم و بـەر هەتاوی ئـەو کێوانەش لە ترسی یاریکردنی ئەو کەڵ و ئاسکانە ئەتوێنەوە؟ کە بەفریش نەما بەر هەتاوەکەی بە هۆی تیشکی ڕۆژەوە بریقە ئەداتەوە!».

وەیا لە وێنەی هۆنراودا، هۆنراوێکی «ناڵی» ئەڵێ:

**گەرمی و تــەڕی بەهارە کە پشــکۆ کوژایەوە**
**پشکۆی گوڵاتەشین بە نەسیم بوو گەشایەوە!**

---

١. لە وتارێکی عەلائەددین سەججادی لە ژمارە «٣»ی ساڵی «٤»ی «گەلاوێژ»دا.

دیسان لە هۆنراوێکی‌تریا ئەڵێ:

**نووکـــی خامـــەی مـــن کـــە بێتـــە مەعنیارایـــیێ کەمال**
**خەت بە خەت ئیزهاری نەقشی سوورەتی «مانی»ئەکا!**

لــەم دوو هۆنراوەدا نیاز تا ئەوپەڕی تیژی فڕیوە، قووڵیی گوزارەکانیان گەلــێ قووڵتــرن لە واژەکــە. لەوانەیە بڵێیــن: نیازیش هــەر بە عەزیـەت ئەیانگاتێ، چونکە هۆنەر هێناویە لە هۆنراوی یەکەمدا بە جۆرە ژمارەیەک مەبەســتەکەی دەربڕیوە؛ ئەو مەبەســتەی کە ئەیەوێ باسی جوانییەکی بەهارت بۆ بکا. ژمارەکەش بەم جۆرە لەناو کوردەواریـدا هەیە و ئەڵێ:

بــەو جۆرەی کە حیســاب‌ژمێران لێکیان داوەتــەوە: لەپاش ئەوە کە نیوەی زستان بەســەر ئەچێ، سێ تەوژم پەیدا ئەبێ، ئەمانە هەریـەکە ناوێکیان هەیە: تەوژمی یەکەم بە چل‌وچوار ڕۆژ پێش نەورۆز ئەبێ و پێی ئەڵێن: «تەوژمی هــەوا». تەوژمی دووەم بە مانگێک پێش نەورۆز ئەبێ و پێی ئەڵێن: «تەوژمی ئاو». تەوژمی سـێیەم بە بیســت‌ویـەک ڕۆژ پێــش نەورۆز ئەبێ و پێی ئەڵێن: «تەوژمی زەوی». هەریـەک لەم تەوژم ـتین‌ــنانە لەناو کوردەواریـدا بە پشکۆ ناو ئەبرێن؛ واتە: ئەوترێ «پشــکۆ کەوت». پشــکۆیش لە زمانی کوردیدا بە «سکڵ» ئەڵێن، واتە: پشــکۆی ئاگــر. کە وترا: پشــکۆ کەوت، مەبەســت ئەوەیە: کــە تەوژم و هێزی سەرما شکا و ئیتر بەلای فێنکی و گەرماوە ئەڕوا.

جا ئەڵێ: لەبەر گەرمی و تەڕی کەوتنی پشکۆی بەهارە، کە پشکۆی ئاگر ئەگوژێتەوە[1]؛ ئەو ئاگرە کە بەهۆی سەرمای زستانەوە ئەکرێتەوە،

---

١. [ئەگوژێتەوە: ئەکوژێتەوە، خامۆش ئەبێ. گوژاننەوە: کوژاندنەوە].

كە ئەو پشــكۆیـە كەوت، ئەو ئاگرە ئیتر ئەگوژێنرێتەوە و پێویست بەو نامێنێ؛ واتە: تینی هەوا ئەشــكێ. لە پشــكۆی یەكەم و سێیەمدا گەرما وەرئەگیرێ، لە هی دووەمدا ـكە هی ئاوەـ سروشتێكی تەڕ وەرئەگیرێ.

ئەمە و دیســان «بایس ـ لازمێت»ـێك لە بەینی گەرما و پشــكۆدا هەیە، كەچی لە هۆنراوەكەدا ئەو بایسییە بوو بە «مێملّی ـ تَضاد»! واتە: كــە وترا پشــكۆ، ئەبێ گەرمایــی هەبێ و پیاو كوتوپڕ بیــر لە گەرمایی ئەكاتــەوە، كەچی لێرەدا وا نییە!. لێرەدا نەمانی پشــكۆكە بەهۆی بوونی گەرماكەوەیە، واتە: كە گەرما هات، ئەو پشكۆیـە نامێنێ!.

ئــایا مەبەســت بــەم گەرمایيــە، ئەبــێ چ گەرمایيــەك بــێ؟ دیارە مەبەســت ئــەوە نییە: كە هەر شــتێك گەرم بــوو، ئیتر ئەبــێ لەگەڵ ئاگــردا ڕێ كەوێ؛ ســەیر ئەكەی ئاوی كوڵاتــوو گەرمە و كەچی لەگەڵ ئاگریشــا ڕێ ناكــەوێ، كە ئەو ئاوە كــرا بە ئاگرەكــەدا ئەیكوژێنێتەوە!.. كەوابوو، مەبەســت بە گەرماكــە، گەرمایيێكە كە لە ئــاوی بەهارەكەدا هەیە؛ بەهار، كە ئەو گەرمایيەی هێنا، پشكۆكە ئەگوژێتەوە.

لە نیوە هۆنراوەی دووەمیشــیا ئەڵێ: گوڵووك[1] و گوڵاڵە و خونچەی دارەكان كە لە ســووریدا وەكوو بڵێسەی ئاگر وانە، بەهۆی بای نەسیمی بەهارەوە گەشانەوە و دەمیان كردەوە.

بەم جۆرە، هۆنەر گوزارەیەكی نیازیی خســتۆتە ناو چوارچێوەی تاقە هۆنراوێكــەوە و ئەم هەمووگرانییەی پێ داوە!. لەگەڵ ئەوەشــا پاكژی مەبەســتەكەی، ئەیــەوێ باســی جوانییەكــی بەهــارت بۆ بــكا و بڵێ: «بەهۆی هەوای تەڕ و فێنك و گەرمی بەهارەوەیە كە ئیتر پێویسـت بە

١. [گوڵووك: گلۆك، پشكوژ، شكۆفە، هەراڵە، چرۆ، خونچە].

ئاگری زستان نامێنێ و پشکۆی ئەو ئاگرە ئەگوژێنرێتەوە، وەیا تەوژمی هەوا ئەشکێ، گوڵاڵە و خونچە ئەپشکوێتەوە و ئەگەشێتەوە».

وەیا لە هۆنراوەی دووەمدا بە وردی چووەتە ناویەوە و ئەڵێ:

نووکـی قەڵەمی من کە بێتە مەیدانی نوکتەبازی و گوزارە ڕازاندنەوە، هەر خەتێ کە ئەینووسـێ، وەکـوو نەخش و نیگاری وێنەکانی «مانی» چۆن مەردمیان سەرسام ئەکرد، ئەمانەی منیش وانە.

کەچی ئەو بە چەشـنێک هاتۆتـە ناوەوە، لەوانەیە وەختە چۆنیەتی هۆنراوەکـە لـە ژێـر نیازەکـەدا ون ببـێ و پیـاو بـەلای ڕاسـتییەکەدا نـەڕوا!. بۆیــەش وای لــێ کـردووە، چونکـە خـۆی خسـتۆتە گۆمـی وێنەکانـی «مانی»ـیەوە و ئەیـەوێ هۆنراوەکـەی خـۆی بـکا بـە «پەرجۆ[1] ـ مُعجِزە»کانی مانییەوە![2].

١. [پەرجۆ: موعجیزە، کاری لە عادەتبەدەر].

٢. «مانی» پیاوێکی زیرەکی وێنەگر و کوڕی «فاتک» و خەڵکی هەمەدان بوو. لە «٢١٥»ی میلادی هـەر لەوێـدا هاتۆتە دنیاوە، پاشـان هات بۆ وڵاتی «بابل»، لەم شـوێنەدا خەریکی لێکۆڵینەوەی ئایینەکانی گاوری و جوولەکە و زەردەشـتی بوو؛ لەمەوە وردەوردە دەسـتی دا بـە داواکردنـی پێغەمبەریەتییـەوە، ئایینەکـەی لەو سـێ ئایینـەی پێشـوو هەڵبژاردبوو. کتێبێکـی بەنـاوی «ئەرژەنگ»ـەوە هەبـوو، ئـەم کتێبـەی بە وێنـە و وێنـەکاری بە جۆرێ ڕازاندبـووەوە، هەرکەسـە چاوی پـێ بکەوتایە، ئیمانی بە باوەڕەکانـی ئەهێنا، ئەم کتێبەی کردبوو بە پەرجۆی خۆی.

لـە «٢٤١»ی میـلادی لـە سـەردەمی «شـاپوور»ی یەکەمـی ساسـانیدا گەڕایەوە بـۆ ئێران و لەبـەر ئـەوە کـە یەکـێ لـەو کتێبانـەی خۆی بە دیـاری نارد بـۆ شـاپوور، توانی بە ئاشـکرا ئایینەکەی خۆی لە ئێراندا بڵاو بکاتەوە. لەپاش ماوەی دە سـاڵێک شـاپوور لێی تووڕە بوو، ئیتر نەیتوانی دانیشـێ، چوو بۆ ئاسـیای ناوەڕاسـت و هیند و چین، لەوێ دیسـان دەسـتی کردەوە بە بڵاوکردنەوەی ئاینەکەی خۆی.

ئەوندە هەیە ئەتوانین بڵێین: ئەمە هۆنراوە و ئەو شتانە کە لە پەخشانا ڕەوا نییە، بۆ هۆنراو چاوی لێ ئەپۆشرێ؛ جا لەبەر ئەو چاولێپۆشینە هۆنەر ناتوانێ دەست لە ڕێگای خۆی هەڵگرێ و هەر ئەبێ هۆنراوەکەی وا دابنێ!.

وەڵامەکەی ئەڵێین: ئەگەر مەبەستی هەرە زل گوزارەیەکی سادە بێ، ئەوە گومانی تێدا نییە: کە بە وشەیەکی سووک و بێگرێ ئەتوانێ دەری بڕێ؛ خۆ ئەگەر مەبەستیش وشەی چاخ و گوزارەی ورد بێ، ئەوە ناتوانێ لە ئەدەبێکی نیازیی بەولاوە، پێیەکیتر باوێژێ.

بەڵێ! وترا: ئەدەبی نیازیی ئەوەیە: کە هۆش و بیر بە هەموو لایەکدا پەل بڵاو بکاتەوە و وشە و گوزارەی وا بێنێتە ناوەوە، کە هەستی گوێگر وەیا خوێنەر، بە تەواوی ڕاکێشێ.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێ: کە ئەگەر شتێک لەو بەشەدا پێی ئەڵێن ئەدەبی نیازیی، گوزارەکانی ورد و وشەکانی زل نەبوون، ئەبێ بەر ئەدەبی نیازی نەکەوێ؛ ئەوە ناگەیەنێ، چونکە لێردا مەرجەکە ئەوەیە: کە هەر شتێک سۆز و گودازێکی دا بە گوێگر؛ سۆز و گودازێکی وا کە لە بارەی ئەدەبی چۆنیەتی و جەفەنگیدا نەبێ، ئەبێ بە ئەدەبێکی

---

کە شاپوور لە «٢٧٢»دا مرد، گەڕایەوە بۆ ئێران؛ پێشەوایانی ئایینی زەردەشتی کۆنەڕقیان لە «مانی» هەبوو، «بارام»ـی کوڕی شاپووریان لێ هان دا. بارام بانگی کرد و لە بارەگای ئەودا لەگەڵ پێشەواکانا کەوتنە قسەکردن و دەمەقرە. لەپاش چەند و چوونییەکی زۆر، لەبەر ئەو کۆنەکینە کە لەناودا هەبوو، بارام فەرمانی دا بە کوشتنی. لە «٢٧٦»دا کوشتیان و پێستەکەیان پڕ کرد لە «کا» و لەسەر دەروازەی «جوندی شاپوور» ـ کە لە خووزستانە ـ هەڵواسرا؛ بەڵام پەیڕەویکەرەکانی هەر وازیان نەهێنا، لەسەر ڕێوشوێنی ئەو، بە تەکان نەڕۆیشتن. لە سەردەمی ئیسلامیدا بەمانەیان ئەوت: «زندیق».

نیازیـــی؛ بـــەڵام ئەوە مـــەرج نییە کە بڵێت: هەر شـتێک وشـــەی زل و گوزارەی ورد نەبوو، ئەوە ئەبێ ئەدەبی نیازیی نەبێ!.

وەکـوو سـەیر ئەکەین، لـەم پارچانەی خـوارەوەدا ناتوانیـن بڵێین: وشەکانی زلن، وەکوو ناشتوانین بڵێین: گوزارەکانی ئەوەندە وردن؛ مەگەر هۆشـێکی زۆری تیـا بخرێتە کار، ئـەو وەختە بۆت دەرکـەوێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشـا هەر بە ئەدەبی نیازیی ناو ئەبرێ، چونکە خورۆشێکی وا ئەخاتە دانەر و گوێگرەوە، لەوانەیە بە تەواوی پێی چەشەدار بین.

یەکێ لـەو پارچانە چامە[1] نایابەکەی «حەماغای دەربەنفەقەرە»یە کە بە «٢٥» هۆنراو هاوسەری ژیانی لەپاش کۆچکردنی، ئەلاوێنێتەوە و سەرەتای ئەکاتەوە بەوە کە ئەڵێ:

**گڵکۆی تـــازەی لەیل، گڵکۆی تـــازەی لەیل**
**ئـــارۆ شـــیم وە ســـەیر گڵکۆی تـــازەی لەیل**
**نـــە پایـــەی مـــەزار ئـــەو لەیـــل پـــڕ مەیـــل**
**جە دیـــدەم واران ئەســـرینان چون ســـەیل**
**شـــیم وە ســـەرینش بـــەو دڵـــەی پـــڕ جۆش**
**ســـەنگ مـــەزارش گرتـــم نـــە ئاغـــۆش**
**واتـــم: ئـــەی دڵســـۆز، قەیس پـــۆس نە کۆڵ**
**موبارەکـــت بـــۆ یانـــەی تەنیـــای چـــۆڵ!**

وەیا چامـە بەناوبانگەکـەی «ناڵـی» کـە لـە شـامەوە یادی وڵاتـی

١. [چامە: هۆزان، پارچە شیعری درێژ، قەسیدە، هەڵبەست، بەیت، چیرۆك بە شیعر].

سـولەیمانی ئەکاتەوە و بە چەپەری[1] نەسیمدا ئەو سۆزەی دەرئەبڕێ و ئەینێرێتەوە بۆ وڵاتە دوورلێکەوتووەکەی. بە «٤٣» هۆنراو سەرەتای گڕی دەردی دەروونی دەرئەبڕێ و ئەڵێ:

**قوربانــی تــۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خــۆش مروور**
**ئەی پەیکی شــارەزا بە هەموو شــاری شــارەزوور**
**ئەی لوتفەکــەت خەفی و هەواخــواه و هەمدەمە**
**وەی سروەکەت بەشــارەتی هەر گۆشەی حوزوور**
**ئەی هەمەمەزاجی ئەشــکی تەڕ و گەرمی عاشــقان**
**تۆفانــی دیــدە و شــەرەری قەلبــی وەک تەنوور!**
**گاهــێ دەبــی بــە ڕەوح و دەکەی باوەشــێنی دڵ**
**گاهــێ دەبی بــە دەم، دەدەمێنی دەمــی غورووور!**

تەماشـا ئەکەین: لـەم هۆنراوانــەدا وەنەبــێ ئەو ناسـاندنەی کە بۆ ئەدەبــی نیازیی باس کـرا، لەمانەدا بە تەواوی بەجــێ هاتبێ!، کەچی لەگەڵ ئەوەشا بەرزتر ئەدەبێکی نیازین، بەڵکوو کە گوێمان لە شتی وا ئەبــێ، لەوانەیە بڵێین: هەموو ئەدەبی نیازیــی هەر ئەبێ ئەمانە بن!. چونکـە هۆنەر لە پارچــەی یەکەمدا بە جۆرێ دووری هاوسـەری کاری تێکردووە، کە هەموو هەسـت و هۆشـێکی خۆی و گوێگری خسـتۆتە ناوچەیەکەوە، کە لەو ناوچــەدا تەنها بەزەیی نەبێ هیچچیتری تیا نییە. وای لێکردووە کە لە تاوانا لە ناوەڕاستی ڕۆژدا ئەچێتە سەر کۆگای گڵی

---

١. [چەپەر: نامەبەر، پۆستەچی].

گۆڕی یاری؛ بە چاوپێکەوتنەکەی، لافاوی فرمێسک هەڵئەڕێژێ؛ بەبێ هۆش کێلی لای سەرووی گۆڕەکەی ئەگرێتە باوەش و پێی ئەڵێ: ئەی وەکوو مەجنوونی چۆلگەردی پێست لە کۆڵ! پیرۆزت بێ ئەم ماڵی تەنیاییەت، کەوا جارێکیتر من ناتبینمەوە.

دیارە ئەم گوزارەیە وەختێ وایە کە وشەی «دڵسۆز» و ڕستەی «قەیس پۆس نە کۆڵ» سیفەت و مەوسووف بن. ئەوەندە هەیە بە «خوازە ـ مَجاز» پۆست لە کۆڵکردن ـکە سیفەتی مەجنوونە ـ داویە بە یاری ژێر گڵی ـکە لەیلە ـ چونکە مادام یەکێک پاڵی بە دنیاوە نا لەبەر هەر شتێک بێ، ئەو یەکە پیاو بێ وەیا ئافرەت بێ، کەوڵ لە کۆڵ ئەکا و بە دەشت و هەردا ئەسووڕێتەوە؛ کەوابوو، مەرج نەبوو کەوڵ لە کۆڵکردن هەر ئەبێ بۆ مەجنوون بێ کە پیاوە، وەیا هەر ئەبێ بۆ پیاوێک بێ کە دێوانەیە.

خۆ ئەگەر هۆنراوەکە بە ئیزافە بخوێنرێتەوە؛ واتە بخوێنرێتەوە: «ئەی دڵسۆزی قەیسی پۆس نە کۆڵ»، ئەوە ڕوو لە یاری ژێر گڵی ئەکا و پێی ئەڵێ: ئەی دڵسۆزی مەجنوونی کەوڵ لە کۆڵ ـکە منم ـ منم بۆت بووم بە مەجنوونی هەردەگەڕ، موبارەکت بۆ یانەی تەنیای چۆڵ!..

لە پارچەی دووەمیشدا دوور کەوتنەوە لە وڵاتەکەی بە جۆرێ کاری تێ کردووە، کە تەنانەت سەودای شوێنە تایبەتییەکانیشی هێنابێتەوە بیر و هەموو وتەیەکی لە دڵێکی هەڵکڕووزاوەوە بۆ هاتبێ، وە خوێنەریش ئەخاتە ناوچەیەکەوە کە دڵی لە دڵی ئەو کەمتر نەکەوێتە جۆشەوە!. چونکە کە بای سەبا ڕائەسپێرێ، پێی ئەڵێ: بە سەرگەردی نەک خۆت، بەڵکوو تۆزی ڕێگاکەتم! ئەمەش لەبەر ئەوە: کە چەپەرێکی شارەزایت

بە هەموو وڵاتی شارەزوور، شارەزاییەکەشت لەبەر زۆر هاتوچۆکردنتە.

پاش هەندێ هاتن بە باڵای ئەو بای سەبایەدا، ناوی شوێنەکانی پێ ئەڵێ و ڕایئەسپێرێ؛ ئەم بە باڵا هەڵوتنەشی هەموو هەر بۆ ئەوەیە: کە نامەی بۆ بەرێ بۆ وڵاتەکەی و دەنگێکیشی لەوێوە بۆ بێنێتەوە.

وەکوو سەیر ئەکەین، لەمانەوە بۆمان دەرکەوت: کە ئەدەبی نیازیی گەلێ لق و پۆپی لێ ئەبێتەوە، تەنها ئەوەی پێشوو نەبوو کە باس کرا...

## ئەدەبی چۆنیەتی!

ئەدەبی چۆنیەتی ئەوەیە: کە ڕاستەوڕاست بەبێ خۆ عەزیەتدان باسی شتێک بکا؛ وەیا کارەساتێک بگێڕێتەوە کە بە هیچ جۆر نە لە وشە وە نە لە گوزارەدا لە ڕاستی و چۆنیەتییەکە لا نەدا. وەکوو لەم پارچە پەخشانەدا کە ئەڵێ:

**«... دوای نزیکەی سێ چارەک گەڕاینەوە شوێنەکەی خۆمان، بە دەوری کانییەکەدا لباد و بەڕە ڕاخرابوون، هەندێکیان دۆشەک و سەرینی زلزلیشان لەسەر ڕاخرابوو، کە تێکڕا لە ماڵی هەموو پیاوماقووڵ و خواپێداوی دێیەکە هێنرابوون، بەڵام هیچیان لەبەر شڕی و چڵکنی نە ڕەنگ، نە گوڵیان بە دەرەوە نەبوو، ئەگەر نەختێ سەرنجت بدایە، کاروانی مۆریانەت ئەدی وەکوو شارەمێروولە ڕێچکەی بەستبووا...»**[1]

وەیا لە هۆنراوەدا، وەکوو لەم پارچە هۆنراوەی «شێخ سەلام»دا ئەڵێ:

---

١. لە نووسینێکی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد لە ژمارە «١»ی ساڵی «٧»ی گەلاوێژدا.

پیاوێکـی پیـری بـێ پێـڵاو و جـل
لای لـێ بڕیبـوو، سـەردڵ و سـپڵ
جامانـە شـڕ و سـەر بەبـێ کڵاو
دەرپـێ پینـاوی، لە خـام و لـە جاو!

وەکوو سەیری ئەم دوو پارچە پەخشان و هۆنراوەیە ئەکەین، هیچیان بـەلای ئـەوەدا نەچوون کە نیاز لە باری وشـە و گوزارەی دەسـتکردیدا ببزوێنن؛ بەڵکوو هەر ئەوەندەیان مەبەسـتە کە کارەساتەکە چۆنە، بەو جۆرە بیانخەنە بەرچاو و ئیتر بە هیچ بارێکا عەزیـەتیان نەکێشاوە.

بەڵـێ! لێـرەدا نیـاز ئەبـزوێ، بـەڵام بزواندنەکـەی بـۆ چۆنیەتـی کارەسـاتەکەیە؛ واتە: بەزەیی پیاهاتنەوەیەکـە، نەوەک بزواندنەوەکە بۆ گەشکەکردن و چەمکی گوزارە و وشەکە.

نووسـەر وەیا هۆنەرەکـە، دیمەنێکـی بەرچاو ئەکەوێ، ئـەم دیمەنە هەستەکەی ئەهەژێنێ بۆ ئەوەکە وێنەکە وەربگرێ، دوور نییە وەرگرتنی ئـەو وێنەیە لە باوەڕی ئەودا هەر بۆ ئەوەبێ کە ئاسـوودەییەک بە دڵی خـۆی بدا، چونکـە گێژاوی کارەسـاتێکە و لە دڵیا پەنگـی خواردۆتەوە؛ ئەیـەوێ دەروونی خۆی لەو ئازارە ڕزگار کا! کەچی هەر لەو وەختەشـا ئەو وشـانە کە ئەو کردوونیٚ بە «ئـەوزار» بۆ دەربڕینی ئەو ئازارە، ئەبن بـە وێنەی وێنەگرێکی زۆر خاوەن سەرڕوشـتە لە وێنەگرتندا، وەیا بە ئاوێنەیەکی باڵانما؛ مەردمیتر هەر ورد و دروشتێکی کارەساتەکە هەیە، لە وێنە وەیا ئاوێنەکەدا وەریئەگرن. کە ئەمە ڕووی دا، ئەو وەختە ئەو کارە کە نەفسـی کارەسـاتەکە کردوویەتە سەرنووسـەر وەیا هۆنەرەکە بۆ

دەربڕینی ئەو چۆنیەتییە، ئەوزارەکەی ئەویش ـکە تێکڕای وشەکانە ـ ئەبن بە پێشانگا ـ مەعرەزێک بۆ مەردمەکە و لەمەوە بەهێزی هەموویانەوە ئەکەونە سەر لابردنی ئەو ئازارە کە لە هەندێکا ڕووی داوە و نووسەر و هۆنەرەکە پیشانیان داوە؛ وەیان بە لایەنی کەمەوە ئەمانیتر ئەتوانن خۆیان لەوانە لابدەن. ئەگەر ئەم دوو شتە وەیان یەکێکیان نەبن، کەڵکێک لەم ئەدەبی چۆنیەتییەدا نابێ.

بەڵێ! هەرچەندە هەندێک ئەڵێن: ئەدیب ئەبێ هۆی پەیدابوونی ئازار باس بکا، وە بەڵکوو کۆشش بکا بۆ لابردنی ئەو هۆیانە، بەڵام ئەوە وەنەبێ هەر تایبەتی بێ بەوەوە؛ ئەو، کە شتەکەی دەربڕی، ئەگەر مەردمەکەیتر خۆیان لادا لەو ئازارانە کە ئەو باسیانی کردووە، ئەوە ئەو چەشنی فرمانی خۆی بەجێ هێنا و لە کاروان بەجێ نەما.

## ئەدەبی جەفەنگی!

ئەدەبی جەفەنگی[1]، زۆرتر لەو وەختانەدا دێتە ناوەوە کە تەنگوچەڵەمەی سیاسی ئەبێ بە کۆسپ لە ڕێدەربڕینی ئەدەبی چۆنیەتی و مرازدا؛ وەکوو چۆن گەلێ جاری واش ئەبێ: کە نووسەر وەیا هۆنەر، لەبەر هەندێ شتی تایبەتی، پێی ناکرێ ڕاستەوڕاست بچێتە ناو جەرگی باسەکەوە، دێنێ بە جۆرێکی جەفەنگی ئەو مەبەستەی خۆی لە ژێر پەردەی شتێکیترا دەرئەبڕێ و بەو ناوەوە دێتە ناوەوە.

بەڵێ! ناتوانێ ڕاستەوڕاست بێتە ناوەوە، بەڵام نابێ خاڵیش بێ بە لایەنی کەمەوە لە سووچێکی قسەلێکراوەکە، چونکە ئەگەر بە هیچ جۆر

---

١. [جەفەنگ: گاڵتە، شۆخی، قسەی خۆش].

بۆنی ئەوی لێ نەیە، وا ئەگەیەنێ کە وتنەکەی شتێکی بۆشی بێناوکە. ئەمەش زیاتر بە هۆی شوێن وەیا جێگا وەیا زانینی مێژووی گۆڕانی ئەو شوێن و جێگایەوە ئەبێ... وەیا خود ئەبێ شتێک لە سەرچاوەکەوە بزانرێ؛ جا ئەم زانینە بەهۆی زانینی ڕاستەوڕاستی کارەساتەکەوە بێ، وەیا بەهۆی سەروبنی پارچەکەوە بێت. ئەمەش بۆیە پێویستە، چونکە ئەگەر نەزانرێ، گەلێ جاری وا ئەبێ ئەدەبەکە یا بە هیچ دێتە بەرچاو، وەیا وا لە مرۆڤ ئەگەیەنێ: کە ئەمە ئەدەبێکی چۆنیەتی ڕووتە، کەچی لەگەڵ ئەوەشا وا نییە.

❀❀

ئەمە لەم سەردەمەی دواییەدا بەم جۆرە باسی ناساندنی ئەدەبی جەفەنگی ئەکرێ. بەڵام لە ڕاستیدا ئەدەبی جەفەنگی ـکە لە مەزهەبی ڕەمزیی لە ئەدەبدا بووەتەوەـ لە باری زانیارییەوە بە دوو جۆری زانیاریتر باس ئەکرێ:

یەکەم، لەسەر بیروباوەڕی زانایانی ئەدەب، هەچ وشەیەک کە هەیە هەموو بەرانبەر بە گوزارەکانیان جەفەنگین؛ چونکە وشە بەلای ئەوانەوە لەبەر ئەوە کە هەریەکە بە هەزاران گوزارەی هەیە، ناتوانێ گوزارشت لەو گوزارەیە بداتەوە، وە بەڵکوو هەر تاقە وشەیەک کە تۆ بیڵێیت، بە هەزاران گوزارەی هەیە، لەگەڵ ئەوەشا: وشە، هەر یەک وشەیە!.

دووەم، بەلای دەروێشەکانەوە ـ«مُتَصَوِّفـە»کانـ دیسان وشە هەمووی هەر جەفەنگییە، چونکە دەروێشەکە بەو وشانە باسی خوا،

سیفەتەکانی خوا و کاروباری ڕۆحیی ئەکا، وشەکان بە هیچ جۆر ناتوانن لە دایەخی[١] ئەو هەموو شتانە دەربێن کە لە دڵی ئەوا پەنگیان خواردۆتەوە. بەتایبەتی شتێک کە باسی خوا و باسی کۆڕی سەرخۆشانی چاوپێکەوتووانی نووری خوا بکا، چۆن ئەتوانێ ئەو شتە گوزارشت بداتەوە لەو مەیدانە فراوانە کە مەیدانی باسی خوایە؟!.

کەوابوو، ئەدەبی جەفەنگی کە بەر مەزهەبی ڕەمزیی ئەکەوێ لە ئەدەبدا، ئەگەر ئێمە بچینە بن و بناوانیەوە، ئەمەیە کە باس کرا؛ بەڵام ئەوی پێشوو، ئەوە کورتکراوەیەکی زۆر کورتە بەچاو چەمکی زانیارییە بناغەییەکەوە. بەڵکوو تەنها سووچێکی زۆر تەنگە لە چەمکە زانیارییەکەیەوە [کە] لەم سەردەمەی دواییەدا کەوتۆتە ناوەوە.

ئەمە و دیسان کە ئێمە ناوی ئەدەبی جەفەنگی ئەهێنین و گوزارەی ئەدەبی جەفەنگیشمان بەم جۆرە لێ دایەوە، نابێ ئەوەشمان لێ تیک بچێ: ئەم ئەدەبی جەفەنگییەش کە مەبەست بەو ئەدەبێکی ڕەمزییە، ئەم ئەدەبە ڕەمزییەش لە ڕاستیدا خۆی ناساندێکیتری تێکڕایی هەیە کە جیایە لەم ناساندنە تایبەتییە.

ئەدەبی ڕەمزیی کە ئێمە بە جەفەنگیی ناومان برد، ئەو خۆی «کێش ـ مەزهەبێکی» سەربەخۆی لەناو ئایینەکانی ئەدەبدا هەیە؛ بەلای ئەوانەوە: وشە ناتوانێ لە دایەخی گوزارە دەربێت، جا ئەو وشەیە هەر جۆرە وشەیەک بێت؛ واتە ئاشکرا بێ یا ئاشکرا نەبێ، تێکڕای وشە بەرانبەر بە تێکڕای گوزارە، هەمووی هەر ڕەمز و هێمایە؛ بەتایبەتی ئایینی سۆفێتی و خواناسی هەر لەسەر ئەم شێوەیە ئەڕوا.

١. [دایەخ: بەهرە، قازانج].

بـەلای ئەوانـەوە: هەر شـتێک بەرەی «تَصَوُّف» باسـی کـردووە، ئەوە هێمایە؛ چونکە بەلای ئەوانەوە وشـەکانیان لە ڕواڵەتا شتێک ئەدەن بە دەستەوە، بەڵام لە ڕاستیدا شتێکی‌تریان مەبەستە!.

جـا ئەم جەفەنگییـە کە ئێمە لێـرەدا مەبەسـتمانە، ئایینێکی‌ترە لە ئایینی تێکرای کێشـی ڕەمزیی، ئەو ڕەمزییە بە گوزارە گشـتییەکە نییە کـە ماوەکـەی فراوانتر و بڵاوترە، تەنانەت بەسـەر ئایینی سۆفێتیشـدا. جا نموونەی ئەم جەفەنگییە کە مەبەسـتەکەی ئێمەیە لەم شـوێنەدا، وەکوو لەم پارچە پەخشانەدا باس ئەکا و ئەڵێ:

**«... لە ناکاو حاجی ناردی بەشوێن ڕۆستەم و ئەوانا، پێی وتن: چاوتان لێیە چۆن خێڵەکە هەموو لەسەر بارکردنە؟! دیارە ئێوەش هەر لەگەڵ ئەوان ئەبن؛ بەڵام ئێستا من ئەمەوێ هەر تەنها ئێوە بنێرم بۆ کوێستان، "من ئەتان‌نێرم، من!" ئێوەش ئەبێ پووشانەی سالی پار و هەر سەرە مەڕێکیش نیو هۆقە ڕۆنم بۆ بینن، ئەوەم بۆ حەجی ئیسماڵ ئەوێ، منالەکان زەماوەنیان کرد، پارەیان بەدەستەوە نەهێشتم!. چەلەمەشکێنییەکەش بکەینەوە!. کە ئێوەم نارد و گەیشتنە ئەوێ، ئیتر ڕێ لەوان ئەگیرێ، هەمووی بۆ خۆتان ئەبێ. ئەمە بیری منالی بوو، ئیشەکەی ئیمسالیشمان دیارە وای لێ هاتووە!...»**[1]

ئـەم پارچەیـە لـە کارەسـاتێکی سیاسـی دواوە کە لەو سـەردەمەدا خاوەن‌فەرمانێـک ویسـتوویە فرمانێک بکا بە ئـارەزووی خۆی و ئەو فرمانـەش پێچەوانـەی باوەڕی گەل بـووە، گەلەکـەش نەیتوانیوە لەبەر

١. لە وتارێکی دانەر لە ژمارە «٣» ساڵی «٨»ی گەلاوێژدا.

جەوری ئەو فەرماندارە هیچ دەنگێک بکا.

خاوەنی ئەو پارچەیە هێناویە بە جۆرێکی جەفەنگی ناوکی فرمانەکەی خستۆتە پێستێکی‌ترەوە و حاجی کردووە بە خاوەن فەرمانەکە؛ ئەو کەسانە کە ئەو ویستوویە بیاننێری بۆ کوێستان، کردوونی بەو کەسانە کە خاوەن‌فەرمان پەیمانی ئیشەکەی پێ داون. چۆن؟ پێی وتوون: کە من ئەتانکەم و ئەتاننێرم، نابێ لە پاشا لە قسەی من دەرچن، هەر شتێک من وتم ئەبێ وا بڕوا، ئەگەر وا نەڕوا خۆتان زیان ئەکەن؛ چونکە سەیر ئەکەن گەلێ کەسی‌تر هەیە کە من بیاننێرم، بەڵام بۆیە ئێوە ئەنێرم، کە هیچ ملپێچییەک لە فەرمانەکەی مندا نەکەن. مەبەست بە چەڵەمەشکێنییەکەش[1] پەیمانێک بووە لەبەینی ئەو خاوەن‌فەرمانە و بێگانەیەکدا کە دەستی بەسەر ئەو وڵاتەدا کێشابووا!.

کە ئەڵێ: «ئەمە بیری منالّی بوو، ئیشەکەی ئیمساڵیشمان دیارە وای لێ هاتووە»، چۆنیەتی دروستبوونی کاروباری هەڵبژاردنێکی نیابی ئەو ڕۆژە لە پێستی چوونە کوێستانێکی سەردەمی مندالّی خۆیدا ئەگێڕێتەوە. بەڵام لەبەر جەوری فەرمانی ئەو ڕۆژە، ناتوانێ ڕاستەوڕاست پێی لێ بنێ. هەر ئەوەندە ئەڵێ: ئیشەکەی ئیمساڵیشمان دیارە وای لێ هاتووە؛ ئیشەکەش پێکهێنانی دەستەی نوێنەرانی ئەو سەردەمەیە لەگەڵ خاوەن حوکمەکەدا کە نووری سەعید بووە!...

ئەمە نموونەیەک بوو لە ئەدەبی جەفەنگیی پەخشان، ئەمجا بۆ

---

١. [چەڵەمەشکێنە: جۆرە گرەوێکە بە چۆڵەمەی مریشک دەکرێ، ئەشێ لە کاتی وەگرتنی شتێک بەرانبەرەکە بڵێ: لەبیرمە، ئەنا ئەویان دەیباتەوە، چۆڵەمەشکانێ].

ئەدەبی هۆنراوەی جەفەنگیش ئەم هەڵبەستانەی پیرەمێرد بۆمان ئەبن
بە نموونەیەکی ئاشکرا کە ئەڵێن:

**کـە قەلەڕەشـمان ڕێ پیشـاندەر بـێ**
**ئەبـێ گەورەمـان هەر دەربـەدەر بێ!**
**ئەمـە دوو جـارە ئەکەوینـە چـاڵ**
**زەرەر دەبینیـن بـە مـاڵ و بـە حاڵ!**
**زۆر پیـاو وەک درەخت موتوربە ئەکرێ**
**هەرمێیـە و جارجـار تـرۆزی ئەگرێ!**
**ڕاسـت ئەکـەن ئێـرە ڕەشـەبای زۆرە**
**لەگـەڵ فیشـاڵدا کەوتۆتـە نـۆرە!**

دوو هۆنـراوەی یەکـەم، لە کارەسـاتێکی سیاسـی سـەردەمی شـێخ مەحمـوود دواوە لە سـولەیمانی، کە بەهۆی یەکێکی‌تـرەوە[١] کاروباری ئەو سـەردەمە چۆن تێک‌چووە؟!. وە ئەو یەکەش دیارە یەکێکی بێگانە بـووە و هۆنـەر کردوویە بە قەلـەڕەش؛ واتە: قەلـەڕەش ڕێ ناکەوێ بۆ چاکە بقرێنێ.

کورد ئەڵێ: قڕانی قەلەڕەش بۆ نەگبەتییە و بۆ ئامەد[٢] نییە!!.

جـا ئەڵـێ: ئـەو قەلەڕەشـە ـکـە بێگانەکەیـەـ خـۆی کـردووە بـە ڕێ‌پێشـاندەری ئێمـە، لەباتی ئەوە کە چاکەمان دەسـت کەوێ، ئەبێ

---

١. مەبەست بەو یەکە ئینگلیز بووە.

٢. [ئامەد: بەخت، هات، ئامەو، شانس].

گەورەکەمان دەربەدەر و لانەشێواو بێ، کـە ئەومان وا بوو، دیارە ئێمە خراپتر ئەبین!.

وەیا لە دوو هۆنراوەی دووهەمدا باری بێباریی یەکێک ئەگێڕێتەوە کـە هەرجـارە لەگـەڵ کەسـێکایە و لـە کام لاوە بای بێ لەوێوە شـەن ئـەکا!. ئەڵـێ: هەرجـارە لەگـەڵ یەکێکایـە، کەچی لـەپاش ماوەیەک پشـت لەویش هەڵئەکا، سـەرەڕای ئەو بێباریـەشی، فیشاڵ و هاشە و هووشەیەکی وایشی هەیە گرەوی لە ڕەشەبای سولەیمانی بردۆتەوە!.[1]

١. لێرەدا ئـەو کەسـەی کـە پیرەمێرد مەبەسـتی بـووە «ت. ئا. ف» بووە، سەردەمەکەشـی وەختێـک بـووە کـە «مەجیـد یەعقووبی» لە سـولەیمانی موتەسـەڕڕف بووە. ئـەم کابرایە وەکوو چۆن خۆی لە مەجید یەعقووبی نزیک خستۆتەوە، بەو جۆرە لە موتەسەڕڕفەکانی پێش ئەو و پاش ئەویش هەر خۆی نزیک خسـتۆتەوە، بە فیشـاڵ هاتووە بە سـەر و باڵای خۆیدا و بەو هاشە و هووشانەی، خۆی بەرز کردۆتەوە!.

# ئەدەبی کۆن و ئەدەبی نوێ!

ئـەدەب، وەکوو لـەو ڕووەوە کە باس کرا، بەش کرا بەو بەشـانە؛ لە بارێکی‌ترا بەش ئەبێتەوە بە دوو بەشـی‌ترەوە: یەکێ ئەدەبی پەیڕەویی کە بە ئەدەبی «کلاسـیک» وەیا «تەقلیـدی» ناو ئەبرێ. یەکێ ئەدەبی داهاتـوو وەیا «نوێ» کە بـە ئەدەبی «ڕومانتیـک» وەیا «ئیبداعی» ناو ئەبرێ. واتە: چۆن لەپێشـا ئەدەب بوو بـە ئەدەبی نیازیی، چۆنیەتی و جەفەنگی؛ لێرەدا لە لایەکی‌ترەوە ئەبێ بە ئەدەبی پەیڕەوی و داهاتوو.

ئەدەبی پەیڕەوی ئەوەیە: کە نووسـەر وەیا هۆنەر، ملی ڕێچکەیەک ئەگـرێ کـە گەلێ کەس لەپێش ئـەوەوە بەو ڕێچکەیەدا ڕوەیشـتوون؛ تەنانەت وای لێ دێ ناتوانێ بە بسـت لەو ڕێگایە لابدا!. کە ویسـتی باسـی گوزارەیـەک بـکا، تۆزێ وشـەکان سـەرەوبن ئـەکا، وەیا لەباتی وشـەیەک وشـەیەکی‌تر وەکوو ئەو وشـەیە ئەکا بە بەرگی گوزارەکەدا و دەری‌ئەبـڕێ. بەڵکـوو لای وا ئەبێ: ئەگەر بێت و لـەو ڕێگەیە لا بدا، نووسین وەیا هۆنراوەکەی شوێنی خۆی نەگرتووە و ئەکەوێتە بەر پلاری پلارهاوێژان و تووشی شوورەییەکی زۆر زل ئەبێ!!..

وەکـوو ئـەوە: کـە لە سـەردەمی پێشـوودا یەکێ بیویسـتایە باسـی خۆشەویسـتێکی خـۆی بـکا، ئەگەر چاوی بـە پیاڵە و زوڵفـی بە مار و دووپشـک و بـرۆی بە شـیر و برژانگـی بە تیـر نەکردایە، بـە تەواوی ئابڕووی نووسـینەکەی ئەچوو، وە لە بازاڕی سـەوداگەرانا نە خۆی وە نە نووسینەکەی نرخێکیان بۆ دانەئەنرا!!..

ئەمـە و بێجگـە لەمـەش، پابەنـد بـوون بـە کـۆت و زنجیـری

«سەروا ـ قافیە» لە هۆنراودا و ڕێکخستنی پارچەی ڕێکخراوی «سەروادار ـ سَجع» لە پەخشاندا، ئەم پابەندبوونەیان ئەوەندەی‌تر کاری کردبووە سەر وەستانی ئەدەب؛ وە بەڵکوو کارێکی وای کردبووە سەر ئەدیب وەیا هۆنەرەکە: کە ئەگەر پەخشان وەیا هۆنراوەکەی لەسەر ڕێ‌وشوێنی پێشینەکانی خۆی نەبوایە، نە پەخشانەکەی وە نە هۆنراوەکەی نەئەچوونە ناو گەلەوە بۆ سەیر کردن، وەیا لە کاتی خوێندنەوەیانا سەریان بۆ نەئەلەقێنرا!!..

ئەوەندە هەیە، ئەم ئەدەبی پەیڕەوییە زۆرتر لەناو کورددا لە نمایشە هۆنراوییەکانیا بەرچاو ئەکەون تا پەخشانەکان؛ ئەم کەمتر بەرچاوکەوتنەی پەخشانەش بۆ باری پەیڕەویکردن، وەنەبێ لەبەر ئەوە بووبێ کە پەخشان ئەو ڕێگایە نەگرتبوو؛ گرتبووی، بەڵام وەکوو لەمەودوا بۆمان دەرئەکەوێ، ئەدەبی هۆنراوە لە سەردەمەکانی دواییدا زۆرتر باوی هەبوو لەناو کورددا تا ئەدەبی پەخشان؛ ئەدەبی پەخشان زیاتر داستانەکان بوون، هەر ئەوندە تیایا مەبەست بوو کە وشەی زل‌زل بۆ گوزارە بەکار بهێنرێ؛ جا ئەو گوزارەیە پڕ بە پڕی وشەکە ئەبوو، وەیا لێوەی سەری ئەکرد؛ واتە: وشەکە گەلێ زیاتر بوو لە گوزارە، کە ئەمە مەبەست نەبوو!. وەلێ لە هۆنراودا وێنە زۆرە بۆ ئەو شتەی لێوەی ئەدوێین. وەکوو ئەم چەند هۆنراوەیەی خوارەوە کە هەریەکە هی هۆنەرێکن، وە بەرودوا شوێنپێی یەکیان هەڵگرتووە!.

«ناڵی» ئەڵێ:

**ئەی شۆخی بێ‌نیاز و گران‌ناز و غەمزەسووک**
**تیری موژەت نیشانەی دڵ کون دەکا بە نووک!**

هۆنەرێکی هاودەور. «عەلی کەمال باپیر» ئەڵێ:

**دڵــی زارم لــە حەلقــە و پێــچ و تابی زولفــی زنجیرت**
**خەلاســی بوو، کەچی ئاخــر بە قوللاپی مــوژەت گیرا!**

«فانی» هۆنەرێکی هاودەورتر کە گەلێ دوای ئەوان کەوتووە، ئەڵێ:

**خەدەنگــی تیری برژانگت لە جەرگی من مەدە چی دی**
**لــە مەیدانی غەرەزبــازی لە ســینەی ناحــەزی ڕاکە!**

«مستەفا» قەرەداغی کە گەلێ هاودەورترە، ئەڵێ:

**لە تاوی تیری موژەت خۆم خستە ژێر زونناری ئەگریجەت**
**بە دوو شمشــیری ئەبرۆت لەتلەتت کردم بە یەکجاری!**

ســەیر ئەکەیــن، لێرەدا ئــەو ڕێگەیە کــە هۆنەرێکی هــەرە کۆن لە چــاو ئەوانــی دواییدا گرتوویەتی، هــەر ئەو ڕێگەیەیە کــە هۆنەرێکی ســەردەمی تازەش گرتوویەتــی؛ زنجیــری زوڵف، برژانگــی تیر و برۆی شمشــێرین لە هەموویانا هەیە و هەبوون!. وەکوو عەبدی حەبەشــی بۆ خــاڵ و زوڵفی وەک مار و دووپشــک لە گەلێ شــوێنیترا لە هۆنراوی هۆنەرە پەیڕەویکەرەکانا بەرچاو ئەکەوێ!!..

ئەمە لە باری هۆنراودا، لەلایەن پەخشانیشەوە وەکوو وترا، پەخشان بێجگــە لە چیرۆکەکانی گوێئاگردان، ئەوانەی کە لە هەرەتێکی کۆنەوە نووســرابنەوە و مابنەوە، بەرچاو ناکــەوێ. ئەم بەرچاونەکەوتنەش لەبەر ئەوە بوو: کورد بە درێژایی گەلێ ساڵان، هەر لەگەڵ بێجگە لە خۆیــدا ژیاوە، وەیا بە واتەیەکیتر: باری خوێندەواری بە زمانێکیتر بووە، ئەگەر ویــستبێتی پەخشــانێک بێنێتە ئەنجام، یا بەو زمانە بیگانەیە بووە، وەیا

ئەگـەر زۆر بەلای زمانەکەی خۆیا ڕەویشـتبێ ـ وەکـوو هەندێ جار لە وتاری سـەردار لەشـکرەکانا ئەمە هەبووە ـ ئەو شـتەی کە نووسیویەتی وەیا وتوویەتـی، بە دەگمەن کوردی تێخسـتووە، لای وابـووە ئەگەر وا نەبێ، کەس گوێی بۆ ڕاناگرێ و ناچێ بەلای خوێندنەوەیا!..

بە وێنە، لە نموونە پەخشانێکی زیاتر لە «٤٠» ساڵ لەمەوپێشتر لە یەکێ لە ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەو سەردەمە (ژیانەوە)[1] نووسینێک لە لایەن «مانگگیران»ـەوە پیشان ئەدا، کە ئەمە پارچەیەکە لەو نووسینە بە هەموو جۆرە شێوەیەکیەوە:

**«... حال حاضر لە همو پایتخی اروپادا خارقەنما هیئت فنیە ظهوری کرد. امرو نمونۀ ام صنایع و ترقیاتە لە برچاومانە. آیا قوۀ بخار، قوۀ مقناطیسی، اختراع و نفوذ و تاثیری الکتریق چە بە تل چە بی تل و سینەما و فتوغراف و طیارە کە لە جوی هوا و لە بروژوری ایمە ام جسمە قورسە سیر و حرکت هر بە بنزین نیە بلکە بقدر او قورسایی او طیارەیە قوتێکیتری هیە کە مبارزە لگل هوا اکات و مدافعۀ او قورساییە اکات. ام نوعە ایشانە هموی لە کتاب حکمت و موازنۀ مایعات و اجسام صلبیە بە صراحت بیانی کردوە...»**

وەیا لـە یەکێکیتر لە ڕۆژنامە کوردییەکانی ئەو سـەردەمەدا (ڕۆژی کوردسـتان)[2] لـە ژێر ناوی «مجادلۀ حیات»ـدا نووسـینێک ئەخاتە بەرچاو، کە ئەمە پارچەیەکە لەو نووسینە بە هەموو جۆرە شێوەیەکیەوە:

**«سلسلۀ عقوبات اگر لە دنیادا تدقیق و تتبع بکری ابینری کە همو**

---

١. ژمارە (٢) ساڵی ١٩٢٤ بە قەڵەمی عونی زابت موتەقاعد.

٢. مێژووی «١٥» تشرینی دووەم ١٩٢٢. سەر وتارەکەی.

**حیوانات و نباتات تابع قانونیکی لا یتغیرن و بو قانونه تکامل وه یا رو اکاته انقراض.**

**اجناس و انواعی حیوانیه و نباتیه هر بم قانونه فطریه اژی وه هر ام قانونه سوق تکامل اکا و هر به الجاآتی ام قانونه ضروریه له صحنهٔ کائنات دراهاویژری.**

**او نوع و جنسانهٔ که لگل ایجابات ام قانونەدا توافق نکا به زلەیکی بی امانی طبیعی گیژ ابی و اکویته بیرکی اضمحلالەوه. کوابی ژیان لم مجالیەدا احراز ظفریت و غالبیتە!...»**

ڕاستە ئەمانە ئەدەبێکی زۆر کۆن نین، بەڵام نموونەیەکن بۆ هەموو چەرخێکی پێشوو دەست ئەدەن؛ وە بەڵکوو ئەتوانرێ هەر ئەم نووسینانە بکرێن بە وێنە بۆ نووسینەکانی گەلێ سەردەمی زۆر کۆنی پێش مێژووی ئەمانەش، چ لەلایەن وشەوە چ لە لایەن گوزارشتەوە، چ لە لایەن شێوەی خەتی نووسینەوە.

بە پێچەوانەی ئەمانە، لەگەڵ گۆڕانا، ئەدەب گۆڕا و لە باری پەیڕەوییەوە کەوتە باری داهاتوو، بەڵکوو لاپەڕەی پێشووی لا دایەوە و ئالایەکی تری هەڵکرد. ئەم گۆڕینەوەی ئەدەبی پەیڕەوییەش بە ئەدەبی داهاتوو، وا دیار بوو لەبەر بڵاوبوونەوەی ئاسۆی بیر و هۆش بوو بە وڵاتێکا، کە لە سەردەمەکانی پێشوودا ئەو بیرە دەستی نەئەگەیشتێ؛ واتە لەبەر ئەوە بوو کە ئەو بیرەی جاری جاران هەر لەناو چوارچێوەی وڵاتێکی تەنگا ئەسووڕایەوە؛ بەری بۆ بەرەڵا بوو، هات خۆی هەڵسوو لە بیروباوەڕی وڵاتێک کە لەودیوی سنووری وڵاتەکەی خۆیەوە بوو؛ واتە: هاتوچۆکردنی دانیشتووی وڵاتانی دوور لە یەک، لەگەڵ یەکا و ئاگاداری

پەیداکردنی هەرکەسە بەسەر بیروباوەڕی یەکا، کردیە کارێ کە ئەدەبی پەیڕەویی ـکلاسیکـ ئەو بەرگە لەبەر خۆی داڕنێ و بەرگێکی‌تر بکا بە بەرا، کە بەرگی ئەدەبی داهاتووە ـئەدەبی ڕومانتیکـ.

دوور نییــە بووترێ: ئەگەر هۆی گۆڕانی ئەدەبی پەیڕەوی بە ئەدەبی داهاتــوو، نزیکبوونــەوەی بیــروباوەڕی شــوێنانی دوور بــێ لــە یەک و کارکردنی باوەڕێک بێت بەســەر وڵاتێکی‌ترا لــەبارەی گۆڕینەکەیەوە و ئەمجا ئەدەبی داهاتوو کەوتە ناوەوە؛ ئەمە هەر ئەوی پێشووی گرتەوە؛ واتــە: گۆڕانەکەی لەبەر ئەوە بووە: کــە چاوی بە ئەدەبی وڵاتێکی دوور کەوتووە و ئەمیش هێناویە لەسەر ڕێ‌وشوێنی ئەو ڕەویشتووە!. کەوابوو، ئەمە نەبــوو بە ئەدەبێکی داهاتوو، بەڵکوو هــەر ئەدەبە پەیڕەوییەکەی پێشــووی گرتەوە، تەنها ئەوەیە ناوەکەی گۆڕاوە و هیچی‌تر!!.. بەڵێ! ئەم قســەیە ئەوترێ و ئەم پرســیارە ئەکرێ، ئەوەندە هەیە لە ڕاستیشدا هەر وایە؟ یا ڕوویەکی‌تری هەیە؟.

ڕەنگبــێ وەکوو ئەو پرســیارە نەبــێ کە ئەکرێ، چونکــە وەکوو باس کــرا، شــت «هاوگری ـ نسبی»ــیە، ئەگەر ســەیری ئەم لایەنــە بکرێ، بەڵێ ئەمیش بوو بە پەیڕەوی!. بەڵام ئێمە بەم چاوەوە ســەیری ناکەین، بەڵکــوو بەو چاوەوە ســەیری ئەکەین: کە ئەمە ئەدەبــی وڵاتێکە، هەتا دوێنێ بوو لە پەیڕەویکردن بەولاوە هیچ شــتێکی تازەی پیشان نەئەدا، هەر ڕێگایەک کە ئەیگرت بە شوێنپێی یەکێکی‌ترا ئەڕۆیشت!. کەچی کوتوپڕ لای دا لەو ڕێگەیە و خۆی سەربەخۆ شاڕێگەیەکی تایبەتی بۆ خۆی دۆزییەوە و لە سەری ڕۆیشت. بەتایبەتی هۆی ئەم لادانەش بەم جــۆرە، ئەوە بوو: کە کاروباری ئابووری و هاتنی پێشــهاتی ڕۆژانی نوێ و

گۆڕینــی لاپەڕەی گێتی لەناکاو و بە گورجــی لە بارێکەوە بۆ بارێکی‌تر زیادە پێویـسـتیی ئادەمیزاد پەیدا بوو بـۆ بەربەرەکانێی ژیان. ئەمەش ئەوەندەی‌تـر دەسـتی تێوە ژەند. ئەو لادانەشــی وەنەبێ لادانێک بێت هــەر تەنهــا لە گوزارشــت و درکانندا، بەڵکــوو لە ســەروا و ڕێکخراوی سەرواداریشــا هــەر لای دا؛ واتــە: ئــەو پابەندییەی کە جـاران هەیبوو بــە ســەرواوە، ئەو پابەندییەی لــە ئەدەبی داهاتوودا نەمــا و خۆی لەو دیلیەتییە تا ئەندازەیەک ڕزگار کرد.

بێجگــە لەمەش، لە ســەردەمی پێشــوودا لەوانە بوو ســنوورێکی بۆ گــوزارە دانابــوو، لە کاتی ئەدەبی داهاتوودا ئەو ســنوورە هەڵگیرا؛ گەلێ گوزارەی جوانــی وا هاتە ناوەوە، کە لە ڕۆژەکانی ئەدەبی پەیڕەویدا ئەو گوزارانە دیار نەبوون. ئەمە و دیسان ئەگەر بێت و ئێمە لە کاتێکا شتێکی تازەبابەتمــان لە هەر هونەرێکەوە بەرچاو کەوت، ئەتوانین بڵێین: ئەمە داهاتــوو نییــە!. بەڵکوو ئەمــەش شــوێنپێی یەکێکی‌تــری پێش خۆی هەڵگرتووە. ئەوەندە هەیە ئەم تۆزێ ڕێکوپێکتری کردووە!..

ئەگەر بەم جۆرە سەیری شت بکەین، هیچ داهاتوویێک لە گێتیدا نییە و نەبووە، لەگەڵ ئەوەشــا وا نییە؛ هەر شــتێک لە عاســتی خۆی کە داهات ـبــە مەرجێک کە لە یەک کوورەخانەدا نەبووبێ ـ ئەبێ بە داهاتوویێکی نوێ و ناتوانرێ پێی بوترێ: ئەمە پەیڕەوییە.

❀❀

لەلایەن ئەدەبی پەیڕەوییەوە، ئەو وێنەیەمان گرت بەدەستەوە: کە ئەگەر یەکێ بیەوێ باســی خۆشویستنی دۆســتێکی خۆی بکا و بیەوێ

یەکێ لە ئەندامەکانی بە مەردمی‌تر بناسێنێ، وە لەو ئەندامانەش ئەیەویست باسی چاو بکا، تێگەیشتین کە چۆن هەموویان لە هۆنراوەدا شوێنپێی یەک هەڵئەگرن بۆ باسکردنی ئەو ئەندامە؟!. هەر بەو چەشنە ئەمانەوێ وێنەیەکیش لە ئەدەبی داهاتوودا بە هەردوو جۆرەکەیەوە ـ هۆنراوە و پەخشان ـ بێنینەوە، بۆ ئەوە کە بزانین ئەم چۆنی باس ئەکا؟.

لە هۆنراوەدا ئەو ئەندامە کە ئەدەبە پەیڕەوییەکە باسی کرد، یەکێکی وەکوو «گۆران» کە باسی ئەکا ئەڵێ:

**کام ڕەشیی ئەگا بە ڕەشیی چاوی**
**برژانگی، بروی، ئەگریچەی خاوی!**

وەیا ئەڵێ:

**بینە سەر چاو: چاوێک، بڵێم چ چاوێک؟**
**کانی سحر، دەریای عیشوە، گێژداوێک!**

وەیا «کامەران» ئەڵێ:

**نەغمەی شیرین، ئاوازی خۆش لە دەنگا**
**ورشەی سرنج، لەناو چاوێکی مەنگا!**

دیسان ئەڵێ:

**چاوی کاڵ، ئەگەرچی نەرمە**
**بەڵام نیگای ئێجگار گەرمە!**

وەیا «م . ش» ئەڵێ:

**جوانتر لە ژین جووتێ چاوە**

**هەرووەک گۆمی مەنگ وەستاوە**

**گۆمێکــی قووڵــی تــا هەتــا**

**پێی هەستابێ گشت هێزی خوا**

**بێشــەیەکی ســەوزی پــڕ دار**

**تێی ئاڵابــێ بە چەشــنی مار!**

**وەک پیــرۆزە، ســەوزێکی کاڵ**

**بەســەر ڕوونیی ئاســمانا زاڵ!**

لە ئەدەبی پەخشانیشدا ئەم پارچەیە کە ئەڵێ:

**«... ئێستا.. کە نهێنی دڵم بۆ خستیتە ڕوو، وە چی لە دڵما بوو بۆم هەڵڕشتی، ئایا ئەتوانم داوات لێ بکەم کە ئەم خۆشەویستییە گەورە پڕ لە خۆ بەختکردنەم بە چاوێکی بەرزەوە تەماشا بکەی، کە لە ڕێگای کامەرانیتا بە گیان و دڵەوە خۆی ئەبەخشێ؟! ...»**[1]

تەماشــا ئەکەین دوو ئەدەبە لە دوو سەردەما؛ ئەدەبێکی پەیڕەویی، ئەدەبێکــی داهاتــوو. پەیڕەوییەکــە لــە هۆنراوا چۆن باســی چــاو و برۆ ئــەکا و چۆن ئەیانکا بە شــتێک کە لەگەڵ چەشــەی دوای ئەو ڕۆژەدا زۆر دوورن!. هــی داهاتووەکــە هــەر لــە هۆنــراوا چۆن باوەش ئــەکا بە ئەندێشــەیەکی وادا کە ئەدەبی هۆنراوەی پەیڕەویی بە درێژایی ژیانی جارێــک نەبووە دەستی بۆ بەرێ!..

بەڵێ! هەردوو ئەدەبەکە ئەیانەوێ باوەش بکەن بە لە دەم بەرەوژووردا لە ئەندامی ئادەمدا؛ ئەیانەوێ باســی چاو و برۆ و برژانگ و ئەگریجە

١. لە نووسینێکی «م.ش» لە گەلاوێژی ساڵی «٩»دا.

و زوڵف بکەن. ئەدەبی پەیڕەوییەکە بە جۆرێک ئەیەوێ بیانخاتە ڕوو کە گۆیا وێنەی ئەو شتەی کە ئەو، ئەو ئەندامانە ئەکا بە وەکوو ئەو، زۆر دیارن، وە بەڵکوو وای پیشـان ئەدا کە کـەس نامێنێتەوە ئەو ئەندامانە نەناسـێت!. لە باوەڕی ئەوا لەو ڕۆژەدا گەورەتر هونەرێکی خستۆتە کار کە باسـی تیر و شـیر و زنجیر ئەکات! ئیتر چاوی لەوەوە نەبووە کە ئەم جۆرە شـتانە ترسێنەرن، ئەندامی جوانی دۆستی خۆشەویست بە شتی ترسێنەر ناساندن، چەشە وەیا دڵی گوێگر بە جۆرێکی بێئاگایی زیاتر ڕەوی لێ ئەکا!. چاوی لەمەوە نەبووە، بەڵکوو هەر چاوی لەوەوە بووە کە لە ڕێگە لانەدا، نەوەک بەر توانج بکەوێ!..

لە کاتێکا کە دێینە سەر ئەدەبە داهاتووەکە و سەیری «خاسەوێژی ـ وَصْف»ـەکەی ئەم ئەکەین، هەر بۆ ئەو شتانە کە ئەدەبە پەیڕەوییەکە باسـی کردووە. ئەوەندە هەیە ئەم نایەوێ بە شـتی ترسێنەر باسیان بکا، بەڵکوو بە جۆرێـک دێتە ناوەوە کە چەشە زیاتر بۆی بشنێتەوە.

ئەو چاوە وەیا ئەو برۆیە وەیا ئەو برژانگە لەباتی ئەوە بە تیر و شـیر و زنجیر بیانناسـێنێ، بەوە ئەیانناسـێنێ: کە هیچ جۆرە ڕەشییەک نییە بـگا بـەوان.. وەیا ئەو چاوە کە پڕیەتی لە ناز و لە هێزی ڕاکێشـان.. وەیا ئـەو چـاوە کە کاڵییەکەی وەکوو ئاوی سـافی ڕوونی مەنگ ئەوەستێ و بـە ورشەورشـی وەکوو تریفـەی مانگ لێداو، سـەرنج و ئاوی چاو و هێزی دڵی تەماشـاکەر ئەسـتێنێ!... وەیا ئەو چاوە کـە گەلێ جوانتر لە ژینێـک، ژینێکی وا کە لەبەر ئەوە هەموو شـت ئەبینێ، وەکوو پەڕی چەتـری تاوس چـۆن هەر تۆزێکـی لە ڕەنگێکە، ژینەکـەش بەو جۆرە هـەر کاتێکی لە ڕەنگێکە!. هیچ شـتێکیتر نییە لەو جوانتر بێ، مەگەر

ئەو چاوە کە هۆنەر ئەیەوێ باسی بکا و جوانتری بکا لە ژین!!..

ئەوەندە هەیە لە هۆنراوی سێیەمی «م. ش»ـدا دیسان گەڕاوەتەوە سەر ڕێگای هۆنەرە پەیڕەوییەکان بۆ باسکردنی «مار» و بێشەی برژانگ و دار و دەوەن لە چاودا!. بەڵام مەبەستەکەی ئێمە لە هۆنراوەکانی تریدایە، نەوەک لەم هۆنراوەیدا.

❀❀

ئەمە بەراوردێک بوو لە ناوەندی ئەدەبی پەیڕەوی و ئەدەبی داهاتوودا، لەگەڵ ئەمەشا ئەبێ ئەوە بزانین: ئەمە ئەوەمان پێی نالێ کە هەچ ئەدەبێکی پەیڕەویی هەیە ئەبێ کۆن بێت؛ واتە: هەرچی ئەدەبی کۆن هەیە ئەبێ ئەدەبی پەیڕەویی بێ!. ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، چونکە گەلێ ئەدەبی وامان بەرچاو ئەکەوێ هی پێش ئەو سەردەمەیە کە ئەدەبی داهاتوو پەیدا بووبێ، کەچی لەوانەیە بە گەلێ ساڵیتر ئەدەبی داهاتوو شان و قۆڵ بکوتێ هەر ناگا بە پەرێزی ئەوا، وە بەڵکوو دوور نییە هەر نەتوانێ بە تەواوی لە نیازەکەشی تێ بگا! بە وێنە لە کاتێکا کە «مەولەوی» ئەم هۆنراوانە ئەڵێ:

**نازک تەدارەک فەسڵ وەهاران**
**زەریف[1] ئارایش هەردە و کۆساران**
**گوڵ چوون ڕووی ئازیر نەزاکەت پۆشان**
**وەفراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان!**

سامانی ئەدەبی تازە بە هیچ جۆر ناتوانێ دەستی بۆ درێژ کا.

---

١. شیرین ـ نوسخە.

مەولـەوی کاتـێ کـە چـاوی بـە دیمەنێکـی خواکـردی وەکـوو «سا ـ فەسڵ»ـی بەهـار ئەکـەوێ، بەپێچەوانـەی هەمـوو هۆنـەر و ئەدیبێکـی کـۆن و تازە، کە بیر لە باسـێ ئەکاتەوە، بە چەشـنێک دێتە ناوەوە، تەنهـا خۆی نەبێ کەسـێکی‌تر نەتوانێ ئەو بیـرە وردە بە چەند وشەیەکی کورتی بەناوک دەربڕێ. دێتە ناوەوە و ئەڵێ:

چەند جوان و ڕێکوپێکە ئەم سەردەمی بەهارە؛ چەند بە قەشەنگی ڕازێنراوەتەوە ئەم هەردە و کۆسارانانە[1]. واتە: جوانی نەماوەتەوە بۆ هیچ

١. «کۆسـاران» جەمعی «کۆسـار»ە. «سـار» لەو شـوێنەدا بەمانا «شوێن»ـە؛ واتە: شـوێنی کێوەکان. لێرەدا کە وتراوە «کۆسارانانە» ئەتوانرێ بوترێ ئەمە هەڵەیە، چونکە «کۆسار» لـە جەمعەکەیا بوو بە «کۆسـاران»، ئیتر «ا.ن»ـەکەی‌تر زیاد ئەبـێ و بە هیچ دەرئەچێ و ئەمە لە کوردیدا نەبیستراوە!.

لەم شوێنەدا دوو قسە هەیە: یەکێ ئەوە، ئەو وشانە کە «ا.ن» لە بناغەی واژەکەیە وەکوو «شـوان، جوان» کە جەمع کرایەوە ئەبێ بە «شـوانان، جوانان»، ئەلف و نوونێکی بناغەییە و «ا.ن»ـێکی جەمعەکەیە.

وەیا ئەگەر ئامرازی ئیشارەی وەکوو «ئەم، ئەو» وتران، ئەڵێ: «ئەم شوانانە، ئەو جوانانە» پیتی «ە»یەکە ئامرازێکە کە ئیشارەبۆکراوەکە ئەلکێنێ بە ئامرازی ئیشارەکەوە.

لـە وشـەی «کۆسـارانانە»دا، جـارێ ئەمـە پێش هەموو شـتێک بـۆ جەمعی جەمعـە؛ واتە: ئـەم کۆسـارانە و ئـەو کۆسارانە و کۆسـارانی‌تریش. ئەوەندە هەیە ئەمـە یەکێک ئەبێ لە «سـیغە» سـەماعییەکان و شـتی‌تری لەسـەر دروسـت ناکرێ، بەڵام خۆی لە خۆیا ڕاسـتە و هیچ هەڵەیەکی تێدا نییە.

دووەم، لە چەشـەی کوردیدا وشـەیەک کە دواییەکەی بە «ا.ن» هاتبێتەوە، بتەوێ جەمعی کەیتەوە، بە چاوپۆشی لەوە کە ئەو «ا.ن»ـەی پێشوو بۆ جەمعە، وەیا لە بناغەی وشەکەیە، دواییەکەی بە «ا.ن»ـێکی‌تر ئەهێنرێتەوە.

چەشەی کوردی ئەمە هەڵئەگرێ، جا وا ڕێ ئەکەوێ «ا.ن»ـی دووەم ئەچێت بەسەر ئەلف و نوونێکا، کە بۆ جەمعە و لە بناغەی وشەکە نییە. لە شوێنێکی وادا «ا.ن»ـی دووەم ئەبێ بە جەمعێکی‌تر لە کوردیدا.

شتێک، تەنها بۆ وەختی بەهار نەبێ، بەڵکوو لەوانەیە کەوایەکە و بە باڵای ئەوا بڕاوە!..

بەهار زۆر شتی جوان جوانی تێدایە؛ یەکێک لەوانە گوڵە، ئەم گوڵە کە یەکێکە لە بەری بەهار، ئەوەندە نازک و پاکیزە و بێگەردە، ئەڵێی روومەتی ئازیزی خۆشەویستە کە کراسی تەرچکیی و نازکیی کردۆتە بەر!..

یەکێکی تر لە بەری بەهار، لافاوی بەفراوە؛ ئەم لافاوی بەفراوە کە هاژە ئەکا، هیچ شتێکی ترت بۆ نادۆزرێتەوە کە بڵێیت لەو ئەکا، تەنها لێزماوی[1] سافی فرمێسکی چاوەکانی من نەبێ!».

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ: کە ئەم لافاوی بەفراوە کە وەکوو فرمێسکی منە، گریانێکی شیوەنکارییە، بەڵکوو گریانێکی شادی و کامەرانییە؛ لە شادی گوڵەکان و لە نەوای بولبولەکان، هاژەی ئەم فرمێسکەی دێت. بە چیدا ئەزانین بۆ شادییە؟ بەوەدا چونکە بەفراو ساردە، ئەم بەفراوەی کردووە بە وەکوو فرمێسکی خۆی، مادام ساردیی لە بەفراودا هەیە، ئەبێ ساردی لە فرمێسکەکەی خۆیشیا هەبێ، ئەگینا نەیئەکردن بە وەکوو یەک. فرمێسکی ساردیش بۆ شادییە نەوەک بۆ شیوەن. کەوابوو، گوڵ و بەفراو لە بەهاراندا لە ئاهەنگی شادیدان و هەموو هەستییەک

ئەمە و دیسان «کۆساران» کە بۆ جەمع بێت، لە شێوەی ئەردەڵاندا کە ئەیڵێن: «کۆساران‌گەل». بۆچی ئەم گۆسارانگەلە ئەبێ دروست بێ؟ بۆچی ئەم کۆسارانانە دروست نەبێ؟!. وەکوو وترا، چەشەی کوردییەکەشی لەگەڵایە کە دوایی هەموو دوایی‌هاتووێک بە «ا.ن»، دیسان بە ئەلف و نوون ئەهێنرێتەوە... (دانەر)

١. وشەی «لێزماو» لێرەدا شوێنی خۆی نییە و بۆی ناگونجێ؛ چونکە لێزماو بە ئاوی لافاوێکی چڵپاوی قوڕاوی ئەڵێن. فرمێسکی چاو ئاوێکی روونە، نابێ بە لێزماو!... (دانەر)

ئەهێننە هەژانی شادکامی.

بێگومان ئـەم یادەی مەولەوی با لە ڕۆژگاریشـدا پێش کەوتبێت، لەچاو نەفسـی یادەکەوە هـەتا ڕۆژگارەکە بەملاترەوە بێـت، بیرەکە هەر تازەیە و تازەتر ئەبێتەوە!..

لەمـەوە بۆمـان دەرکـەوت: کـە مەرج نییە هەر شـتێک کـۆن بوو پەیڕەویـی بـێ، وەکوو چـۆن مەرجیـش نییە هـەر شـتێک تازە بوو، ئەبێ داهاتوو بیت. زۆر شـت لە ئەدەبدا هەیە تازەیە بەچاو ئەوەوە کە ئێسـتە وتراوە، کەچی کاتێ کە وردی ئەکەیتـەوە پەیڕەوییەکی تەواوە و شـوێنپێی یەکێکی‌تـری هەڵگرتـووە. وێنەش بۆ ئەمـە زۆرە؛ وەکوو ئەو هۆنراوەی کە بۆ ئەدەبی پەیڕەوی هێنرایەوە کە ئەڵێ:

**لە تاو تیری موژەت خۆم خستە ژێر زونناری ئەگریجەت**
**بە دوو شمشـــیری ئەبرۆت، لەتلەتت کردم بە یەکجاری!**

ئەگەر سـەیری سـەردەمی دانانی ئەم هۆنراوە بکەین، زۆر زۆر تازە دێتە بەرچاومان، بەڵکوو دانانەکەی بە سـاڵ لە پەنجەی دەست تێپەڕ ناکا، کەچـی ئەوە بووبوو بە وێنەیەکی هـەرە زل بۆ هۆنراوەی ئەدەبی پەیڕەویـی!. ئـەوەش کە ئەمەمان بـە ئەدەبی پەیڕەویی پیشـان ئەدا، مێژووی ناوچەی ژیانی خاوەنەکەیەتی.

# چۆنیەتییەکی ئەدەب و ئەدیب!

لە پێش ئەوەدا کە بکەوینە ناو باسێکی دووری چۆنیەتی هۆنراو و ئەدەبی کوردییەوە، پێویستە لە پێشا ئەم شتانە کە لە بارەی ئەدەبەوە هەیە، بیانزانین -دیارە ئەدەب بە هۆنراویشەوە-.

تا ئەم شوێنە باسی بەشکردنی ئەدەب بوو؛ ئەو بەشکردنە کە خۆی لەناو خۆیا و لە هەموو شوێن و چەرخێکدا بەش ئەبێت. ئەوەش: ئەدەبی نیازیی، چۆنیەتی و جەفەنگی بوو، لە لایەکەوە؛ لە لایەکی تریشەوە: ئەدەبی پەیڕەویی و داهاتوو وەیا نوێ بوو، لە بارێکی تردا.

ئەمێنێتەوە سەر ئەوە: کە ئەم چەشنە ئەدەبانە ئایا لە چەشەی ئەو کەسانەن کە دایانئەنێن؟ وەیا ئاوێنەی ئەو گەلە و ئەو سەردەمەی ئەوانە، کە لە دڵیانا دەرئەکەون؟. وادیارە ئەمەی دواییانە؛ واتە: ئاوێنەی گەل و سەردەمەکەن، کە ئەوان پیشانی ئەدەن. ئەوەندە هەیە: ئەمانەش لەناو خۆیانا جیا ئەبنەوە و بەڵکوو ئەبن بە چەند دەستەیەکەوە، وەیا بڵێین: ئەبن بەچوار دەستەوە:

دەستەیەکیان ئەڵێن: وەکوو چۆن موزیقا و وێنە -وێنەی دەستی- بە ئارەزووی وێنەکێش و موزیقارەکەیە، واتە: چۆن چەشەیان بیەوێ، بەو جۆرە دەری‌ئەکەن، بەتایبەتی وێنەکێشەکە؛ ئەدەبیش وەکوو ئەوان بە هەوەسی ئەدیبەکەیە، چۆن چەشەی بیەوێ، وای دەرئەبڕێ، ئەوەندە هەیە: ئەو جێگا و مەڵبەندانە کە ئەدیبەکەی تێدایە ئەوانە ئەتوانن دەستکاری لە گۆڕینی ئەدەبەکەی ئەوا بکەن؛ واتە: شوێنێک

جیهانێکـی بەرزی پڕ لە کۆشـکی بە هەمـوو جۆرە ئـاوەدان، ئاوەدانە، ئەدیبەکە بەپێی ئەو شـوێنە بەرزە چەشـەی ئەبزوێت و شت دائەنێ. وە هەر هەمان ئەدیب ئەکەوێتە ئاشەکۆنێکەوە، لێرەدا دیمەنی ئاشەکە ئەیبزوێنێ و بەپێی چۆنیەتی پەڕپووتیی ئەو ئاشەکۆنە شتەکەی دائەنێ؛ ئەگینا لە ڕاستیدا ئەو گۆڕانێکی بەسەر «مایە ـ مادّە»ی ئەدەبەکی خۆیا نەهێناوە، ئەوەندە هەیە هۆیـەکەی گۆڕاوە ـکە دیمەنەکەیە ـ.

کەوابوو، باوەڕی ئەم چەشـنە ئەدیبانە ئەوەیە: ئەدەب پیشان بدەن بـە جۆرێک کە خـۆیان ئەیانەوێ، نەوەک بە چەشـنێک کە ئەدەب داوایان لێ ئەکا و ئەبێ وابێ؛ ئەبێ ئەدەب لە ژێر فەرمانی ئەوانا بێ، نەوەک ئەوان لە ژێر فەرمانی ئەدەبدا بن!!..

لەسـەر ئەم باوەڕە، ئەم جـۆرە ئەدیب وەیا ئەدەبە، ئەبێ ناو بەرین بـە ئەدەبێکی ڕاوەسـتاو؛ واتە: هیچ لە شـوێنی خـۆی جموجووڵ ناکا، چـۆن بووە، هـەروا ئەمێنێتەوە!. ئەمـەش لەبەر ئەوەیە: کـە ئەدەبەکە لەناو جەرگ و جەرگەی کۆمەڵەوە هەڵناسـتێ، هەتا هەموو پەردەکانی دەرکەوێ؛ بگرە تەنها هەر لە باوەڕی ئەدیبەکە و لە دڵی تەنها ئەدەبەکەوە هەڵئەسـتێ. بەڵکوو وەکوو ئەوە وایە کە ئەدیبەکە لە پشـت دیوارێکەوە بێـت و دەنگێکـی لەودیـوی دیوارەکەوە بێتە گـوێ و بەپێی ئەو دەنگە ئەدەبەکـەی دابنێ، [کە] چاوی لە خاوەن دەنگەکـەوە نییە؛ واتە: ئەو لە هەردەیەکدایە و دەنگەکە لە هەردەیەکی ترا!!..

**من لەگەڵ ئەم باوەڕەدا نیم، من ئەڵێم:**

(بەڵێ! ئەدەب مایەی هەسـتێکە لـە ئەدیبەکەدا، بەڵام لە وەختێکا کـە دیمەن هەبوو ئەو هەسـتە ئەبێ بە «بایس ـ لازم»ـی ئەو دیمەنە

و لێـی نابێتەوە تا ئەینووسـێنێ بە خۆیەوە، کە نووسـاندی بە خۆیەوە بەهۆی وشـەکانەوە نەفسی ئەدەبەکە دەرئەکەوێ و ئەکەوێتە بەرچاوی هەموو کەسێکەوە.

وێنە بۆ ئەمە ئەوە بێ: کە ئەدیبێک لە هەموو ژیانیا لە دارسـتانێکا ژیابـێ، هیـچ شتێکی‌تریشـی بێجگە لـە ژیانی ناو دارسـتان گوێ لێ نەبـووە، ئەو ئەدەبە کە ئەو دەری‌ئەبڕێ هەر لەگەڵ ئەو شـتانەدایە کە ئاشـنایەتی لەگەڵ دارسـتانا هەیـە. خۆ ئەگەر هات و شـوێنی گۆڕی و شتی‌تری بەرچاو کەوت، سەیر ئەکەی پەردەی ئەدەبەکەشی ئەگۆڕێ.

ئێمە ئەبێ ئەوە بزانین: کە لە کاروبارێکی ئەدەبیدا سێ شت ئیش ئـەکا: یەکێ هەسـتی ئەدیبەکە، یەکـێ هۆی ئەدەبەکە، یەکێ نەفسـی ئەدەبەکە.

هەروەها ئەبێ ئەوەش بزانین: کە ئەدەبەکە لە چییەوە هەڵئەستێ؟ دیارە لە هۆیـەکەوە ـکە دیمەنەکەیە، بە وێنەـ هۆیـەکەش فەرمانداریی هەستی ئەدیبەکەیە بۆ دەربڕینی نەفسی ئەدەبەکە. کەوابوو، ئەدەبەکە بەو ناوەوە کە بوونەکەی نووساوە بە بوونی هۆیـەکەوە و لەو جیا نابێتەوە، وە هۆیـەکـەش بـوو بـە فەرمانـداری هەسـتەکە، بـوو بـە فەرمانداری ئەدیبەکە و ئەدیب چووە ژێر فەرمانی ئەدەبەکەوە!..

لەسـەر ئەمە، ئیتر ئەو قسەیە نەچووە سەر کە ئەڵێ: ئەبێ ئەدەب لـە ژێر فەرمانی ئەدیبدا بێ، بەڵکوو ئەوە سـاغ بـووەوە: کە ئەدیب لە ژێر فەرمانی ئەدەبایە).

✽✽

دەستەیەکی‌تر ئەڵێن: ئەدەب نیاز و خورپەیەکی تایبەتییە و لە دڵی ئەدیبەکەدا پەیدا ئەبێ، کە بەو هۆیەوە ئەتوانێ وێنەیەکی ڕاستی کۆمەڵ بگرێ. ئەوەندە هەیە ئایا ئەمە ڕاستە یان نەء؟ ڕاستە تا ڕادەیەک، کە ئەتوانێ وێنەیان بگرێ، بەڵام هەر وێنەی تەنها و هیچی‌تر. واتە: ئەڵێ ئەمە نموونەیەکە لەو گەلە؛ نموونەی تێریی گەل یا برسێتیی گەل؛ ئەگەر تەنها ئەمە بێ، هیچ کەڵکێکی نییە؛ چونکە ئەگەر بڵێت: ئەمە پەردەیەکە و چارێک بۆ لابردنی ئەو پەردەیە نەدۆزێتەوە، کەڵکێکی وا لە ئەدەبەکەیا نابێ؛ واتە ئەگەر بڵێت: ئەو منداڵە برسییە وەیا نەخۆشە، تەنها ئەمە کەڵک ناگرێ، ئەگەر ئەدەبەکەی ئەو ڕێگایە پیشان نەدا کە چۆن برسێتییەکەی وەیا نەخۆشییەکەی لائەچێ و ئەکەوێتە گێتییەکی‌تری جیا لە گێتییەکەی پێشووی!..

ئەمە و دیسان: ئەدەب ئەبێ لەناو جەرگەی کۆمەڵایەتییەوە بێتە دەرەوە؛ لەناو جەرگەی بێتە دەرەوە بۆ ئەو ئەدیبە کە لەو ناوچەیەدا ئەژی. کەوابوو، ئەدەبی ئەدیبێک کە خۆی لە شوێنێک ئەژی و ئەدەبەکەی قسە لە شوێنێکی‌ترەوە ئەکا، زۆر بەکەڵکی ئەو شوێنە نایە؛ چونکە ناوچەی ژیان و بیروباوەڕی شوێنەکەی‌تر، گەلێ جیایە لە ناوچەی ژیان و چۆنیەتی کۆمەڵایەتی، وەیا گیروگرفتییەکانی ئەو کۆمەڵە کە ئەوی تیا ئەژیت.

بۆ وێنە: باسکردنی ئەدەبێکی ئنگلیزی بۆ وڵاتێکی کوردی، ڕەنگبێ بێجگە لە تەنها شارەزاییەک بەسەر ئەدەبە ئینگلیزییەکەدا نەبێ، هیچ کەڵکێکی‌تر بە وڵاتە کوردەکە نەگەیەنێ، چونکە ئەو نووسینە کە لە وڵاتە ئنگلیزییەکەدا ـ بە وێنەـ وتراوە، ئەدیبەکە بە

نووسینەکەی بیروباوەڕی ئەوانی پیشان داوە، بیروباوەڕەکەی ئەوانیش ئەو گیروگرفتییانەن کە لە چۆنیەتی کۆمەڵایەتییەکەیانەوە پەیدا ئەبێ، چۆنیەتی کۆمەڵایەتییەکەشیان لە جۆری ژیان و ئابوورییانەوە دروست ئەبێ!. ئەمانە هەموو پێچەوانەی گیروگرفت و کۆمەڵایەتی و جۆری ژیانی وڵاتێکی کوردین. بەڵکوو بە هیچ جۆر پێکەوە نایانکرێ!..

ئەو، جەرگەی ئەدەبەکەی بەپێی ڕۆژ، ڕوو لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتێکی فەنتازی و کۆشک و سەرایەکی ڕەنگاوڕەنگی چەندنهۆمی و وردە شتی ناو کارگەکان و مەکینە و فابریقەکان ئەکاتەوە، ئەم جۆرە شتانە، هیچیان لە وڵاتی کوردەکەدا نین!.

کەوابوو، ئەدەبەکەی ئەو بۆ ئەم، هەروەک چیرۆک گێڕانەوە وایە بۆی، لە هەمان کاتا هی وڵاتی کوردەکەش بۆ ئەوان هەر وایە!.

ئەدەبێ کە لەناو جەرگی کۆمەڵەوە بێتە دەرەوە، لە کوردەواری باسی خانوویەکی لادێ، چۆنیەتی ڕابواردنی جووتیارێک، کردەوەی بازرگان و کرێکارێکی قوڕەکاری ئەگێڕێتەوە. ئەم جۆرە شتانە لەسەر ئەم وێنەیە و بەو چەشنە لە وڵاتی ئەوانا هەر نییە!!..

**بۆ بەندی یەکەمی باوەڕی ئەم دەستەیەش دیسان دوور نییە باوەڕی من پێچەوانەی ئەوەش بێ!. من ئەڵێم:**

(لە هەموو شتێکا سەبارەت ـ عیللەت و مەعلوول هەیە. وە «بایس ـ لازم»ـیەتێکیش لە بەینی ئەم عیللەت و مەعلوولەدا هەیە. ئەگەر ئەدیب بەهۆی هەستەکەیەوە توانی ئاگادارییەک بۆ یەکێکیان بدا بەپێی ئەو لازمیەت و مەلزومیەتەی کە لەبەینا هەیە، ئاگادار کردنەوە بۆ یەکێکیان، ئاگادارکردنەوەیە بۆ ئەویکەیان، دیارە لەم

ئاگادارکردنەوەیە ڕێگای چارکردنی بڵاو کردۆتەوە.

ئەو، کە بانگی برسێتی وەیا نەخۆشی منال ـبە وێنەـ ی بڵاو کردەوە، مەعنای ئەوەیە کە بانگی چارکردنی بڵاو کردۆتەوە.

ئەمێنێتەوە سەر ئەوە: کە هەندێ جار ئەدیب بانگی ئەوە ئەدا کە ئەڵێ: ئەو منالە ـبە وێنەـ ئەگری؛ ئەم، ئەم ئاگادارییە ئەدا. گریانی منال لە برسێتی وەیا نەخۆشییەوەیە، مەعنای وایە: کە ئەبێ تێر بکرێ وەیا ساغ بکرێتەوە.

کەوابوو، گریانەکە بۆ منالەکە بوو بە مەعلوول، عیللەتی گریانەکە چی بوو؟ برسێتی وەیا نەخۆشی بوو. ئەدیب خەبەری داوە بە مەعلوولەکە ـکە گریانەکەیەـ بۆ لابردنی عیللەتەکە ـکە برسێتی وەیا نەخۆشیەکەیەـ.

هەندێ جاری واش ئەبێ: کە ئەدیب ڕاستەوڕاست خەبەر بە عیللەت ئەدا بۆ لابردنی مەعلوول. وەکوو لە هۆنراوێکی «نالی»دا ئەڵێ:

**هەرچەندە کە ڕووتم، بە خودا مائیلی ڕووتم**
**بێبەرگییە عیللەت، کە هەتیو مەیلی هەتاوە!**

هەتیو بۆچی مەیلی هەتاو ئەکا؟ چونکە سەرمایەتی، عیللەتی سەرماکەی ڕووتییە. ئەم خەبەری بە عیللەتەکە داوە.

کەوابوو، لەسەر ئەم قسەیە: ئەگەر ئەدیب کەموکووڕی وە گیروگرفتی شتێکی دەربڕی، مەعنای ئەوەیە چارکردنی ئەو کەموکووڕییەی دەربڕیوە).

❀❀

بەشێکی‌تر لە ئەدەب، وەیا دەستەیەکی‌تر ئەڵێن: ئەدەبی وا هەیە تەنها هەر بۆ ئەدیبەکەیە، واتە ڕەمەکی مەردم لێی تێ ناگەن، وەیا نایانبزوێنێ، بەڵکوو ئەدەبەکە لە عاستی خۆیا ئەبێ بە هونەرێک بۆ دەستەیەکی تایبەتی و زۆرێکی زۆر لە گەلەکە تیایا بێبەش ئەبن!. دیسان ئەم جۆرە ئەدەبەش وەنەبێ سوودێکی تەواوی لێ وەرگیرێت؛ بۆیە وەرناگیررێ، چونکە ئەو ئەدەبە خۆی خستۆتە شوێنێکی واوە هەموو کەس دەستی نایگاتێ، بەڵکوو وەکوو گوڵەباخێکی جوانی لێ دێت، کە بەهۆی موتوربەوە[1] لەسەر چڵەپۆپەی دارچنارێک ڕوابێت، تەنانەت بۆنەکەشی بە کەس نەگا!!..

(لەسەر باوەڕی من، وادیارە ئەم بەشە ئەو قسەیە کە ئەڵێ: «ئەدەب ئەبێ لە گەلەوە بێت و بۆ گەل بێ»، ئیشێکی وای لێ کردوون کە جۆرە باوەڕی وایان بۆ پەیدا ببێ!. وا تێی ئەگەن کە ئەبێ ورد و دروشتی ئەو گەلە بە هەموو چینێکیەوە لەو ئەدەبە بگەن و کاریان تێ بکا، واتە: ئەبێ هەموو گەلەکە هەستی پێ بکا!. لەگەڵ ئەوەدا واش نییە، چونکە چاری گیروگرفتی گەلێک وەنەبێ برێتی بێ لە یەک شت، تا ئەگەر ئەو شتە نەوترێ ئیتر گەلەکە ناهومێد بێ.

بەڵێ! ئەگەر یەک شت بێ و ئەدیبەکە باسی ئەو شتە، کە مەبەستە نەیکا، ڕاستە ئەوە ئەدەبەکەی بۆ گەل نەبوو. بەڵکوو گەل، هەر گەلێک بێ -واتە پێشکەوتوو بێ یا پاشکەوتوو- گەلێ ناتەواوی ڕووی تێ ئەکا. دیارە ناتەواوی بەپێی پایەی ئەو گەلە، ئەگینا دوور نییە

---

١. [موتوربە: پێوەن، پەیوەندی دار و درەخت].

شتێک بە چاوی ئەوەوە ناتەواوییە، کەچی لە چاو گەلێکی‌ترا هیچ بە ناتەواوی دانانرێ.

بە وێنە بڵێین: نەخۆشی و نەخوێندەواری ڕووی کردە گەلێک. ئەم ڕووتێکردنە مەرج نییە هەردوو ناتەواوییەکە هەموو گەلەکە بگرێتەوە، ئەگونجێ یەکێکیان لە هەندێکیانا هەبێ و یەکێکی‌تریان لە هەندێکی‌تریانا هەبێ؛ وەکوو ئەوەش ئەگونجێ کە هەردوو ناتەواوییەکە لە هەموویانا هەبێ، وەیا هیچیان نەبن. دیسان ئەگونجێ ئەو بەشەی کە نەخوێندەوارە نەخۆش نەبێ، وەیا ئەو بەشەی کە نەخۆشە نەخوێندەوار نەبێ!. ئەدیبێک دێنێ قسە لە یەکێکیانەوە ئەکا کە نەخۆشییە، کەچی ئەم نەخۆشییە لە هەموو گەلەکەدا نییە.

بەڵێ! ئەدەبی ئەم ئەدیبە بۆ ئەو دەستەیە کە نەخۆشی تیدا نییە سوودێکی نییە، بەڵکوو سوودەکەی بۆ دەستەی نەخۆشەکەیە، کەچی لەگەڵ ئەمەشا ئەدەبەکەی لە ئەدەبیی خۆی نەکەوتووە و بەڵکوو لە گەلەوەیە و بۆ گەلیشە.

هەروەها ئەو ئەدەبەش کە ئەو دستەیە ئەڵێن: «لەبەر ئەوە هەر تەنها بۆ ئەدیبەکەیە، کەڵکێکی وای لێ وەرناگیرێ!» ئەمەش دیسان وەنەبێ بەڵگە و زانیاری پشتیوانی بکا، چونکە هیچ نەبێ ئەدەبی ئەو ئەدیبە ئەگەر نەبێ بە هی ڕەمەکی مەردم، خۆ ئەبێ بە هی چینێک. بوونی ئەدەب بە ئەدەبی چینێک، لەوەی ناخا کە ئەدەب نەبێ، واتە: بەڵکوو ئەدەبە.

ئەگەر ئێمە ئەم «حەسر»ە بکەین، بڵێین: «ئەدەب لە گەلە و بۆ گەلە، هەر شتێک لەمە دەرچوو، ئەوە ئەدەب نییە!» حەسرەکە بە

هەڵـە دەرئەچێ، چونکە زۆر ئەدەبی وا هەیە ـلەسـەر ئەو باوەڕە- ڕوو لە ڕەمەکی گەل ناکاتەوە، بەڵکوو ڕوو لە دەستەیەکی تایبەتی ئەکاتەوە. کەچی بە بەرزتر ئەدەبیش دائەنرێ و هەموو کەسیش دانی پیا ئەنێ).

❃❃

بەشـێکی‌تر لـە ئـەدەب کـە باوەڕی دەسـتەی چوارەمـە، ئەوەیـە: کـە ئەبێ دەرزێکـی تەواو لەم ئەدەبـەدا هەبێ بۆ ڕێ‌پیشـاندان و بۆ چارکردنی ئەو گیروگرفتییانە کە لە گەلە خاوەن ئەدەبەکەدا هەن؛ واتە: ئەبـێ تەوجیهێک لـە ئەدەبەکەدا هەبـێ، ئەگەر تەوجیـە نەبێت ـبا ئەدەبەکـە ئەدەبێکی چۆنیەتیش بێت- هەر سـوودێکی وا نابەخشـێ!، لەوانەیە ئەگەر تەوجیە نەبێت بە چەشنی وێنەکەی لێ دێتەوە!..

(بەلای منەوە با لەسەر ئەو باوەڕەش بێ کە ڕێ‌پیشاندان و چارکردن جیان لەیەک، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـا ئـەو دەربڕین و تەوجیهەی ئەم، ئەمـە ڕاسـت چارکردن و نەهێشـتنی ناتەواوییەکەیە؛ نەهێشـتنەکە بە کردەوە زۆرتر ئەکەوێتە سەر گەلەکە، نەوەک ئەکەوێتە سەر ئەدیبەکە.

وێنەی ئەو ئەدیبە بۆ نەهێشـتنی ناتەواویی، وەکوو وێنەی سەردار لەشـکرێکە لە مەیدانی جەنگدا؛ ئەو لەبەر ئەوە ڕێگای سەرکەوتن و بردنەوەی شـەڕەکەی دیوەتەوە، فەرمان ئەدا بە جەنگ وەیا بە هێرش، بناغەی جەنگ و هێرشەکە ئیتر ئەکەوێتە ئەستۆی سەربازەکان، ئەگەر ئەمـان بەگـوێ ئەو نەکەن، سـووچی سـەرنەکەوتنی شـەڕەکە ناچێتە ئەستۆی سەردار لەشکرەکە، بەڵکوو ئەچێتە ئەستۆی سەربازەکان!.

ئەدەبەکەش کوتومت ئەو سـەمەرەیە هەیـە؛ ئەدیبەکە ڕێ ڕووناک

ئەکاتـەوە و تەوجیهـی خـۆی ئـەکا بـۆ نەهێشـتنی ناتـەواوی، ئەگـەر کەسـانیتر بەو ڕێگەیەدا نەڕۆن، هیچ ئۆباڵێک ناچێتە ئەسـتۆی ئەو، بەڵکـوو ئەو پێویسـتیی خـۆی بەجێ هێنـاوە، چارکردن و نەهێشـتنی گیروگرفتیی، ئیتر ئەکەوێتە سـەر شانی ئەو کەسانە کە ئەم گۆشەیەکی بۆ ڕوون کردوونەتەوە).

لەسـەر ڕووناکی ئـەم بیروباوەڕانە، پێویسـتە ئامانجێکی تایبەتی لە دانانی ئەو ئەدەبـەی ئەدیبەکە دایئەنێ، هەبێت؛ ئەبێ ئەدەبەکەی لە ڕووناکییا ببێ بە بەشـێ لە کـوورەی ڕۆژ و ڕێوبان بە تەواوی ڕووناک بکاتەوە، جا ئیتر ئەو ڕێگایە هەر ڕێگەیەک ببێ.

بێگومان ئەدیبەکە هەست بە ناتەواوییەک ئەکات، کە ئەدەبەکەی دائەنـێ، ئەبێ ئەو ناتەواوییە بخاتە ڕوو، نەوەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو ئەبێ ئەدەبەکەی لەوانە بێ کە چاری نەهێشـتنی ناتەواوییەکە بکات؛ ئەگینا هەر دەربڕینی ناتەواوییەکە بەبێ چارکردن، وەنەبێ سوودێکی وا ببەخشێ.

دیارە ئەمە لەسـەر بیروباوەڕی ئەو دەسـتانەیە کە قسەکانمان هێنان وە بەرانبـەر بـە هەریەکەیان ئێمـەش باوەڕی خۆمانمـان دەربڕی، کە هەریەکە چۆن قسـەیان لێوە کردووە و ئەنجامـی ئەو بەرەنگارییانەش هاتە سەر چی و چۆن شی کرانەوە؟!..

❋❋❋

# ڕەگەزەکانی ئەدەب!

ئـەوی تا ئـەم شـوێنە بۆ ئێمـە دەرکەوت، بەشـەکانی ئـەدەب بوو بـە هەمـوو لقێکـەوە؛ پەیـڕەوی و داهاتـوو، وەیا چۆنیەتـی، نیـازی و جەفەنگـی، وەکوو قسـەمان لە چۆنیەتییەکی ئـەدەب و ئەدیب و ئەو بیروباوەڕانەشـەوە کـرد کە تیایا کار ئەکـەن. دیارە ئەمانە لەچاو قووڵیی ئەدەبدا وەنەبێ لەوانە بن کە مرۆڤ بگەیێننە هەموو سـووچەکانی. لە ئێستە بەدواوە پێویسـتە لە ڕەگەزەکانی ئەدەب و لەو شێوە کە ئەدەبی لێ دروسـت ئەبـێ و لەو هونەرانـە کە جەوهەری ئەدەبەکە دروسـت ئەکـەن، تـێ بگەیـن. بەوبۆنـەوە لەپێش هەمـوو شـتێکدا ئەبێ ئەوە بزانرێ: کە لە ئەدەبدا چوار ڕەگەز هەیە:

یەکەم: «سـۆز»؛ سـۆز، ـکە مەبەسـت پێی عاتفەیەـ بەمانا کڵپە و گرپەیەکـە کـە لە دڵدا پەیدا ئەبێ، ئەبێتە هۆی ئەوە کە ئەندێشـە وەیا دڵ بـە ئارەزوویەکـی خۆشەویسـتانەی زەبوونییەوە بشـنێتەوە بۆ ئەو شتەی کە هێزەکەی ئەم ڕائەکێشێ و ئەیخاتە ئەو هەردەیەوە.

لێرەدا چەمکـی زمانیی ـ مەفهوومی لوغەوی ئەم «عاتفە»یە جیایە لەگـەڵ چەمکی عاتفەیەکدا، کە یەکێک بوو لە بەشـەکانی ئەدەب و بە بەسـەی «نیاز» بوو؛ لەوێدا ناو بوو بۆ نەفسـی ئەو شـتە کە ئەو نیاز و ئەندێشـەیە ئەدا بە دەستەوە؛ لێرەدا ناوە بۆ ئەو شتە نەبینراوە نهێنییە کە ئەم هەموو کردەوەیە ئەنوێنێ و وێنەشی زۆرە لە هەموو وشەیەکدا. وەکوو «سـەوز» کە گەوهەرێکە خـۆی لەخۆیا مایەیەکی هەیە و خۆی

بە خۆیـە، نەوەک بە شـتێکیتر. «سەوزی» سـیفەتێکە و بوونەکەی بە بوونی شتێکیترەوەیە؛ واتە: نێوار ـ عەرەزێکە بەسەر زاتەوەیە، خۆی لە زات ـ سروشـتی خۆدا بوونێکی نییە، تا زاتەکە نەبێت، ئەم وەسـفە بەم جۆرە نابێت ـکە ئەمە شـێوەی هەموو هاوخوویی ـنیسـبەتێکە ـ لەبەر ئەمە، عاتفە لەوێدا نیاز و ئەندێشەکەیە، لێرەدا سۆز و کڵپەکە.

دووەم: «بیر»؛ بیر، کە فیکرە، بیرکردنەوەیە لە شت و وردکردنەوەیەتی بۆ ئەوە گوزارە و چەمکەکەی وەربگیررێ، وەیا ئەو گوزارانەیە کە بە دڵا تێپەڕ ئەکەن.

سـێیەم: «ئەندێشـە»؛ ئەندێشـە، کە خەیاڵە، گومان و تەوژمێکی تیژتێپـەڕی پەنهانییـە لە دڵا، وەیا هێزێکی پەنهانییـە، تاپۆی ئەو یادانە ئەهێڵێتەوە کە مایەکانیان ون بوون. بێگومان ئەگەر ئەندێشـە نەبێت، ئیشـی بەیان و ئەدەب ئەوەسـتێ، لەبەر ئەمەیە بۆیـە ئەندێشە بووە بە پایەیەکی هەرە گەورەی ئەدەب، تەنانەت ئەگەر ئەندێشە نەبێت، وشە ناتوانێ وێنەی گوزارە بکێشێت و پڕی بکاتەوە، چونکە وشە لەوانەیە لە ژمـارە بێت و ئەندازەیەکی هەبێت، بەڵام گوزارە نە لە ژمارە دێت وە نە ئەندازەشی هەیە.

چوارەم: واتە و چەند ڕستە قسەکردنێک ـکە ئەمە «**عیبارەت**»ـە ـ. کەوابـوو چوار ڕەگەزەکەی ئەدەب برێتیبوون لە: سـۆز، بیر، ئەندێشـە، عیبارەت، کە واتە و ڕستەکەیە.

سـۆز کـە عاتفەیـە، پەلامـاری «هونـەرە قسـەییە ئاشـکراییەکان ـ فنوونی بەیانیە»ی وەکوو تەشـبیه، کینایە و ئیسـتیعارە ئەدا؛ واتە ئەمانە دەستکردی سـۆزن، ئەگەر ئەو سۆزە خۆی نەبزوێنێ، ئەمانە نابن. ئەم

سێیەش بە هەموویانەوە ڕەگەزێکی‌تر دروست ئەکەن کە ئەندێشەیە؛ واتــە ئەندێشــە لــە بارەی ئەدەبدا لە دەســتکردی ئەو ســێ شــتەیە. بە هەموو ســۆز و بیر و ئەندێشــەوە چوارەم دروســت ئەبێ کە ڕستەکەیە. ئەم ڕســتەیە ئەبێ بە «شێوە ـ ئوسلووب»ــی ئەدەبەکە. بە وێنە: سەیر ئەکەین هۆنەرێکی وەکوو «مەحوی» ئەڵێ:

**لەپڕ بەردی ئەجەل بۆ شیشــەیی عومــرم نەوا بێ زوو**
**فیدات بم دەســـتوبردێ ســاقیا جامە شــەرابێ زوو!**
**چییــە دنیــا؟ ژنێکە هەر شــەوە زکپــڕ بە ســەد فیتنە**
**ســبەینێ زوو بە خوێنی جەرگی ئەهلی دڵ دەکا بێزوو!**
**کە دایەی خاکت ئاخر، هەر دەبێ بتگرێتە باوەش خۆی**
**بکــە خاکێ بەســەر خۆتــا لە قاپــی بووتوڕابــێ زوو!**
**بــە تابــی عەکســی ئــەو دیــدارە دڵ ســووتا و دامرکا**
**کەتانــت ڕاگــرە، ســا ڕوو بە جیلــوەی ماهتابــێ زوو!**
**دەنی تەبعی بە جارێ عالەمــی داگرت ئەوا «مەحوی»**
**دەرەنگــە ئیلتیجایــە بــەر دەری عالی‌جەنابــێ زوو!.**

ئەبینیــن لــەم پارچــە ئەدەبــە هۆنراوەییەدا ســۆزی هۆنەر لە پێشــا لای کردۆتــەوە بــەلای هونەرەکانــی بەیانییــەوە، وەکــوو لێکچوواندنــی «ئەجەل ـ مردن» بە بەرد. «عومر ـ تەمەن» بە شووشــە. «دنیا ـ گێتی» بــە ژن. «خــاک» بــە دایــک!. وەکــوو تەشــبیهـ هەیــە لەمانــەدا، «خواستن ـ إستِعارە»ش هەر هەیە. وەیا «ماهتاب» «درکە ـ کینایە»یە

لە «خۆشەویسـت ـ مەحبووب». ئەمجا ئەمانە ئەندێشەکەیان لە دڵی ئەدیبەکەدا دروسـت کردووە، چونکە ئەگەر لە پێشا پەیکەری ئەمانە لە مێشـکی ئەدیبەکەدا نەبووبێ و پاشـان ون بووبێ، ئەندێشـەکە بۆیان ناچـێ؛ بۆیەش بۆیان ناچێ، چونکـە کردەوەی ئەندێشـە، گێڕانەوەی تاپۆی ئەو «تەشک ـ هەیکەل»ـانەیە سەرلەنوێ بۆ مێشک. کە سۆز و بیر و ئەندێشە کۆ بوونەوە، ڕستە دروست ئەبێ.

کەوابـوو، بۆ پارچەیەکی ئەدەبی، مادام ڕسـتە هەبوو، مەرجە ئەبێ سـێکەی‌تریش هەبن، بەڵام لە بوونی ئەوان مەرج نییە ڕسـتە هەبێ، چونکـە ئەگونجـێ کابرایەکی «لاڵ» سـۆز و بیر و ئەندێشـەی هەبێ، کەچی ڕستەی نییە!...

❋❋

دیسـان لە ئەدەبا وەکوو سـەیری ئەمانە ئەکرێ، پێویسـتە سـەیری ئـەوەش بکرێ: کە بۆ بەرزی ئەو ئەدەبە دوو شـتی‌تر پێویسـتە: یەکێ ئـەو وشـەیە کە لـە ئەدەبەکەدا بـەکار ئەهێنرێ، ڕاسـت و تـەواو بێ، یەکێ ئەو گوزارەیە کە لەو ئەدەبە ئەویسترێ، ئەبێ بەرز و بەنرخ بێ؛ چونکـە ئەگـەر وا نەبێ ناتوانێ جێـگای خۆی بکاتەوە لـە دڵی گوێگر وەیا خوێنەرەکـەیا. بۆ وێنـە، لە پارچەیەکی پەخشـاندا یەکێکی وەکوو «پیرەمێرد» ئەڵێ:

**(... لەمە خۆشتر و شیرینتر بریقەی چەمی «تانجەڕۆ» بوو، کە ڕۆژ لێی دابوو، لە سەرەوە ئەمانڕوانی وەک کەمەرەی زیوی خاتوو بەڵکیس، سولەیمانی ئەدرەوشایەوە!.**

**لێرەدا با درێژە نەکێشێ، هەروا تێی پەڕین، بەسەر «زەردیاوا ـ**

**قەرەداغ»دا ئەڕوێن، ئەوا ئێوارە گەیشتینە ناو «قۆپی». شەو، چوار دەستە لە چوار لاوە ئاگری زەردەشتیی کردەوە، ڕێکەوتیش وا بوو شەوی چواردەی مانگ ـ بەدر ـ بوو، لە سەرەوە شەوقێ لە ئاسمانەوە، لە ژێرەوە گڕێ لە زەمینەوە تەوقەیان ئەکردا. شەلالەی نوور و گڕی تەنوور، کانیی ئاوی کەوسەر بووبووە ئاوێنەی ژێر و سەرا!.. مانگ لەناو ئاودا ئەلەرزی، سێبەری «بی»ی دەوری ئاوەکەش وەک بیی ناو ئاو لەگەڵی ئەلەرزی، خۆ دیارە گڕی ئاگریش لە خۆیدا بە لەرزەیە، ئەمجا کەسێ شاعیر بێ، لەم دیمەنە چۆن دڵی نایەتە لەرزە؟!..**

**لەنـاو ئـەو ئـاوە جوانەی تـەرزی تـەرزە**
**دڵی «بی» و «مانگ» و «شاعیر» هاتە لەرزە!)[1]**

وەکوو سەیر ئەکەین، لەم پارچەیەدا هەردوو مەرجەکە پێک هاتووە؛ وشەکانی هەریەکە بە تەواوی شوێنی خۆیانیان گرتووە و وەکوو ئاوێکی ڕەوان بەبێ قۆرت لە سەرەتای باسەوە تا دواییەکەی سەرەوخوار ئەبنەوە و زنجیرەی باسەکە ئەهۆننەوە. هەروەها ئەو گوزارانە کە لە وشەکان وەرئەگیررێن، ڕشێنەیەک ئەدەن بە دڵی گوێگر و خوێنەر، لەوانەیە هەموو هۆشی ئەو گوێگر و خوێنەرە بە تەواوی ڕاکێشن بۆ لای خۆیان، وەکوو چۆن هەموو سووچێکی بەلاغەی تیا دروست بووە و بە بوونی بەلاغەکە، ئەدەبێکی تەواوی کوردی پەیدا بووە.

***

١. لە نووسینێکی «شەوێکی ناو قۆپی» کە لە گەلاوێژی ژمارە «٢٠»ی ساڵی «٤»دا بڵاو کراوەتەوە.

# هونەرە قسەییە ئاشکراییەکان
# (فنوونی بەیانیە)

ئەو باسانە کە تا ئێستە لە بارەی ئەدەبەوە کران، باسێک بوون تەنها بۆ ئەوە بوون کە ئەدەب ئەبێ بە چی و چۆن ئەو بەشانە لێک جیا ئەکرێنەوە و کراونەتەوە. واتە بەپێی باسی تازە، ئەتوانرێ ئەوە دەرخرێ کە ئەدەبێکی پەیڕەوی چۆن لە ئەدەبێکی داهاتوو جیا ئەکرێتەوە؟. وەیا ئەدەبێکی چۆنیەتی لەگەڵ ئەدەبێکی نیازی و جەفەنگیدا چۆن لێک ئەکرێنەوە و هەریەکە ئەکرێن بە بەشێکی تایبەتی؟.. بێگومان تەنها ئەمانەش نابن بەهۆی شناساندنی ئەدەب لە هەموو سووچێکەوە، چونکە ئەمانە شناساندنی ڕواڵەتی لقەکان بوون، شناساندنی گەوهەری ئەدەب لەلایەن هونەرە قسەییە ئاشکراییەکانەوە ـکە ئەمە زۆر شت ئەگرێتەوەـ هێشتا هەر ماوە؛ هێشتا ئەوە هەر ماوە: کە ئایا ئەم هونەرانە چین و چۆن ئەدەب بەوان دروست ئەبێ؟..

لەبەر ئەوە ئەڵێین: ئەدەب، هەر جۆرە ئەدەبێک بێت، پێویستە ئەو هونەرە قسەییانە بزانرێن، چونکە ئەگەر ئەمانە نەزانرێن، گەوهەری ئەدەبەکە نازانرێ و دەرناکەوێ. ئەم هونەرانەش وەنەبێ تایبەتی بن بە ئەدەبێکی کۆنەوە، وەیا بڵێین بە ئەدەبی کۆنەوە؛ ئەدەب کۆن بێ یا تازە، ئەم هونەرانەی هەر تێدا هەیە. کەوابوو کۆنی و تازەیی لە هونەرەکانا نییە، بەڵکوو کۆنی و تازەیی، وەیا چۆنیەتی و نیازیی و جەفەنگی لە پارچەکەدایە؛ پارچە، هەر پارچەیەک بێت، ئەبێ لەم هونەرانەی تێدا

هەبێت؛ ئەگەر نەبێ، ئەدەبەکە نەبوو بە شتێک کە مەردمیتری پێ تێبگەیەنرێت؛ دیارە شتێک کە تێگەیاندنی تێدا نەبوو، کەڵکێک لەو شتەدا نابێت!. لەمەوە ئەوە دەرکەوت: کە ئەدەب ئەبێ کەڵکی هەبێ، کەڵکەکەشی بەوە ئەبێ کە بەرانبەری پێ تێبگەیەنرێ. کەوابوو، ئەدەبەکە بوو بە پارچەیەک، کە بەرانبەری کرد لەگەڵ ویستەی ئەو وەخت و شوێنەدا؛ واتە لەگەڵ «مُقتَضای حال»ـدا. دیارە ئەمانەش ئەبێ هەموو لە ئەدەبی کوردیدا بێنە دی، ئەگەر نەیەن، ئەبێ ئەدەبی کوردیی نەبێت، خۆ ئەدەبەکە هەیە، کەواتە ئەمانەش لەودا هەن.

❃❃

ئەمجا لەو هونەرە قسەییە ئاشکراییانە یەکێکیان «ڕەگەزدۆزی ـ جِناس»ـە. ڕەگەزدۆزیش ئەوەیە: کە هۆنەر لە هۆنراوەکەیا دوو وشە وەیا زیاتر بێنێتەوە، وشەکان لە ڕواڵەتا وەکوو یەک وابن، بەڵام لە گوزارەدا هەریەکە گوزارەیەکیان هەبێت. لە ڕەگەزدۆزیدا وەکوو ئەم پیشەیە هەیە، جوانیش هەیە؛ کە لەسەر زمانی «عیلمی بەدیع» پێی ئەڵێن: «لَطافَت». وەکوو «نالی» لەم هۆنراوانەیدا ئەڵێ:

**خەتات فەرموو کە خۆشە چین و ماچین**
**کە ناچین لێرە، خۆشە چینی ماچین!**
**بڕۆت هەر چین و پەرچەم چین لەسەر چین**
**ئەمەندە چینە قوربان پێم بڵێ چین؟!**

وشەی «چین» و «خۆشە» لەم دوو هۆنراوەدا چەند جار وتراونەتەوە، لە ڕواڵەتا وەکوو یەک وانە، بەڵام لە گوزارەدا هەریەکە گوزارەیەکیان هەیە.

وشەی «خۆشە» لە هۆنراوی یەکەمدا کە لە هەردوو نیوە هۆنراوەکەدا هەیە، یەکەمیان بە مانا خۆشییە کە بەرانبەر ناخۆشییە، دووەمیان بە مانا هێشوویە.

وشەی «چین و ماچین» لە هەردوو هۆنراوەکەدا دە جار وتراوەتەوە، کە لە ڕواڵەتا یەکن، بەڵام لە گوزارەدا هەریەکە گوزارەیەکیان هەیە؛ «چین و ماچین» لە نیوە هۆنراوەی یەکەمدا وڵاتی «چین»ـە، کە لەناو کورددا بە چین و ماچین بەناوبانگە. وشەی «ناچین» واتە ناڕۆین، ڕەگەزدۆزییەکی وشەیی هەیە لەگەڵ هەردوو چییەکەی پێشوودا، بەتایبەتی لەگەڵ «ماچین» کە ناتەواوە. «چین»ـی سێیەم بە بەسەی هەڵبژاردنە. وشەی «ماچین» بە بەسەی ماچ و بۆ گەلە، کە لەگەڵ «ماچین»ـی یەکەمدا ڕەگەزدۆزی تەواویان هەیە. وشەی شەشەم و حەوتەم و هەشتەم و نۆیەم بە گوزارەی ڕیزن. وشەی دەیەم بۆ پرسیارە لە چۆنیەتی و گەوهەری گەل، واتە چ شتێکن؟..

کورتی گوزارەی هۆنراوەکان ئەڵێ:

تۆ، کە فەرمووت: چین و ماچین خۆشە، باشت نەفەرموو، ئێمە لەم شوێنە نابزوێین و هێشووچنی ماچین، برۆ و ئەگریجەت کەوتوون بەسەر یەکدا چین‌چین، پێم ناڵێیت ئەم هەموو چینانە وا لەسەر یەک کەوتوون، بۆچ وا بەو جۆرە کەوتوون؟!

ئەمجا ڕەگەزدۆزیش دوو جۆرە: جۆرێکی پێی ئەڵێن: ڕەگەزدۆزی تەواو، کە ئەمە ئەبێ بە ڕێکی پیتەکان، وشەکان وەکوو یەک هاتبنە خوارەوە، وەکوو ئەو وێنەیە کە هێنامانەوە. جۆرەکەی‌تری پێی ئەڵێن: ڕەگەزدۆزی ناتەواو؛ ئەمەش ئەوەیە: کە کێشی وشەکان یەک بێ،

بەڵام لە یەک پیتدا جیا ببنەوە. وەکوو دیسان «ناڵی» ئەڵێ:

**بایە لــە تــەرەف قیبلەمەوە دێــت و وەزانە**

**یا بۆنی هەناسەی دەمی غونچە لە ڕەزانە؟!.**

کــە ڕەگەزدۆزییەکە لە بەینی «وەزان» وا هەڵیکــردووە، وە «ڕەزان» کــە بــە گــوزارەی باخەکانە، هەیــە. لە کێشــدا یەکن، پیتــی «و» و «ڕ» گۆڕاونەتەوە بە یەک لە سەرەتای وشەوە، وە لەم گۆڕانەوەدا گوزارەکەش گۆڕاوە!..

وە یا «حاجی قادر»ی کۆیی ئەڵێ:

**ئەی بێ نەزیر و هەمتا، هەر تۆی کە بەرقەراری**

**بــێ دار و بێ دیــاری، بێــدار و پایــەداری!**

**بــۆ باغی مەردی یاغی ســەرمایەکی خەزانی**

**بۆ مەزرەعەی فەقیران سەرمایەکی بەهاری!**

لــە هۆنراوەی یەکەمــدا ڕەگەزدۆزی وشــەیی تەواو هەیــە لە بەینی هــەردوو «بــێ دار»دا، کە یەکەمیان بە بەســەی بێ مــاڵ و جێگەیت، دووەمیان بە بەســەی بەئاگایت. وە لە هۆنراوەی دووەمیشا ناتەواو هەیە لە بەینی «باغی» و «یاغی»ــدا. ئەم گۆڕینەوەی «ب» بە «ی»ــیە لە سەرەتای وشەکەوە، بووە بەهۆی دروستبوونی ئەو ڕەگەزدۆزییە ناتەواوە.

وەیا لە هۆنراوێکی تریا ئەڵێ:

**تا بڵێ فەرقی هەیە میهری من و ماهی فەلەک**

**لە سەرا تا بە سورەییا، لە سەما تا بە سەمەک!**

کە ڕەگەزدۆزی ناتەواو لەلایەکەوە لەبەینی «سەرا ـ سَرا» و «سەما ـ

سَما»دا هەیە، کە لە ناوەڕاستی وشەدا پیتی «ر»ی گۆڕیوەتەوە بە «م»، وە لە لایەکی تریشەوە لەبەینی «سەما ـ سما» و «سەمەک ـ سَمک»ـدا هەیە، کە لە دوایی وشـەدا پیتی «ا»ی گۆڕیوەتەوە بە «ک». دیارە لەم گۆڕینەوانە[دا] گوزارەکانیشیان جیا ئەبنەوە!.

ئەمجـا جوانیش کە لەتافەتەکەیـە، لە نیوە هۆنراوەکەی «نالی»ـــدا دەرئەکەوێ، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**کە ناچین لێرە، خۆشەچینی ماچین!**

لە «خۆشــەچینی ماچین»ــدا ئەم جوانییە دروست بووە، چونکە ئەوەبــوو وتــی: کە ئێمە بۆیە لەم شــوێنە ناڕۆین، چونکە هێشــووچنی ماچیــن. هەر لــەم کاتەدا ئــەوەش ئەگەیەنێ کــە بڵێ: ئێمــە بۆیە لەم شوێنە ناڕۆین چونکە خۆشە، چینی ماچین؛ کەواتە نەڕۆیشتنەکەمان لەبەر خۆشــیی ئەو شــوێنەیە. هەروەها لە جوانیدا ئەڵێ: **«ئەو ئاسکە لەولایە یا لەملایە؟!»**.

✾✾

**«لێچوون و لەوچوون ـ مُشَبّە و مُشبّەبە». «خواستن ـ إستِعارە»، کە ئەمانە لە هونەرە قسەییە ئاشکراییەکانن.**

لــە لێچوون و لەوچووندا ئەبێ شــتێک هەبێ کە ئەم دووە پێکەوە بنووســێنێ. جیایــی لەبەینی خواســتن و بــە «وەک یەک ـ تَشْبیە»ـــدا ئەوەیــە: کە لە خواســتندا یەکێ لە ئــەوزاری هەرە بەرزی تەشــبیهەکە ئەوتــرێ و هیچی تــر؛ وەیا ئەگــەر لێچوونەکە نەوترا، وەیا لــە دڵا نەبوو، ئەبــێ بە خواســتن، وەکوو لــەم هۆنراوانەی «نالی»ـــدا دەرئەکەوێ کە ئەڵێ:

**عاشـقی بـێ‌دڵ دەناڵـێ مەیلـی گریانـی هەیە**
**بێ‌شـکە هەورەتریشـقە تـاوی بارانـی هەیـە**
**چاوی من دەم‌دەم دەڕێژێ ئاوی ساف و خوێنی گەش**
**تـا بڵێن دەریایی عوممـان دوڕڕ و مەرجانی هەیە!**
**ڕوومەتی خۆی دادەپۆشێ ئەو بە پێچی زوڵفەکەی**
**تا بە ڕۆژیش پێی بڵێن شەمعی شەبوستانی هەیە!**
**ئاسمانی حوسنی مەحبووبم لە ئەبرۆ و زوڵف و ڕوو**
**دوو هیلال و دوو شـەو و دوو ماهـی تابانی هەیە!**

لـەم پارچەیـەدا هەمـوو جـۆرە هونەرێکـی ئەدەبـی هەیـە؛ لـە هۆنراوی یەکەمدا تەشـبیهی گریانی عاشـقی کردووە بە هەورەتریشقە، لێکچـوون ـوَجْه شَـبَه‌ـ لەبەینی ئەو دووەدا ناڵیـن و دەنگەدەنگەکەیە. هەورەتریشـقە: لەوچوونـە، گـریان: لێچوونـە، ناڵیـن و دەنگەدەنگ: لێکچوونە ـوَجْه شَبَه‌ـ.

لـە هۆنـراوی دووەمـدا، دوڕڕ و مەرجان: لەوچوونە، ئـاو و خوێن: لێچوونە، سپێتی و سووری: لێکچوونە ـوَجْه شَبَه‌ـ.

لە هۆنراوی سـێیەمدا، شـەمعی شەبوسـتان: لەوچوونـە، ڕوومەت و زوڵـف: لێچوونـە، گەشـیی و ڕووناکی لەبەینی ڕوومەت و شـەمعا، تاریکی و ڕەشی لەبەینی زوڵف و شەبوستانا: لێکچوونە.

لـە هۆنراوی چوارەمـدا، هیلال و شـەو و ماه: لەوچوونـە، ئەبرۆ و زوڵف و ڕوو: لێچوونە، کەچی و ڕەشی و ڕوناکی لەبەینیانا: لێکچوونە.

هەروەهـا لەم هۆنراوەی چوارەمەدا هونەرێکی‌تر[ی] بەدیعیی هەیە کـە پێی ئەڵێن: «لَفّ و نَشْـر». لەفف و نەشـرەکەش ڕێکـە؛ وەکوو لە نیوەهۆنراوەی دووەمیا بە ڕێکوپێکی هیلال بۆ ئەبرۆ ئەچێتەوە ـکە ئەم ئەبـرۆوە لە نیوەهۆنراوەی یەکەمدا لە پێشـەوە وتراوە ـ. شـەو بۆ زوڵف، کـە لە شـوێنی خۆیانا لە پایـەی دووەمدان، ماه بـۆ ڕوو، کە لە ڕیزی سێیەمدان.

ئەمە کە باس کرا، دیارە بۆ ئەو جۆرە «وەک‌یەک ـ تَشْبیه»ـەیە کە لە هەموو جۆرەکانی بەهێزترە؛ واتە: بۆ وەک‌یەکێکە کە تەنها لێچوون و لەوچوونـی تێدا بوترێ، «ئەوزار ـ أدات، ئالەت» و لێکچوونی تیا بەکار نەهێنرێ. خۆ ئەگەر مەبەسـت پایەی هەموو وەک‌یەکەکە بێت، ئەبێ چوار شـتی تێـدا هەبێ؛ واتە: لەوچوون، لێچـوون، لێکچوون و ئەوزار. ئەوزار کە ئەداتە، لە کوردیدا وەکوو: «وەک، گۆیا، چما، ئاسا»یە.

«وەک‌یەک»ـێ کە هەر لێچـوون و لەوچوونی تێـدا بوترێ، وەکوو ئـەو وێنانە کە هێنامانـەوە. ئەوەی کە ئەوزاریشـی لەگەڵ بێ، وەکوو ئەم هۆنراوەی «سالم» کە ئەڵێ:

**وەک پیری سـاڵخوردە خەمە داری «پیرمەسوور»**
**مەشـغووڵی لەغزشـە هەمەجـا، پای تا بە سـەر!**

وەیا ئەڵێ:

**درێغا! «صَعْوة» ئاسا سـەیدی چەنگی شاهبازێکم**
**زەدەی تیری نیگاهی جادووانەی عیشوەسـازێکم!**

لە هۆنراوەی یەکەمدا تەشـبیهی داری پیرمەسـوور ـکە شەخسێک

بووە لە شـاری سـولەیمانی-ی کردووە بە پیرێکی کۆماوەی کۆنەسـاڵ؛ لێکچـوون: پەککەوتوویێتـی و بێکەڵکییە، ئەوزاری وتووە کە وشـەی وەک»ـە.

لـە هی دووهەما تەشـبیهی خۆی کـردووە بە «فیسـقە» کە مەلێکی پچووکـی بێهێزی وایە، نـەوەک «باز»، بەڵکوو زۆر باڵـدار ڕاوی ئەکا. لێکچـوون: بێهیزییـە، ئەو چۆنە لـە بەردەسـتی بازا، ئەمیش وایە لە بەردەستی یارا، ئەوزارەکەش وشەی «ئاسا»یە.

ئـەوی کە هەم ئـەوزار[ی] هەبێ و هـەم لێکچوون، وەکـوو ئەڵێ: **«باسکی وەک پۆلا وایە لە قایمیدا!»** پۆلا: لەوچوونە، باسک: لێچوونە، قایمی: لێکچوونە، وشەی «وەک»: ئەوزارە.

«وەک یەک» جۆرێکی تریشی هەیە کە ئەوزار نەوترێ، بەڵکوو هەر لێچـوون و لەوچـوون و لێکچوونی تێـدا بوترێ، ئەمـەش وەکوو ئەڵێ: **«ڕوومەتی مانگە لە جوانیدا!»**. ڕوومەت: لێچوونە، مانگ: لەوچوونە، لە جوانیدا: لێکچوونە. ئیتر ئەوزار نەوتراوە.

ئەمجا وێنە بۆ «خواستن»ـیش وەکـوو ئەم هۆنراوەی «بێخود»، کە ئەڵێ:

**کە دەرکەوت مانگی دوو حەفتە سەراپەردەی منەووەر کرد**
**بە عینوانی سـەفا دەسـتی جەفای لەو نـاوەدا دەرکرد!**

«مانگـی دوو حەفتـە» مانگـی شـەوی چواردەیە، هۆنـەر هێناویە خواستوویە بۆ ڕوومەتی خۆشەویستەکەی. وەکوو سەیر ئەکەین هەموو ناسـاندنێکی خواسـتن ئەم هۆنراوە ئەگرێتەوە، چونکە ئەوەبوو وترا: لە

خواستندا یەکێ لە ئەوزاری بەهێزی تەشبیهەکە ئەوترێ و هیچیتر؛ واتە یا لێچوون، یا لەوچوون، ئیتر ئەوانیتر ناوترێن.

لێرەدا لەوچوون کە مانگی دووحەفتەیە، وتراوە. لێچوون ـکە روومەتی یارە ـ، لێکچوون ـکە رووناکیی و پرتەوە ـ نەوتراون. دیارە ئەوزاریش هەر نەوتراوە.

❋❋❋

## گۆشە، درکە ـ کینایە. خوازە، خوازمان ـ مەجاز

گۆشە، ناوە بۆ گوزارشتی وشەیەک کە ئەو وشەیە خۆی گوزارەیەکی تایبەتی و راستەقینەی هەیە، هەر لەو کاتەدا گوزارەیەکیتریشی هەبێ کە رستەکە وا بگەیەنێ ئەو گوزارەیە پێویست ـ لازمی وشەکە بێت، ئەمجا تۆ مەبەستت ئەو پێویستە بێت، لەگەڵ ئەوەدا دروست بێ و بگونجێ گوزارە ئەسڵییەکەشت مەبەست بێت. ئەم دروستبوونەش لەبەر ئەوەیە: کە نیشانەیەک لەناوا هەیە بۆ ئەوە کە بەرهەڵستت نەکا بۆ ئەو گوزارە ئەسڵییە. وەیا بە واتایەکیتر: نیشانەیەکی تایبەتی نییە بۆ ئەوە کە هەر ئەبێ گوزارە ئەسڵییەکە مەبەست بێت.

لێرەدا لەگەڵ «خوازە»دا جیا ئەبێتەوە، واتە: ئەگەر نیشانە هەبوو بۆ ئەوە کە تۆ گوزارە ئەسڵییەکەت مەبەست نەبێ، ئەوە ئەبێ بە خوازە، ئەگەر ئەو نیشانەیە نەبوو، ئەبێ بە «گۆشە». وەکوو لەم هۆنراوەی حەمدی ساحێبقڕاندا ئەمەمان بۆ دەرئەکەوێ، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**ئەم بێشەیە بە خاڵیی مەزانن زەمانێ بێ**
**گوێ بگرە جا لە نەعرەیی شێری ژیانمان!**

تەماشا ئەکەی لێرەدا هۆنەر وشەی «بێشە» و «شێر»ی بەکار هێناوە، کە بێشــە جەنگەڵە و شــێر ئەو گیانلەبەرە ئازا [و] بەناوبانگەیە، ئەمانە گوزارەی ئەســڵیی وشــەکانن، هەر لەم کاتەشــا ئەگونجێ مەبەست بە بێشــە: وڵات، وەیا: نەتــەوە؛ وە بە شــێر: پیــاوی ئازا بێ، کــە ئەمانە لە شــێوەی دارشتنی رستە و هۆنراوەکەدا پێویســتیی گوزارە ئەسڵییەکەن. هیچ نیشانەیەکیش نییە بۆ ئەوە کە مەبەست گوزارە ئەسڵییەکە بێت و لە لازمەکە دووری بخاتەوە. کەوابوو، ئەمە بوو بە «گۆشە ـ کِنایَە» و بوو بە یەکێ لە هونەرەکانی بەیان.

***

**ئەبێ ئەوەش بزانرێ: کە «گۆشە» لەسەر سێ جۆرە:**

جۆرێکیان مەبەســت زاتی شــتە، وەکوو ئەڵێ: **«باڵایەکی ڕاست و هۆشێکی تەواوی هەیە!»**. باڵای ڕاســت و هۆشــی تەواو، ئەمە درکەیە لــە ئادەمیزاد. لێرەدا چەند ســیفەتێک ئەوترێ کە بە هەموویانەوە زاتی مرۆڤ داوا ئەکەن. ســیفەتەکان بە جیاجیایی دەســت ئەکێشن بەسەر بێجگە لە ئادەمیزادیشا؛ چونکە وەنەبێ هەر ئادەمیزاد باڵای ڕاست بێ بە تەنها، وەیا هەر ئەو هۆشــی هەبێت بە تەنها، بەڵکوو بێجگە لەویش هەر هەیە کە ئەم ســیفەتەی تێدا هەبێ، بەڵام کە هەردوو ســیفەتەکە درانــە دەم یــەک، تەنها زاتــی ئادەمیزاد ئەگرێتــەوە و هیچیتر، چونکە شتێکیتر، وەیا گیانلەبەرێکیتر نییە وەکوو ئەم، ئەم دوو وەسفەی تێدا هەبێ.

جۆرێکیتریان مەبەست سیفەتی شتە. ئەمیش دیسان ئەو سیفەتە

یا زوو پیاو وەری‌ئەگرێ، یا زوو بۆی ناچێت و پێویستی بە بیرکردنەوە هەیە. ئەوەی کە زوو بۆی بچێ، وەکوو ئەڵێ: **«کابرا دەست بڵاوە!»** ئەمە درکەیە لە سەخاوەت و نان بدەیی ئەو کەسە. ئەوەشیان کە پێویست بە وردکردنەوە بێت، وەکوو ئەوە باسی ماڵێک ئەکرێ کە ئازۆخە و داسەوێڵەیەکی زۆریان ئەبێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشا زوو دوایی دێت، پێیان ئەڵێن: **«ماڵێکی بە ئەرکن!»**. ئەمە گۆشەیە لە میوانداریکردنیان، چونکە لە ڕستەکە ئەوە دەرئەکەوێ: کە ئەو ئازۆخەیە زوو دوایی دێت؛ ئەم زوو دوایی‌هاتنەی لەبەر زۆر لێخواردنیەتی، زۆر لێخواردنەکە لەبەر زۆری میوانە کە ڕوویان تێ ئەکا و دەرخواردی ئەدەن.

ئەم وێنەیە بۆ دروستکردنی سیفەتێک بوو بە گۆشە بۆ مەوسووفێک، بەڵام لە ڕێگایەکی دوورەوە.

جۆری سێیەم درکەیە لە هاوگری ـ نیسبەت؛ واتە کۆمەڵە سیفەت و گوزارەیەک نیسبەت ئەدەی بە یەکێک، بەڵام لە ڕێگای درکەوە. ڕێگای درکەکەش ئەمەیە: کە ناوی کەسەکە ناهێنی، بەڵکوو شتەکان نیسبەت ئەدەیتە لای شتێک کە ئەو شتە هی کەسەکەیە، دیارە موبالەغە و هاشە لەمەدا زۆرتر ئەبێ، تا ئەوە کە ڕاستەوڕاست سیفەتەکان بکەی بە هی کابرا خۆی!.

ئەمە و دیسان: جیایی ئەم جۆرەش لەگەڵ دوو جۆرەکەی‌ترا، واتە لەگەڵ درکە لە زات و درکە لە سیفەتدا، ئەوەیە: کە لەماندا درکەیە لە تاکەتاکەی گوزارەکە، بەڵام لەم جۆرەدا درکەیە لە هەموو گوزارە کۆمەڵییەکە. جا وێنە بۆ ئەم جۆرەشیان وەکوو ئەڵێ: **«پیاوەتی و نانبدەیی و ئازایەتی، بوون بە مەشخەڵێک و وان بەسەر کۆشکەکەی**

**سەرداری بۆکانەوە!»**. ئەو کەسە کە ئەمەی وتووە، مەبەستی ئەوەیە ئەم کۆمەڵە سیفەتانە بدا بە یەکێک، بەڵام لەبەر ئەوە کە نایەوێ ناوی کەسەکە بێنێ، ئەیانهێنێ ئەیانکا بە مەشخەڵێک و ئەیانکا بەسەر کۆشکی ئەو کەسەدا. لەمەوە ئەوە دەرئەکەوێ کە مادام ئەم شتانە بەسەر کۆشکی ئەو کەسەوە بوون، ئەوە ئەگەیەنێ: کە ئەمانە هەموو لە کەسەکە خۆیدا هەن. ئەو کەسەش «عەزیزخان» و هەر ئەو بووە کەوا بەو جۆرە بە سەرداری بۆکان ناوبانگی دەرکردووە.

**

ئەم باسە کە بۆ «گۆشە» کرا، هەر چەشنی باس و ناساندن ئەبێ بۆ «خوازە»ش، ئەوندە هەیە: لە خوازەدا نیشانەیەکی تایبەتی هەیە بۆ ئەوە کە گوزارە ئەسڵییەکە مەبەست نەبێت؛ وەکوو لەم هۆنراوەی «سالم»ـدا ئەمەمان بۆ دەرئەکەوێ، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**شێر لە بێشە دەرپەڕی غوڕڕش کونان، نەعرەزەنان**
**دەست بە خنجەر، ڕوو بە ڕوو ئەیدا لە زومرەی دوژمنان!**

وشەی «شێر» گوزارەیەکی ئەسڵیی هەیە و یەکێکی خوازەیی؛ ئەسڵییەکە: دڕندەکەیە، خوازەیییەکە: پیاوی ئازایە. لێرەدا مەبەست پێخوازەییەکەیە، ئەو نیشانە تایبەتییەش بۆ ئەوە کە خوازەییەکە بێ، ئەوەیە کە ئەڵێ: **«دەست بە خنجەر، ڕوو بە ڕوو ئەیدا لە زومرەی دوژمنان»**. دیارە دەست دانە خنجەر لە کردەوەی ئادەمیزادە نەوەک لە هی شێرێک کە جیایە لە ئادەمیزاد!. ئەم نیشانە تایبەتییە وشەی «شێر» لە هۆنراوەکەدا ـکە باسەکەی ئێمەیەـ ئەبڕێ بەسەر لازمەکەدا

و دووری ئه‌خاته‌وه له گوزاره ئه‌سڵییه‌که.

هه‌روه‌ها ئه‌بێ ئه‌وه‌ش بزانین: که «خوازه»ش دوو جۆره: یه‌کێکیان «ژیریـی ـ عه‌قڵی». یه‌کێکیان «زمانیی ـ لوغه‌وی». ژیرییه‌که ئه‌وه‌یه: که نیسبه‌تی شتێک بدرێته لای شتێکی‌تر، که ئه‌م نیسبه‌ته له ڕاستیدا حـه‌ق نییه له‌و بدرێ. وه‌کوو ئه‌ڵـێ: **«کۆشکێکم دروست کرد»**. ئه‌مه ڕاسـته ئه‌و که‌سـه که ئه‌مه ئه‌ڵێ بـووه به هۆ بۆ دروسـتکردنه‌که، به‌ڵام ئه‌سـڵی دروسـتکردنه‌که کرێکاره‌کان دروسـتیان کردووه!. جا ئه‌م جۆره خوازه‌یـه پێـی ئه‌وترێ: خوازه‌ی ژیری؛ چونکـه ژیرییه‌که ئه‌م فه‌رمانه ئه‌دا.

زمانییه‌کـه ـکـه لوغه‌وییه‌که‌یه‌ـ ئه‌وه‌یه: که وشـه‌که له کاتی دانانیا بۆ شـتێکی تایبه‌تیـی دانراوه. وه‌کوو ئه‌وه له کاتـی مه‌تحکردنی پیاوێکا که قسـه‌ی لێوه ئه‌کـرێ، ئه‌ڵـێ: **«شێرێکم چاوپێکه‌وت!»**. دیاره ئه‌بێ په‌یوه‌ندی و نیشانه ـقه‌رینه‌ـیه‌ک هه‌بێ له به‌ینی گوزاره بۆدانراوه‌که‌دا و لـه به‌ینـی گـوزاره خوازه‌ییه‌کـه‌دا. وه مه‌به‌سـت بـه‌م په‌یوه‌ندییه‌ش په‌یوه‌ندییه‌کـی «حسّی»ـیه لـه به‌ینـی هـه‌ردوو گوزاره‌کـه‌دا، نه‌وه‌ک په‌یوه‌ندی ڕاسته‌قینه که جیا نه‌بوونه‌وه‌یه!.

له وێنه‌که‌ی ئێمه‌دا په‌یوه‌ندییه‌کی حیسسی هه‌یه له به‌ینی ئه‌و پیاوه و شێره‌که‌دا ـکه زات و به‌جه‌رگیی هه‌ردوو لایانه‌ـ. نیشانه‌یه‌کیش هه‌یه که نایه‌ڵێ گوزاره ئه‌سڵییه‌که مه‌به‌ست بێت، ئه‌و نیشانه‌یه‌ش باسکردنی پیاوێکی ئازایه و نه‌بوونی شێرێکی ڕاسته‌قینه له‌و شوێنه‌دا. وه‌یا ئه‌وترێ: **«شێرێکم چاوپێکه‌وت له حه‌مامدا!»** نیشانه‌که حه‌مامه‌که‌یه، چونکه شێری ڕاسته‌قینه ناچێته حه‌مامه‌وه.

ئەمـە و دیسـان جیایـی لـە بەینـی «خـوازەی بەرەڵا ـ مەجـازی مورسـەل» و خواسـتندا ئەوەیـە: کـە ئەگـەر پەیوەندی لـە بەینی دوو شتەکەدا لێکچوون ـتَشبیه و مُشابه ـ بوو، ئەوە خواستنە، ئەگەر غەیری لێکچـوون بوو، خوازەیە. خوازەی بەرەڵاش ئەوەیە: کە نەبەسـترابێ بە هیچ پەیوەندییەکەوە.

لـە وێنەیەکـی وەکـوو ئـەوە کـە ئەوتـرێ: **«فلان بەدەستە»** وەیا **«دەستێکی درێژی هەیە!»** کە تۆ «دەست» بۆ دەسەڵات بەکار ئەهێنی. لە بەینی دەست و دەسەڵاتدا، پەیوەندیی وەنەبێ لێکچواندنی دەست بـێ بـە دەسـەڵات، بەڵکوو دەستەکە بایسـێکی هۆییـە ـعیللەتێکی سـەبەبییە بۆ دەسـەڵاتەکە ـ، چونکە بەهۆی دەسـتەوەیە کە کوشتن و بڕین و هەموو جۆرە فەرمانێک دروست ئەبێ. ئەگەر خۆ مەبەستیش ئەوە بێ کە «دەست» وەربگیررێ بۆ دەسەڵات و مەبەستت بە دەست، دەسـەڵات بێ، ئەوە لێکچوون هەیە ـکە هێزە لە هەردوو لایاندا ـ ئەوە ئەبێ بە خواستن.

کەوابوو، هەر یەک وشـە ئەتوانرێ گەلێ جار بە خواستنیش دابنرێ و بە خوازەش!. دیارە ئەمە نیاز و ئیعتیبارات ئەیگۆڕێ.

❊✾❊

# گرێ‌لێدان، گرێ لێدراو (تَعْقید، مُعَقَّد)!

یەکێکی‌تر لە هونەرە قسەییە ئاشکراییەکان «گرێ‌لێدان»ـە، کە ئەمە پێچەوانەی ئاشکرایە!.

گرێ‌لێدان دوو جۆرە: گرێ‌لێدانی وشەیی ـکە پێی ئەڵێن: «تعقید»ی «لَفظی»ـ. گرێ‌لێدانی گوزارەیی ـکە پێی ئەڵێن: «تعقید»ی «مَعنوی»ـ.

گرێ‌لێدان، وەیا گرێ‌لێدراوی وشەیی ئەوەیە: کە پێچە و دەورەیەک لە وشەکاندا هەیە، وەیا «ڕاناو ـ ضَمیر»ـێکی زۆریان تیایە ـواتە لە ڕستەکەدا ـ، کە بەو هۆیەوە گوێگر وەیا خوێنەر ناتوانێ بە ئاسانی گوزارەکە وەربگرێ. وەیا ئەمانەی هیچ تێدا نییە، بەڵام جۆرە وشەیەکی وا ئەکەوێتە ناویەوە کە گرانە لەسەر گوێ و چەشەی لێ دوور ئەخاتەوە. وەکوو ئەگەر چاوپۆشیی لە یاسای «نەحوی»ـش کرا، دیسان گرێ‌لێدراوی وشەیی هەر پەیدا ئەبێ!.

گرێ‌لێدان، وەیا گرێ‌لێدراوی گوزارەییش ئەوەیە: کە نووسەر وەیا هۆنەر، دێنێ جۆرە وشە و ڕستەیەکی وا ئەخاتە کار کە بە تەواوی خۆی دوور ئەخاتەوە لە گوزارە ڕاستەقینەکانی و بەڵکوو مەبەستی هەر گوزارەی خوازەیی ئەبێ!.

وا دیارە گەلێ جار هۆی هەرەگەورە بۆ گرێ‌لێدراو لە گوزارەییدا ئەوە ئەبێ: کە نیازەکە لە دڵا بە تەواوی دانەچەقیوە، بۆیە وشەکان بە شێوەیەکی گرێ‌لێدراو دێنە ناوەوە!؛ واتە: هۆنەر وەیا نووسەر لەپاش

ئەوە کە شتەکەی وت، ئەو وەختە ئەو گوزارەیە کە ئەیەوێ تێی ئەخا!.

لە شێوەی نووسیندا دوو جۆرە نووسین هەیە، کە ئەو نووسینانە دوو چەشنە ناو بۆ نووسەرەکە پەیدا ئەکەن: یەکێ نووسەرێکی سەرەتایی وەیا تازە نووسەر، کە بە واتەیەکی‌تر پێی ئەڵێن: «مُبتدِئ»ـی «کاتِب». یەکێ نووسەرێکی لێ بووەوە وەیا کۆن، کە بە واتەیەکی‌تر پێی ئێژن: «کاتب»ـی «مُنتَهي».

تازەنووسەر ئەوەیە: لەپێشا وشە ئەدۆزێتەوە ئەمجا گوزارەی تێ ئەخا. نووسەرە لێبووەوەکە: لەپێشا گوزارە ئەدۆزێتەوە ئەمجا وشەی بۆ دائەنێ. ئەو نووسەر وەیا هۆنەرە، با نووسەرێکی کۆنیش بێت، مادام هات لە پێشا وشەی دۆزییەوە و ئەمجا گوزارەی بۆ دانا، ئەوە لەم شوێنەدا ناوی تازەنووسەری وەرگرت، لە گرتنی ئەم ڕێگایەدا ئیتر بەچاو ئەوەوە گرێ‌لێدراوی گوزارەیی پەیدا ئەبێ!.

ئەم مەرجەش لێرەدا نییە: کە هەرکە تازە نووسەر بوو، ئەبێ نووسەری لێبووەوەش بێ؛ بەڵام مەرجە: هەرکەسە نووسەری لێبووەوە بوو، ئەبێ تازەنووسەریش بووبێ. کەوابوو، ئەو نووسەرە لێبووەوە، کە بە گرتنی ڕێگای تازەنووسەری، لە نووسەری لێبووەوەیی خۆی نەکەوت.

**

وێنە بۆ ئەوە کە لە گرێ‌لێدراوی وشەییدا پێچە و دەورە لە وشەکانا هەبێ، ئەوەی کە «خاکی» ئەڵێ:

**قبووڵ نابێ بە هیچ بابێ کە کوڕ دا بێ لە جێ بابێ**

**ئەگەر سوختە مەلای جێ‌هێشت، مەلا ملکەچ نەبێ نابێ!**

**ئەمە مەعلوومە لای هەرکەس، چ نادان و چ دانا بێ**
**کە دابـــوون کاری نادانە، کەســـێ دانابێ، دا نابێ!**

بەڵـێ ئەم هۆنراوانە لـەبارەی ڕەگەزدۆزییەوە بەرزتـر پایەیان هەیە، بـەڵام لەم ڕووەوە کە پێچەیەک لە وشـەکانا پەیدا بووە، گەیاندوویەتە پایەی گرێلێدراوی وشـەیی؛ چونکە لە وشـەکانی نابێ، بابێ، دا بێ، نادان، دانا، دانابێ، دا نابێ» بە جۆرێ سەروبنی کردوون و هەریەکەی بـە گوزارەیەک داناوە، کە بووە بەهـۆی گرێلێدراو تیایانا. ئەوەندە هەیە ئەگەر بێت و لەم شـوێنەدا ڕەگەزدۆزییەکە و گرێلێدراوەکە بەرانبەری پـێ بکرێـن، جوانیی ڕەگەزدۆزییەکـە هیچ ڕەخنەیـەک نایەڵێتەوە بۆ گرێلێـدراو و ئەو گرێلێدراوە هیچ نایەتە بەرچـاو. بەڵام لەم هۆنراوەدا کە هۆنەر ئەڵێ:

**بـــێ هـــەوڵ و تەقەلا لە هـــەوا پـــارە ئەبارێ**
**گیرفانی هەموو چۆڵ و چیا پڕ بوو لە درهەم!**

گرێلێدراویـی بـە تەواوی ئاشـکرایە، چونکـە هۆنـەر لەباتی بەفر و باران، پارە و درهەمـی بـەکار هێنـاوە، وە بـۆ ئـەوە ڕەگەزدۆزییەکـی گوزارەیـی ـکە ئەم ڕەگـەزدۆزی گوزارەییەش بـەلای زانایانی بەدیعەوە شوێنی بڕواپێکردن نییە ـ بەهۆی هەوا و باران و چۆڵ و چیاوە دروست بکا، هێناویە لە هەواوە گیرفانی دەشت و کێوی پێ پڕ کردووە؛ دیارە ئەم ڕەگەزدۆزییە بێبناغەیە دەسـتی هۆنەری ڕاکێشاوە بۆ ئەم گرێلێدراوی وشەییە.!..

وەیا ئەم گرێلێدراوییە بەهۆی ڕاناو و هێما زۆرییەوە دروست ئەبێ،

وەکوو هۆنەر ئەڵێ:

**عەتارد، موشتەری، مەرریخی دەورانە**
**نیگاری من لە ناویانا نیشانەی سونعی سوبحانە**
**ئەگەر ئەم بێ، وەیا ئەو بێ، وەیا جوزئێکی ئەم ئەو بێ**
**وەیا هیچ یەک نەبێ هەر خارجی ئەوسافی ئینسانە!**

سەیر ئەکەین لە یەکەم نیوە هۆنراوەی دووەمدا ئەم هەموو «ئەم» و «ئەو»ە کە ڕاناو و هێمایە و هێناویە بە تەواوی گرێلێدراویی لە هۆنراوەکەدا دروست کردووە!..

وەیا گرێلێدراوێ کە پەیدا ببێ بەهۆی وشەی گوێ پێ ڕانەهاتووەوە، وەکوو هۆنەر ئەڵێ:

**چ خۆشە من وەکوو تانجی بنووزم**
**ئەتۆش هەروەک غەزاڵەی بەر هەراکە!**

وشەی «تانجی» و «بنووزم» بە خۆ ڕەوابینین لە پارچەیەکی ئەدەبیدا، بەبێ شک گوێ پێی ڕانەهاتووە و چەشە سڵی لێئەکاتەوە!. ئەمە بێجگە لەوە کە وشەی «بنووزم» ئەو چەوتییەشی تێدا هەیە کە نەهاتووە لە باتی «بنووزێنم، بنووزم» بوترێ؛ پێویستیی هۆنراویش ئێجگار بەم جۆرە ڕێگا نادا بۆ ئەم چەشنە دەستکارییانە!.. وەکوو ئەمە هەیە، ئەو جوانییەش لە ڕستەی «بەر هەراکە»دا هەیە، کە ئەگونجێ بڵێ: تۆیش وەکوو غەزاڵی بەر هەرا و قووڵەکە وایتە؛ چونکە لە دەستووری ڕاوکردنا سەرڕاو و بنڕاو هەیە، ئەبێ بە هەراوهوریا. ئەشگونجێ بڵێ: تۆیش وەکوو غەزاڵی «بەڕ ـ وشکانی» بۆ خۆت هەڕاکە و دەرچۆ. بەڵام ئەبێ

ئـەوەش بزانیـن کە غەزاڵ هەر لە وشـکانی ـ بەرِدایە، خـۆ لە دەریادا نییە!!.

وەیا پەیدابوونی گرێلێدراو بەهۆی چاوپۆشیکردن بێ لە «دات»ـی نەحوی، وەکوو ئەم هۆنراوەی «زێوەر» کە ئەڵێ:

**عـــەرەق نییە لە عالەمـــا، کە لابەرێ لـــە دڵ غەما**
**بەغەیری قەترە عارەقێ لە ڕووت کە دێتە خوارەوە!**

لە نیوەی یەکەمی هۆنراوەکە وشەی «دڵ» زەرفە، واتە: شوێنی شتە، وشەی «غەم» مەزرووفە، واتە: ئەو شتەیە کە ئەکرێتە ناو دەفرێکەوە. وای لـێ دێتەوە: کە دڵ دەفرێکە و غەمی تێدایە. کەچی ئەم هێناویە دەفری لە شـوێن ئەو شـتە بەکار هێناوە کە ئەکرێتـە دەفرەکەوە، واتە: زەرفـی لە جێـگای مەزرووف بـەکار هێنـاوە و مەزرووفەکـەی لەباتی زەرفەکە بەکار بردووە. لەباتی «لە دڵا غەم» لە «دڵ غەما»ی وتووە!..

بەڵێ، لە پێویسـتیی هۆنراودا ئەم جۆرە شـتانە ڕێـگا دراون، بەڵام ئێمە وێنەمان بۆ پێویسـتیی هۆنراو نییـە، وێنەکەمان بۆ گرێلێدراوە، کە ئەو پێویستییە ئەم گرێلێدراوییەی دروست کردووە!..

❀❀

وێنە بـۆ گرێلێدراوی گوزارەییش وەکوو لـەم هۆنراوەی «بێخود»دا کە ئەڵێ:

**غەزالی ئاگرین وەختێ کە بەرخی ئاســمانی گرت**
**نیهالی قامەتی ڕۆمی لەگــەڵ زەنگی بەرابەر کرد!**

مەبەسـت بـە «غەزالـی ئاگرین» کـوورەی «خۆر»ە، بـە «بەرخی

ئاسمان» بورجی «حەمەل»ــە، بە ڕۆمی «ڕۆژ» و بە زەنگی «شەو»ە!. واتە کاتێ ڕۆژ گەیشــتە بورجی حەمەل، شەو و ڕۆژ بەرانبەر وەستان و بوون بە ئەندازەی یەک!!..

وەیا «مەولەوی» ئەڵێ:

**دڵــەی خــەم خەیــاڵ خــولاوردەوە[1]**

**مەعــدووم هەم هەوای زەهاو کەردەوە!**

لێـرەدا مەولەوی ئەوەندە بــە وردی چووەتە ناویــەوە، هۆنراوەکە لە گرێلێدراویش دەرچووە و بووە بە «لۆتەر، مەتەڵ ـ موعەمما»!.

گوزارەی ڕواڵەتی هۆنراوەکە ئەوەیە کە ئەڵێ: دڵ ـکە مەبەستی دڵی خۆیەتــی ـ و لــە دڵیی کەوتووە و بووە بە پارچەیەک خەم و ئەندێشــە، ســووڕی خواردەوە و مەیلی کرد بە لای شتێکیترەوە ـکە زەهاوە ـ لەبەر ئەوە کە وشــەی «مەعــدووم» نازناوی خۆیەتی لە هۆنــراودا، ئارەزووی زەهاوی کەوتە سەر.

بــەڵام گوزارەکەیتری کە گرێلێدراوەکەی دروســت کــردووە و بووە بە مەتەڵ و مەتەڵەکەش بە ناوی «محمود»ەوە دەرئەچێ، ئەوەیە کە:

وشەی «خم» خول بخواتەوە ئەبێ بە «مخ»، لەم خول خواردنەوەیدا خاڵەکەی ئەکەوێ ئەبێ بە «مح»!.

نیوە هۆنراوی دووەم کە ئەڵێ: «معدوم» و ناوی هۆنراوەیی خۆیەتی، مەبەســتەکەی ئەوەیــە: کە «مع، دوم» واتە لەگەڵ وشــەی «دوم»، کە

---

١. [«جۆش ئاوەردەوە» (نوسخە)].

ئەمیش خول بخواتەوە ئەبێ بە «مود»، وشەی «مح» لە پێشیەوە بێ، ئەبێ بە «محمود»!!...

❋❋

بەرانبەر بە گرێ لێدراو «ئاشـکرا ـ وضوح» هەیە. ئاشـکرا ئەوەیە کە هیچ‌یەک لە بەشەکانی گرێ‌لێدراوی تێدا نەبێ، نە وشەیی نە گوزارەیی.

وەکوو دیارە «ئاشکرا» ـ بەتایبەتی بۆ نووسین ـ بە نووسراوێک ئەڵێن کە ڕێ‌تێگەیشـتنی بۆ یەکێکی‌تر لێی نەگیرابێ و بە سـادەیی و ئاسانی وترابێ. بۆ وێنەی «ئاشـکرا» لە هۆنراودا، ئەم هۆنراوانەی «نووری شێخ ساڵح» نموونەیەکن بۆی لە کاتێکا کە لە باری ژیانی ئادەمیزادەوە ئەڵێ:

**لەنـاو شـەپۆلی غەمـا سـەرنگوون و بـێ ئارام**
**بـە کێوی سـەختی ژیانا بـە پێی، بـە چنگە ڕنێ**
**خەریکـی هەڵمەتـی سـەرکەوتنە بگاتە سـەرێ**
**لەپـڕ نشـێوی کولۆڵـی بـواری لـێ ئەتەنـێ**
**بە داوی یەئس و ئەلەم تار و پۆی لە ئێش و لە زام!**
**زەبوون و ڕێ هەڵەبووی دەشـتی چۆلوهۆڵی ژیان**
**شکسـتەباڵ و شـپرزەی پـلاری دەسـتی قـەدەر**
**کەسـێ نییـە کـە لـەلاوە دەسـێ بداتە دەسـی**
**یەکـێ نییـە خەفەتـی خـۆی لـەلا بدا بـە هەوا**
**بـە لایـەکا بیـەوێ لابـدا نییـە ڕەهبـەر!**

❋❋

**لــە بەردەمیــوە تــەم و مژ بــە ســوورەتێکی وەها**
**هەتاکــوو چــاو بــڕ ئــەکا توند و تــار و بیــم ئاوەر**
**ئــەدا بەلایــەوە بــۆی دێتــە پێکەنیــن بــە گەمە**
**هــەوڵ ئــەدا کــە بچــێ بیگــرێ و لــە ڕێ لادا**
**چلــۆن ئەگیــرێ تــەم و مژ بــە ناتەوانــی وەها؟!**

**

**ئەمانە؛ ئــەم تەمە، ئەم کێوە، ئەم شــەپۆلە، یەکێ**
**نموونەیەکــی هیــوان و لــە ڕێگەدایــە بــە بــار**
**کە چاوی پێ ئەکەوێ، بۆی ئەچێ بە ئیســتیعجال**
**بــەڵام هیلاکییــە، ئەممــا ژیانــی ئادەمیــزاد**
**بــە تەنگــەوە نییــە ڕاهاتــووە لەگــەڵ ئیهمــال**
**هەتاکــوو ئــەو دەمــە ئەینێنە گــۆڕی تیــرە و تار!**

لــەم هۆنراوانــەدا باســی ژیان ئــەکا، کە چــۆن ئادەمیزاد لــە ڕۆژی بێشکەی دارییەوە تا بێشکەی خاکیی لە کۆششدایە و لە ئاخرا بەهۆی تەقەلاکەیەوە بەسەر هەموو کۆسپێکدا زاڵ ئەبێ.

هەروەهــا یەکیەتی باس ـکــە بۆ پارچەیەکی ئەدەبــی مەرجەـ تیایا بەجێ هاتووە، واتە: یەکیەتی باس کە برێتییە لەوە: لە ســەرەتاوە قســە لە چییەوە ئەکا، لە دواییەکەشیا نابێ لەو شتە بپچڕێ؛ ئەویش لێرەدا هەر هەیە و لێی لا نەداوە. لە لایەکی تری ئەم کتێبەوە لە هەموو لایەکی ئەم هۆنراوانەوە قسە ئەکرێ.

# تیەڵکێش ـ تَضْمین

یەکێکی‌تر لە هونەرە قسەییەکان «تیەڵکێش»ـەـ. تیەڵکێش ئەوەیە: کە هۆنەر نیوە هۆنراو، وەیا هۆنراو، وەیا پارچەیەک لە هی یەکێکی‌تر ئەخاتە ناو هۆنراوی خۆیەوە و گەلێ جار ناوی هۆنەرە لێوەرگرەکەش ئەهێنێ، وەیا لەبەر بەناوبانگیی هۆنراوەکە هیچ باسی هۆنەرەکەی ناکا. جا ئەو هۆنراوە وەیا ئەو پارچەیە لە هەر زمانێکا بێت. وەکوو «مەولەوی» هۆنراوی ئەحمەدبەگی کۆماسی ـکە بە خاڵۆی کۆماسی ناو ئەبا ـ لەگەڵ هۆنراوی خۆیدا تیەڵکێش ئەکا و ئەڵێ:

**بوڵەنـد کـەر مەقـام دڵسـۆز ڕاسـی**[1]

**تەنزیلـەش فەردگـەل خاڵـۆی کۆماسـی:**

**(ڕۆی وەسـڵت هەر بیم ئەی ڕۆژە پێم بێ**[2]

**جـەو بۆنـە دایـم ڕۆڕۆ خدێـم بـێ!)**[3]

واتـە ڕۆژی یەکگرتنمـان ـکـە ڕۆژی وەسـڵت بوو ـ هەر ترسـی ئەم ڕۆژەی پـێ ئـەدام کە لێک جیا ببینەوە، لەبەر ئەوە هەمیشـە پیشـەم گریان و زاری و ڕۆڕۆ بوو.

وەیا «ناری» نیـوە هۆنـراوی تاهێربەگ ئەخاتە هۆنـراوی خۆیـەوە و ئەڵێ:

---

١. [«وە ڕاسی» (نوسخە)].

٢. [«ئەی ڕوە پێم بێ» (نوسخە)].

٣. [«جەو بۆنە هەر ڕۆ» (نوسخە)].

**لە ڕووی ئەو ماهەدا وەســتام بــە نەومیدی و خەمباری**
**(شکاندی پەنجەکەم تا من نەنووسم وەسفی ڕوخساری!)**

نیــوەی دووەم هی تاهێربەگە، بەڵام لەبــەر بەناوبانگیی هۆنراوەکە، ناری ناوی تاهێری نەهێناوە.

وەیا «سالم» هۆنراوی «حافظ» تیەڵکێش ئەکا لەناو هۆنراوی خۆیدا و ئەڵێ:

**ئەگەر ئومێدی دڵ بێنێتە جێ ماهی جیهانارا**
**(بە خال هندویش بخشم سمرقند و بخارا را)**

وەیا هەر باسی تیەڵکێشە و بەڵام بە ناوی «لێوەرگرتن ـ اِقتِباس» ئەو هۆنەرە ڕســتەیەک دێنێ ئەیخاتە ناو هۆنراوەکەیەوە و بەوە هۆنراوەکەی خۆی ئەڕازێنێتەوە. وەکوو «حەمدی ساحێبقڕان» سوورەی «الحمد»ی خستۆتە ناو چامەیەکیەوە و ئەمە یەکێکە لە هۆنراوەکەی:

**ئەی وجــوودت مەنبەعــی ئەلتافی «رَحْمــنِ الرَّحیم»**
**«مالِك»ی ئیعجازی شەمسی «یَوْمِ الدّین»ـم، ڕەحمەتێ**

❋❋❋

# تیل‌نیشان ـ تَلمیح

یەکێکی‌تر لە هونەرە قسەییەکان «تیل‌نیشان»ـە. تیل نیشان ئەوەیە: کە هۆنەر لە هۆنراوەکەی خۆیدا هێما بە داستان و کارەسات وەیا پەندێکی پێشینان ئەکا. وەکوو لە هۆنراوەکانی «پیرەمێرد»دا کە لە بارەی پەندی پێشینانەوە دایناون، هەموویان بەر هونەری تیل‌نیشان ئەکەون، وەکوو ئەڵێ:

**مێروولە کە خوا غەزەبی لێ گرت**
**کاتێکت زانی لەپڕ باڵی گرت!**
**ئەو پیاوە گەورەی کە خۆش باوەڕە**
**بەدەست خەڵکەوە مێکوتی ساوەرە!**

هۆنراوی یەکەم ئەو پەندە پێشینانە ئەگرێ کە ئەڵێ: «خوا غەزەبی لە مێروولە گرت، باڵی لێ پەیدا ئەکا!». هۆنراوەی دووەمیش ئەو پەندەیە کە ئەڵێ: «وەکوو مێکوتی ساوەر وایە، هەر دەمە بەدەست یەکێکەوەیە!»... وەویا «بێخود» ئەڵێ:

**هەرکەسە ئاوێنەگەر بوو وا مەزانە سکەندەریی زانی**
**هەرکەسە لێوی بەبار بوو وا مەزانە دڵبەریی زانی!**

کە ئەمە هێمایە بە داستانی ئاوێنەی ئەسکەندەر. داستانەکەش ئەوەیە کە ئەڵێ:

ئەسکەندەر بەهۆی زانایی ئەرەستووەوە ئاوێنەیەکی دروست کردبوو لەسەر مەنارەی ئەسکەندەریە، لە گوێی دەریادا دایینابوو، هەموو ئەو وڵاتەی تیا دیار بوو. شەوێک پاسەوانەکان نووستبوون، فەرەنگەکان هاتن ئاوێنەکەیان هەڵکەند و خستیانە ناو دەریاکەوە و شاری ئەسکەندەریەیان تێک دا، پاشان ئەرەستوو دەری هێنایەوە و سەرلەنوێ دروستیان کردەوە.

# توانجپۆشی ـ تَوْرِیَه

یەکێکی‌تر لە هونەرە قسەییەکان توانجپۆشییە. توانجپۆشی ئەوەیە: وشەیەک بێت دوو گوزارە بگەیەنێت: یەکێ دوور، یەکێ نزیک. بەهۆی نیشانەیەکی پۆشراوەوە گوزارە دوورەکە مەبەست بێت، وەکوو لەم هۆنراوەدا «شێخ ڕەزا» ئەڵێ:

**بۆ کەرێ ئیعلانی حەربی کرد لەگەڵمان شێخ حەسەن**
**سەیری کەن یاران چ گۆبەندێکی گێڕا ئەم کەرە!!**

وشەی «کەر» لەم شوێنەدا هەڵئەگرێ بە گوزارەیەکی دوور شێخ حەسەن بێت، هەڵئەگرێ ئەو کەرەش بێت کە گۆبەندی ئەم شەڕ و هەرایە لەسەر هەستاوە!.

# جوانیی بایس ـ حُسْن التّعْلیل

یەکێکی تر لە هونەرە قسەییە ئاشکراییەکان، وەیا بە واتەیەکی تر هونەری بەدیعی، جوانیی بایسە.

جوانیی بایس ئەوەیە: کە داوای «سەبارەت ـ عیللەت»ێکی بەڕێ و جێ ـموناسبـ بکرێ بۆ «خاسەوێژی ـ وەسف»ـی شتێک کە ئەو خاسەوێژییە لە ڕاستیدا خاسەوێژی شتەکە نەبێ؛ واتە غەیر حەقێقی بێ. بەڵام ئەو داواکردنە کە ئەکرێ بە شێوەیەکی جوان ـ لەتیف بێت. ئەم ئیشەش بۆ ئەوەیە کە بەلاغەت و جوانییەکی تر بدا بە هۆنراو وەیا ڕستەکە.

ئەم جوانیی بایسەش لەسەر چوار جۆرە، چونکە ئەو خاسەوێژییە کە ئەویسترێ بکرێ بە سەبارەت یا: هەیە و گومانی تێدا نییە و مەبەست ئەوەیە باسی سەبارەتییەکەی بکرێ، وەیا نییە و شوێنی گومانە، ئەویسترێ بوونیەتییەکەی بۆ دروست بکرێ و بهێنرێتە ناوەوە.

ئەو بەشەیان کەوا هەیە و گومانی تێدا نییە و مەبەست ئەوەیە باسی سەبارەتییەکەی بکرێ، یا: ئەمەتە بە ڕەوشت و عادەتیی نابێ بە سەبارەت، هەرچەندە لە ڕاستیدا خاڵی نییە لە سەبارەتییەتی ـ عیللیەت. وەیا ئەبێ بە سەبارەت، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە سەبارەتە بناغەییەکە ببێ بە سەبارەتێکی دووەمین، وە یا بڵێین غەیر حەقێقی بەپێی ئەو شوێنە.

ئەو بەشەشیان کە نییە و ئەویسترێ بوونیەتییەکی بۆ دروست بکرێ، ئەمیش ـواتە خاسەوێژییەکەـ یا ئەشێ و ئەگونجێ وەیا

ناگونجێ و ناشێ.

ئەمجا **بەشی یەکەم**، واتە ئەو بەشەیان کەوا خاسەوێژییەکە هەیە و گومانی تێدا نییە و مەبەست ئەوەیە باسی سەبارەتییەکەی بکرێ، وە بە ڕەوشت و بە عادەتیی نابێ بە سەبارەت، وەیا ناویستریێ بکرێ بە سەبارەت، هەرچەندە لە ڕاستیشدا خاڵی نییە لە سەبارەتییەتی، وێنەکەی وەکوو «ناڵی» ئەڵێ:

**هێند مونتەزری تۆ بوو هەتا چاوی سپی بوو**
**نەرگس کە لەسەر یەک قەدەم و دیدە چەقی بوو!**

سپێتی چاو بۆ نیرگس خاسەوێژییێکە و هەیە، بەڵام لە ڕواڵەتا سەبارەتییەکی بۆ دەرناکەوێ، هەرچەندە لە ڕاستیدا خاڵی نییە لە سەبارەت. هۆنەر هێناویە سەبارەتی بەوە هێناوەتەوە کە چاوسپیبوونەکەی لەبەر چاوەڕێ و تەماریی تۆیە. سەبارەتی ڕاستەقینەی ئەم خاسەوێژییە ـکە چاوسپیبوونەکەیەـ هەندە شتێکە کە خودی گوڵەکە دروستی کردووە، بەڵام ئەوە ناهێنرێتە بەرچاو، بەڵکوو سەبارەتەکە ئەکرێ بە چاوەڕێ و تەمارییەکە.

**بەشی دووەم**، واتە ئەو بەشەیان کە خاسەوێژییەکە هەیە و ئەبێ بە سەبارەت، بەڵام مەبەست ئەوەیە: کە شتێکیتر بکرێ بە سەبارەت بۆ ئەوە سەبارەتە بناغەییە کە ببێ بە سەبارەتێکی دووەمین، وەیا غەیر ڕاستەقینە و غەیر حەقیقی. وێنەکەی دیسان هەروەکوو «ناڵی» ئەڵێ:

**گەر دەپرسی من لەبەر چی کەم دەخۆم**
**من بە برسی قەت مەزانە، غەم دەخۆم!**

واتە: ئەگەر ئەپرسی من لەبەر چی کەم ئەخۆم؟ ئەوە خەم ئەخۆم!. کەواتە، وا مەزانە من برسیمە و بە برسیم مەزانە!.

خاسەویژییەکی بێگومان هەیە کە تێرییە و سەبارەتەکەی کەمخواردنەکەیە؛ بەلام ئەو، چاو لەوە ئەپۆشێ [و] خاسەویژییەکی‌تر ئەکا بە سەبارەت کە خەمخواردنە و خاسەویژییە بناغەییەکە ئیتر ئەبێ بە خاسەویژییەکی غەیر ڕاستەقینە و غەیر حەقیقی. هەرچەندە وا ئەچێتە دڵەوە کە لە خەمخواردن، خاسەویژییە ڕاستەقینەکە پەیدا ئەبێ ـکە تێر خواردنەکەیەـ، بەلام بە ڕەوشت و بە عادەتی یەکێ خەم بخوا و بەهۆی خەمخواردنەوە هیچی پێ نەخورێ، پێی نالێن تێری خواردووە.

**بەشی سێیەم:** واتە ئەو بەشەیان کە خاسەویژییەکە نییە و گومانی تێدا هەیە و ئەویستری بوونیەتییەکی بۆ دروست بکرێ و بکرێ بە خاسەویژی، وە ئەم بەخاسەویژیکردنەشی ئەگونجێ و ئەشێ. وێنەکەی وەکوو «مەجدی» ئەڵێ:

**میننەتی ئیحسانی «واشی»م والەسەر، ئەی ئەهلی شەرق**
**ترسی ئەو بوو، ڕستگار بوو چاوەکانی من لە غەرق!**

«واشی» ئەو کەسەیە کە قسە دێنێت و ئەبا، واتە «قسەچن». گۆیا قسەچن هیوای چاکەی لێ ناکرێ، بەلام هیچ دووریش نییە کە چاکەش بکا!.

جا هۆنەر دێنێ خاسەویژییەک کە نییە و گومانی تێدا هەیە ـوەکوو چاکەکردنی قسەچن بێـ ئەیهێنێت و ئەڵێ: دوور نییە ببێت؛ ئەیکا بە

سیفەت و بە پێچەوانەی هەموو کەس ئەبزوێتەوە و ئەڵێ:

خەڵکینە! بزانن، من سەرکۆنەی چاکەی قسەچنم لەسەرە، چونکە لە ترسی ئەوەکە نەوەک من لە جۆشی گریانا ببینێت و بچێت ئەم گریانەم بە بارێکیترا بگێڕێتەوە بۆ خۆشەویستەکەم، هیچ نەگریام، لە نەگریانەکەم چاوەکانم بۆ مایەوە، چونکە ئەگەر بگریامایە ئەوەندە ئەگریام تا چاوەکانم لە ناو دەریای فرمێسکدا نقوم ئەبوون و ئەخنکان!.

لێرەدا هۆنەر خاسەوێژییەکی دوور لە ڕاستەقینەی داوەتێ ـکە چاکەکردنی قسەچنەـ وە ئەشگونجێ و ئەشێ.

وەیا لەم ڕستەیەدا کە ئەڵێ: **«دوژمن باشترین مامۆستایە!»** چەشنی شتە و خاسەوێژییە دوور لە ڕاستەقینەکەی ئەدرێتێ، چونکە لە ترسی ئەو، پیاو ئەکەوێتە خۆی و بیۆەی ئەبێ لە خراپەی.

**بەشی چوارەم**، واتە ئەو بەشەیان کە خاسەوێژییەکە نییە و گومانی تێدا هەیە، واتە هەر لە بناغەدا نییە، وە ئەویستریێ بوونیەتییەکی بۆ دروست بکرێ و بکرێ بە خاسەوێژی، لەگەڵ ئەوەشا ناگونجێ، بەڵام هەر ئەکرێ؛ وێنەش بۆ ئەمەیان وەکوو ئەوەکە «بێخود» ئەڵێ:

**ئەگەر «جەوزا» نیازی بەندەگیی شۆخی لەسەر نەبوای**
**نەدەبینرا کەمەر بەستە لەسەر ئەو ئەوجی ئەفلاکە!**

«جەوزا» کە دوو پەیکەرەیە، چەند ئەستێرەیەکن لە وێنەی دوو منداڵی ڕووتدایە، شوێنەکەی شوێنی ئەستێرەی عەتاردە، وە ناوی مانگی سێیەمی دوانزە بورجەکەشە. بە هەرچوار دەوری ئەم جەوزایەدا دەستە ئەستێرەیەک ئاخڵەیان بەستووە بە دەوریا و بوون بە وەکوو پشتێن بۆی

-کـە بەمانەش ئەڵێـن: «نطاق الجَـوْزا»-. جا ئەڵێ: ئەگەر ئەستێرەی جەوزا مەبەستی بەندەگی ئەو شۆخە -کە یارەکەمە-ی لەسەر نەبوایە، بەو جۆرە پشتێنی بەندەگی لەو سـەرەوە نەئەبەسـت بە چەشنێکی وا کە هەموو کەس ببینێ!.

لێرەدا خاسـەوێژییەک -کـە خزمەتکردنی ئەستێرەی جەوزایە بە یار- نـە شـتێکە کـە ببێت و نە ئەشـگونجێ. ئەم وەکوو چـۆن ئەیەوێ بوونیەتییەکی بۆ دروست بکا، بەو جۆرە ئەشـیەوێ بڵێ ئەشگونجێ!. بوونیەتییەکـەی بـەوە پێـک دێنـێ کـە ئەڵـێ: نابینـی! وا بـەو جۆرە کەمەربەسـتە و بەبێ هەسـت بۆ خۆی لەو سـەرەوە ڕاوەستاوە؟! ئەم ڕاوەستانەی بەو چەشنە، ئەوە بۆ ئەو خزمەتەیە!!..

وەیا هەر لەم بەشەدا «هەردی» ئەڵێ:

**بۆیە مانگی نوێ هەموو شـەو زیاد ئەکا و ئەشـنێتەوە:**
**تـا جەمالـی خـۆی وەکـوو ڕووی تـۆ بڕازێنێتـەوە!**
**کاتێ گەییـە چواردەمین شـەو تێئەگا نـاگا بە ڕووت**
**جـا لـە داخـا وردەوردە کـز ئەبـێ و ئەتوێتـەوە!!**

ئەم هونەرە قسـەییە ئاشـکراییانە و بەدیعییانە کە قسەمان لێیانەوە کـرد، وەکوو لـە هۆنراودا هەن لە پەخشانیشـا هەر هـەن، ئەوانەی کە ئێمـە بۆ وێنـە هێنامانـەوە ئەتوانرێ هەر لەسـەر ئەو ڕێگایە بەسـەر پەخشانیشدا دروست بکرێن...

***

# هونەرە قسەییەکان و بەشەکانی ئەدەب!

ئایا هونەرە قسەییە ئاشکراییەکان مەرجە لە هەموو بەشکردنەکانی ئەدەبدا هەبن، یان نەء؟! بەپێی بیروباوەڕی تازە، ئەوەبوو ئەدەب لەلایەکەوە بوو بە ئەدەبی کۆن و نوێ، لەلایەکیشەوە بوو بە چۆنیەتی، نیازیی و جەفەنگی. لەگەڵ ئەوەدا هونەرە قسەییەکان لەپێش ئەوانەدا هەبوون، ئەم بەشکردنانە، وەیا ئەم بەشانە ئایا دوورەوپەرێز وەستاونەتەوە لێیان؟ وەکوو هەندێکیان خۆیان دوور خستۆتەوە لە خۆبەستنەوە بە هەندە یاسایەکی کۆنەوە! یا نەیانتوانیوە لێیان تەریک بن؟؟...

وەکوو بۆمان دەرکەوت، ئەدەب ئەبێ کەڵکی هەبێ و مەردمیتری پێی تێبگەیەنرێ. تێگەیاندنەکە چ سۆز و خورۆشیان بداتێ، وەکوو لە شێوەی ئەدەبیدا ئەبێ، وەیا چۆنیەتی زانیارییان تێبگەیەنێ، وەکوو لە شێوەی زانیاریدا هەیە. کە ئەدەب بۆ تێگەیاندن بوو، ئەبێ خاڵی نەبێ لەو هونەرانە، چونکە هۆی تێگەیاندنەکە هونەرەکانن!.

ئەدەبێکی جەفەنگی بەوێنە -کە ئەم جەفەنگییە کۆن بێ یا تازەبوونیەتییەکەی بە جەفەنگی لەبەر ئەوەیە کە زیاتر لەو هونەرانەی تێدایە، بەڵکوو گەوهەرە چەبوونییەکەی -ماهیەتەکەی- هەر ئەو هونەرانەیە، ئەگەر ئەمان نەبن ئەو هەر نابێ!.

یەکێک ئەگەر هات و بە باوەڕی خۆی پارچەیەکی دانا و وتی: وەکوو من چۆن خۆمم لە کۆت و زنجیری سەروا و سەروادار ڕزگار کردووە، هەر بەو جۆرەش خۆمم لە هونەرە قسەییەکان ڕزگار کردووە و ئەکەم،

وە بـە باوەڕی خۆی پارچەکەشـی ئەدەبـە!. ئەوە ئەو کەسـە بێگومان پارچەکـەی ئەبێ بە شـتێکی هیچ و ئەبێ وا بچێتـە دڵیەوە کە جیایـی نەخسـتووە لە بەینی گەوهەر و نێوار ـ عەرەز ـ دا!!.. سـەروا و سـەروادار نێوارێکن بەسەر گەوهەرێکا ئەڕۆن، بەڵام هونەرە قسەییەکان خۆیان خودی گەوهـەر و چەبوونییەکەن، واتە چەبوونییەکە بەوان دروسـت ئەبێ؛ چونکە ئەم چەبوونییە سـۆز و بیر و ئەندێشـە و ڕسـتەکەیە، کە ئەمانە خۆیان بە هونەرە قسەییەکان دروست ئەبن. ئەگەر هات و ئەو خۆی ڕووت کردەوە لەو گەوهەر و چەبوونییە، وا ئەگەیەنێ ئەو ئیشەی ئـەو کردوویەتی لـە خودی خۆیا هیچـە و بوونیەتییەکی بـۆ دانانرێ!. وەکوو کابرا ئەڵێ:

**دارەکەی سـەرکەل، پردەکەی قشـڵاخ**

**ئافەرەم شارەزوور بۆ خۆت و پەمووت!**

هیچ چەشـەیەک و هیچ زمانێک ناڵێ ئەمە ئەدەبە. نەبوونەکەشی لەبەر ئەوەیە چونکە هونەرێکی قسەیی تێدا نییە!..

❋❋❋

# ئەدەب و هونەر!

ئـایا ئەبێ ئەدەب هونەر ـ فەن بێ، یان نەء؟.. ئەدەب گوزارەیەکی گشـتیی هەیـە و یەکێکـی تایبەتی. گشـتیی ئەوەبـوو: نیـگار و وێنە و نووسـین و بیـر و باوەڕ و هەموو جۆرە هونەرێـک ـکە کردەوەی لەش بـێ ـ گرتیەوە، چونکە ئەمانە هەموو سـەرنجی پیاو ڕائەکێشـن و ئەبنە هـۆی گێڕانەوەی پـەردەی ڕابـووردوو ـکە لەمـەوە دەرزێـک ئەبێ بۆ داهاتوو ـ؛ وەکوو چۆن بەمە سۆزیش ئەبزوێ.

گوزارەیەکـی تایبەتیشـی کـە برێتـی بـوو: لـەو نووسـراوانە کـە لە چەرخەکانـی ڕابوردوودا باوەڕی ئادەمیزادیان هێشـتۆتەوە. بەرەبەرە وای لێ هات بە تەواوی تایبەتیی بوو بەو پەخشـان و هۆنراوانەوە کە ئێستە ئێمە بەرچاومان ئەکەون. لەسـەر ئەم گوزارشـتە لەو گشتییەوە دەرچوو بوو بە تایبەتی.

**«هونـەر»**؛ هونەر، بە جۆرێکی تێکڕایی: کۆمەڵە زانیارییەکە کە بە کـردەوە دیمەنێکی بۆ پەیدا ئەبێ، واتە دیمەنە کردەوەییەکە ـعەمەلی ـ دێتـە ناوەوە و بەرچاو ئەکـەوێ. جا ئەو کردەوە کردەوەییە لەوانە بێ بە چـاو ببینـرێ، وەیا بە گوێ ببیسـترێ؛ کە ئەمانە هـەردوو، کار ئەکەنە سەر هەست، وەکوو چۆن خۆیان لە هەست و هەستی دانەرەکەیانەوە دروست ئەبن.

ئەمجا ئەم هونەرەش دوو جۆرە: جۆرێکیان ئەو پیشـە و ئیشـانەیە کە کردەوەی لەش تیایانا ئاشکراترە تا کردەوەی چەشە، وەکوو: ئەم پیشە باوانـەی ئاسـنگەری و دارتاشـی و...هتد. جۆرەکەی تـریان پێچەوانەی

ئەمەیە؛ واتە کردەوەی چەشە تیایا ئاشکراترە تا کردەوەی لەش. ئەمەیان وەکوو: ساز و ئاواز، وێنە، ئەدەب؛ چونکە ئەمانە هەموو زمانی هەستن و گوزارشت لە سۆزی پیاو و لەو بوونیەتییە -شەخسیەتە- هونەرییە ئەدەنەوە کە هۆیەکانی جیاجیان، -واتە هۆی کەسیەتییە هونەرییەکە-. هۆیەکانیش هەندێ جار ساز و ئاوازەکەیە بەچاو مووسیقار و گوێگرەکەوە، هەندێ جار ڕستە ئەدەبییەکەیە، ئەمیش بەچاو ئەدیب و خوێنەر و گوێگرەکەیەوە؛ هەندێ جاریش ڕەنگ و تەشکی وێنە و «کەلەخ - هەیکەل»ـەکەیە بەچاو هونەرمەند و سەیرکەرەکەیەوە!!..

ئەمە شناساندنی هەریەکەیان بوو بە جیا، ئینجا لەسەر ئەم قسەیە و لەسەر ناسینی گوزارەی هونەر، ئەبێ ئەدەب بەشێک بێ لە بەشەکانی هونەر؛ وەکوو چۆن لەسەر ناسینی گوزارەی ئەدەب ئەبێ هونەر بەشێک بێ لە بەشەکانی ئەدەب؛ کەچی ئەو باوەڕەش هەیە کە ئەڵێ: « ئەدەب هونەرێکە لە هونەرەکان!» واتە ئەدەب هونەرە!..

کەوابوو ئەبێ ئێمە بە وردی سەیری چەمکەکانیان بکەین، وەکوو تەماشا ئەکەین: سەرچاوەی هەردوو لایان لە سۆزەوە هەڵئەستێ؛ ساز و ئاوازێک کە هەیە، سۆزەکە دروستی ئەکا، پارچە نووسینێکی شێوەی ئەدەبی کە هەیە، دیسان هەر سۆزەکە ئەویش دروست ئەکا. کەوابوو، کە سۆز هۆی دروستبوونی هەردوو لایان بوو، بە هەردوو گوزارەی هونەر و ئەدەب ئەتوانرێ بوترێ: ساز و ئاواز وەکوو چۆن هونەرە، بەو جۆرەش ئەدەبە؛ پارچە نووسینێکی شێوەی ئەدەبی وەکوو چۆن ئەدەبە، بەو جۆرەش هونەرە!.. ئەمە لێرەدا ئەوەی گەیاند: کە ئەدەب و هونەر هەر یەکن و هیچیان بەسەر هیچیانا نییە.

مایەوە سەر ئەوە کە ئەڵێ: «ئەدەب، هونەرێکە لە هونەرەکان»؛ ئەمە ئـەوە ئەگەیەنێ: کە هونەر گشـتییەکی هەبێت و ئەدەب تایبەتییەک؛ واتە هونەر «عام» بێت و ئەدەب «خاص»!..

بەڵـێ! ئەمـە ئـەوە ئەگەیەنـێ و ڕاستیشـە، چونکە مەبەسـت بەو ئەدەبە: ئەو پارچە نووسـینە ئەدەبییەیـە ـکە ئەمە گوزارە تایبەتییەکەی ئەدەبـە ـ و دانەرەکـەی سـۆز و بیر و ئەندێشـەی تیا ئەخاتـە کار و لە ڕاسـتیدا هونەری تیا ئەنوێنێ؛ لەم ڕووەوە و لەسـەر ئەم باوەڕە، ڕاست بوو: ئەدەب هونەرێک بوو لە هونەرەکان؛ ئەم گشتیتر بوو لە ئەدەب، بەڵام ئەدەب بە گوزارەی تایبەتی، نەوەک بە گوزارەی گشتی.

خۆ ئەگەر مەبەسـت بە ئەدەب گوزارەی گشـتیی بێ، ئەمە نابێ؛ چونکە هەموو ئەدەب هەموو هونەرە، وەکوو چۆن گشت هونەر گشت ئەدەبە!. واتە ئەبێ بەوە کە دوو وشە و یەک گوزارەیان هەبێ.

# هونەر و شێوە!

ئەدەب کە هونەر بوو، ئەبێ شیوەکەی چۆن بێ؟... ئەوا ئەدەب لەم ڕووەوە بوو بە هونەر؛ واتە: ئەدەب بە گوزارەی تایبەتی بوو بە هونەر!. کە هونەر بوو، ئەبێ بزانین «شێوە ـ ئوسلووب»ـەکەی ئەبێ چۆن بێ؟..

جارێ پێویستە ئەوە بزانرێ: کە «شێوە» دوو جۆرە: شێوەی ئەدەبی، واتە: شێوەیەک، کە لە ئەدەب بە گوزارەی تایبەتیدا بەکار ئەهێنرێ. دووەم، شێوەی «زانیاری ـ عیلمی». ئەم شێوەی زانیارییە زمانی ژیرییە؛ واتە: ئەقڵ دروستی ئەکا و لەسەر بیروباوەڕ و ڕستە دائەڕێژێ. شێوەی ئەدەبیی زمانی سۆزە. لە شێوەی زانیاریدا مەبەست دەربڕینی ڕاستی و چۆنیەتی کارەساتە و ڕووناککردنەوەی بیروباوەڕی خەڵک و تێگەیاندنیانە لەو چۆنیەتی و کارەساتە ـوەکوو باسەکانی مێژوو و جوغرافیا و ڕیازیات و شتیتری زانیاری ـ. لە شێوەی ئەدەبیدا هەڵگیرساندنی جۆش و خورۆشێکە لە خوێنەران و گوێگراندا ـکە لەمەوە هونەرێک دروست ئەبێ ـ.

لە شێوەی زانیاریدا دووپاتەکردنەوە ـتِکرار ـ نییە، بەڵکوو تەنها باسی چۆنیەتییەکەیە. لە شێوەی ئەدەبیدا دووپاتەکردنەوە هەیە، بەڵام هەر جارە بە جۆرێک، چونکە ئەگەر ئەمە نەبێ، خورۆشەکە پەیدا نابێ. شێوەی ئەدەبیی ئەچێتە ناو کوورەی ئەندێشە و بیر و تەشک ـصورَت ـەوە.

ئەم شێوەی ئەدەبییە لە هۆنراو و پەخشاندا ئەبێ، لە هۆنراودا ئەم هۆنراوانەی «پیرەمێرد» ئەبن بە وێنەی باسەکە، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

شــەوێکی مانگەشــەوی خۆش دەمەدەمی نیسان
بەهاری تــازە کە زســتانی خســتە ناو نەیســان[١]
لە هــەر دڵێکەوە جۆشــێ بە بانگی دەنگخۆشــی
لــە لالــەزارەوە شــەونم شــەرابی مــەی نۆشــی!
خەریکی جونبوش و زاخاوی ژەنگی زســتان بوون
کــچ و کوڕ و ژن و مێرد، پێکەوە لە ســەیران بوون!
منیش لــە خــوارەوە چووبوومە گــوێ ئەبی دەریا
بــە دەردی خۆمــەوە گیــرۆدە، بێ کــەس و تەنیا!
لە پاڵ درەختی «سنەوبەر» کە ناوی «چام»ـە لەوێ
ئەوەی نەخۆش بێ هەوای داری چامی پێ دەکەوێ!
لە ئەستەمووڵ، لە «ئەتاهای هەگبەلی» بە بێدەنگیی
خزامــە بن دەســی جوانان بــە لاپلەر ســەنگیی!
لــە پێشــمەوە ژن و مێردێکــی عەرِعــەرِ و لاولاو
کە ـ تیشکی کوڵمی ئەوان ـ مانگی خستبووە ناو ئاو!
بــە یەکدڵیی تەکیــان دابــووە یەک بە ســەوداوە
بــە خۆشەویســتییەکی پــاک و ڕوون و ســاواوە!
بە مێهرەبانی، «پەری شۆخی شەو» لە ژوورسەریان[٢]

١. وەیا نسیان.

٢. «پەری شۆخی شەو»: مانگە.

بە تیشـــکی خۆی جلی زەرِبەفتی کردبووە بەریان!
بە ســۆزەوە -کورە پرســـی- لە هاوســەری گیانیی:
کە رِۆژ هەڵێ و ون ئەبێ، کامی خۆشــە؟ ئەیزانی؟
کچە وتـــی: کە بـــە رِووی تۆوە رِۆژ هەڵێ خۆشـــە
بە مەستیی چاوتەوە دڵ نەشـــئەدارە، سەرخۆشە!
بەڵام کە کاتێ لە پێش چاو نەبیت و دوور بی لە لام
بینایـــی لێڵـــە، لـــە زەردەڵ پەرِایـــە، رِۆژی هیوام!
بە خۆشەویســـتییەوە کورِ، دەستی کردە گەردنی یار
ســـرِی لە ئاوێنەی رِووی بە لێـــوی، ژەنگی غوبار!
وتـــی: کە تۆ ئەمـــە بی! کێ گەواهی عیشـــقم بێ؟
هەتـــا بژیـــم نەیەڵم عیشـــقی تـــۆم لە لا کـــەم بێ!
کچـــە وتـــی: ئـــەوە ئەســـتێرەیەکی تـــازە هـــەڵات
بە کـــوردی ناوی «گەلاوێژ»ە شـــەوقی دایە وڵات!
وەرە! بە شوعلەی ئەو سوێند بخۆین کە یەکدڵ بین
لە خزمەتی وەتەنا هـــەوڵ بدەین هەتاکوو دەژین!
لە «ژین»ـــەوە ئەمە شاباشـــی رِێـــی «گەلاوێژ»ە
لـــە کۆمەڵـــێ ئودەبـــا نوکتەبێـــژ و گوڵرِێـــژە![1]

---

١. پیرەمێرد ئەم هۆنراوانەی لە ساڵی «١٩٢٢» لە «ئەتاها هەگبەل» لەسەر دەریای سپی لە ئەستەمووڵ وتووە. لە ساڵی «١٩٣٩» سێ هۆنراوی دوایی لە شاری سولەیمانی خستۆتە سەر.

لـە پەخشانیشـا ئەم پارچـە پەخشـانەی عەلائەددین سـەججادی نموونەیەکـە بـۆ ئـەوە: کـە شـێوەی ئەدەبی چووەتـە ناو بەرگـی بیر و ئەندێشە و تەشکەوە، لە کاتێکا کە باسی «ئازادی» ئەکا و ئەڵێ:

**«ئەی ئازادی! ئایا نهێنییەکی خواکردیت و کەوتوویتە بازاڕی خواپێداوانەوە و دڵخوازەکانت دەستیان ناتگاتێ؟ یا سحرێکی بازاڕی سروشتیت و ئاشنایانی کۆڕی سەربەستی بە باسکی هەڵکراوی لە پۆڵا بەتینتر و بە دڵی بە هێزی لە قەڵا قایمتر و بە چاوی نەترسی لە چاوی پڵنگ نەترستر ئەتشکێنن و گەنجی هیوای کامەرانیت ئەگرنە باوەش؟..**

**یا شۆڕێکی بە تەم و بوخاریت لە ئێسک و پرووسکی ئەو کەسانەدا کە شەیدای لالەزاری نیشتمانن، هاتوچۆ ئەکەیت و خولیای مێشکەکەیانیت؟!..**

**نەء.. ئەمانە هیچیان نیت! بەڵکوو ئەی ئازادی! ئاوێنەیەکی باڵانمایت! بەهۆی تۆوە ئارایش پەیدا ئەبێت، بە هۆتەوە ڕوومەتی خاوەن دڵان ئەکەوێتە بازاڕی نمایشەوە!..**

**یا خود کۆمەڵە نوورێکیت، تیشکەکانت تەلی عاتفەیە، ڕووناکییەکەت بانگی سەربەستییە، دیمەنەکەت سرەوتی بێ‌کش‌وماتی کامەرانییە!!..**

**دیسان ئەمانەش هەر نیت! بگرە پارچەیەکیت لە مێرغوزاری بەهەشت؛ ئەو مێرغوزارە کە تیشکی پەروەردگاری کەوتۆتە سەر، کەوتوویتە ئەم جیهانەوە؛ فێنکیی دڵانی، لابەری خەمانی، ئاسایشی گەلانی، ئارایشی جیهانی، هەستی هۆشی شاعرانی، قەڵەمی بیری**

**ئەدیبانی، سەرچاوەی ئیلهامی تەبیعەتیت!!...**[1]

لــە پارچــەی یەکەمــا بیرکردنەوە لــە ئاســمانی خەیاڵاتا ئــەو پارچە هۆنــراوەی دروســت کــردووە و خســتوویەتە کەلەخــی ڕستەیەکەوە و پیشانتی ئەدا: کە چۆن دەنکەدەنکە ئەو گوزارە بەرزانە ئەدۆزێتەوە؟!.

لــەناو خەرمانی مانگەشــەوا و لە ســای ســەهەنا دوو دڵخواز پێک ئەگەیەنێ؛ دوو دڵخوازی وا کە تیشکی گۆنایان مانگی تریفەدار ئەخاتە ناو ئاوی بندارەوە! ئەمجا لە سایەی ئەو دیمەنەدا ئەکەونە ڕازونیاز و لە کوورەی دەروونێکی پڕ جۆشەوە بوخچەی دڵی یەک بۆ یەک ئەکەنەوە!.

لاوی بادینــی دوو شــۆخی لــە بەردەمایــە؛ یەکێ مانگی شــەو لەناو ئاوەکە، یەکێ دۆستی ژیان لە بن دارەکە. نایەوێ شەو ساوا بێ، نەوەک دۆستی ئاوا بێ!. بەترسەوە لێی ئەپرسێ:

ئایا هەڵاتنی ڕۆژت پێ خۆشە[2]، یا هەڵاتنەکەیت پێ خۆشە؟[3].. لە هەڵهاتنیا شەو ئەڕوا، لە هەڵاتنەکەیا ڕۆژ ئەڕوا!.

کیــژی هەرســینی دڵی خۆش ئەکا و ئەڵــێ: ڕۆژ بە ڕووی تۆوە هەڵێ ئەوە خۆشە، بەڵام کە تۆم لە لا نەبی، ئەوە هیوام لە زەردەپەڕایە و ژیانم لە ناهومێدیدا!..

لە ئاخری ڕازونیازا هەر کیژی هەرســینی گەواهی مانەوەی حەسپنی هەردوولایانــی دا بە هەڵاتنی ئەســتێرەی «گەلاوێژ» کە لەبەر تیشــکی ئــەوا ســوێند بخۆن بۆ یــەک: تا ماون لە خزمەتی نیشــتمانا لە ژێر ئەو

---

١. لە گەلاوێژی ژمارە «٢» ساڵی «٩».

٢. [هەڵاتن: هەڵهاتن، دەرهاتن، دەرکەوتن،] «شروق الشّمس».

٣. [هەڵاتن: دەرچوون، ڕۆیین، داچوون، ونبوون،] «غروب الشّمس».

تیشکەدا یەکدڵ و یەکزمان بن.

لە پارچەی دووەمیشا هەر ئەندێشە، پەیکەرێکی دروست کردووە و ناوی ناوە «ئازادی». بە بیر ئەیکا بە هەرشتێکی بەرز کە لە دڵا بێت، لە ئەنجاما ئەڵێ: تۆ هیچ‌یەک لەو شتە بەرزانەش نیت، تۆ لەوانە بەرزتریست، تۆ هەوێنی هەموویانیت، تۆ ئاوی ژیانیت؛ ئەو ئاوە کە بوون و نەبوونی تاک و گەل، بوون و نەبوونی بیر و هۆش بە تۆوەیە، کە تۆ نەبیت کەون نابێت!..

بێ‌گومان بێجگە لە بیر و ئەندێشە و تەشک، هیچ شتێکی‌تر ئەم دوو پارچەیەی دروست نەکردووە.

کەوابوو، لەسەر ئەم قسانە ئەو ئەدەبەی کەوا هونەرە، ئەدەبی بە گوزارەی تایبەتییە، نەوەک ئەدەبی بە گوزارەی گشتی. ئەمجا ئەم ئەدەبی بە گوزارەی تایبەتییەش ئەدەبێکە کە لەسەر شێوەی ئەدەبییە، نەوەک ئەدەبێک کە لەسەر شێوەی زانیاری، چونکە شێوە ئەدەبییەکەیە کە بەهۆی بیر و ئەندێشە و تەشکەوە خورۆشەکە دروست ئەکا و هونەرەکە پەیدا ئەبێ؛ ئەو هونەرە کە ئەدەب بەو دانرا.

# شێوه و ئەدیب!

جارێ ئەبێ ئەوە بزانرێ: کە لە نووسیندا ـهەر نووسینێک بێت، واتە ئەدەبیی یا زانیاریی- سێ ڕەگەز هەیە: یەکەم شێوە، ڕێخت. دووەم باس ـکە مەوزۆعە-. سێیەم نووسەر ـکە ئەدیبەکەیە-.

شێوە وەیا ڕێخت، ئەو ڕستە و وشانەیە کە ڕێک ئەخرێن، بەڵام ئەبێ بکرێن بە بەر ئەو گوزارە و ئەندێشە جوانانەدا کە لە خودی نووسەر، یا قسەکەرەکەدایە. وەیا بە جۆرێکی‌تر: شێوە برێتییە لەو گوزارە و ئەندێشەیە کە لە دڵی نووسەر وەیا قسەکەرەکەدایە، لە پێش ئەوەدا بچێتە ناو بەرگی ڕستەوە، کە چووە ناویەوە، ئەو وەختە بە تەواوی دەق ئەگرێ.

**باس:** ئەو هونەر و شتانەیە کە نووسەرەکە ئەیگرێ بە دەستەوە بۆ ئەوە ئەوی لە دڵیدایە بکەوێتە ڕوو، ئەوەش زانیاری بێ یا ئەدەبی، هۆنراو بێ یا پەخشان. دیارە هەریەک لەمانە شێوەیەکی تایبەتییان هەیە.

**نووسەر:** ئەو کەسەیە کە شتەکە ئەنووسێ. ئەمجا ڕێخت، کە جیا ئەبێ؛ هۆی ئەم جیاییەی ئەگەڕێتەوە بۆ باس و بۆ نووسەر، واتە: کە باس جیا بوو شێوە جیا ئەبێتەوە، کە نووسەر جیا بوو دیسان شێوە هەر جیا ئەبێتەوە!..

جیایی شێوە بەچاو ئەم نووسەرەوە ئەگەڕێتەوە بۆ جیایی کەسیەت ـشەخسیەتـی نووسەرەکە؛ وەکوو چۆنیەتی چەشەی، بیروباوەڕی،

ژیریەتییەکەی، تووڕەیی و هێمنی و شتیتر، کە ئەمانە هەموو ئەکەنە کاریٚ شێوەکەی جیا بێت!...

❋❋

ئەوە بوو وترا: شێوەی ئەدەبیی هەیە و شێوەی زانیاریی هەیە، لەگەڵ ئەمانەشدا شێوەکە، هەرکام لەمانە بێت، کە «باس» جیا بوو، شێوە جیاییەکیتری بەسەرا دێت!. دوو ئەدیب باسی یەک شت ئەکەن، وەیا یەک ئەدیب بە دوو جار باسی یەک شت ئەکا، یەکێک لەو ئەدیبانە، وەیا هەر ئەو تاقە ئەدیبە کە ئەیەویٚ ئەو شتە کە باسی ئەکا لە شێوەی زانیارییەکەدا، باسی ئەو زانیارییانە ئەکا کە ژیرییەکە تیایانا فەرماندارە و مەبەست باسکردنی ڕاستی و چۆنیەتی و خزمەتی زانیاری و فێرکردن و ڕووناککردنەوەی بیروباوەڕە، بە ڕستەیەکی ئاسان و بیٚگریٚ. وەیا باسی زاراوەکان ـ مُصْطَلَحات ـی زانیاری و ژمارەی ژماردن ـ ئەرقامی حسابی ـ و سیفاتی هەندەسی ئەکا، کە ئەمانە هەموو لەبەر تیشکی ژیرییەوە ڕوو ئەدەن.

بە پێچەوانەی ئەمە، لە باسی شێوەی ئەدەبیدا ـ لەسەر زمانی ئەوان ـ خورۆشی نەفسی و سۆز شانبەشانی گرنگتر چۆنیەتی و بیروباوڕ ئەڕوا!.. وەکوو مەبەست لە شێوەی زانیاریدا دەربڕینی ڕاستی و چۆنیەتییە، لە شێوەی ئەدەبیدا مەبەست هەڵگیرساندنی جۆش و خورۆشێکە لە دڵی خوێنەر و گوێگرەکاندا. هەروەها لەم شێوە ئەدەبییەدا شێوەکە بە شوێن وشەی زل و شوێنانی بەسۆزدا ئەگەڕێ، لەگەڵ وەرگرتنی ئەو وێنانە کە بە ئەندێشە دروست ئەبن، وەکوو چۆن

پیشـە بەدیعییەکانیـش وەرئەگرێ!.. دیسـان سـەیر ئەکرێ لە شـێوەی زانیاریـدا باوەڕ لە وتندا دووپاتە ناکرێتەوە، بەڵام لە شـێوەی ئەدەبیدا ئەتوانرێ یەک گوزارە بە چەند وێنەی هونەرە قسـەییە ئاشـکراییەکان باس بکرێ!...

جـا ئەو دوو ئەدیبە هەرچەندە خـۆیان جیا بن و باس، بەناو یەک باس بێ، وەیا ئەدیب هەر یەک ئەدیب بێت و باس بە ژمارە دوو بێ، بێجگە لـەم جیاییە ڕواڵەتیە کە هەیـە، جیاییەکی‌تریش هەر هەیە کە بەهۆی ڕووت شێوەکەوە دروست ئەبێ!..

لەمانـەوە ئەوە دەرکەوت کە شـێوە ئەبێ «باس ـ مـەوزۆع» بێت، کە باس جیا بوو، شـێوەش جیـا ئەبێتەوە. لەم جیابوونەوەی شـێوەیەدا جیابوونـەوەی نووسـەر پەیدا ئەبـێ!. کەوابـوو ئەتوانین بڵێین: شـێوە ئەدیبە، وەکوو چۆن شێوە باسە!..

لەسـەر ئەمە، پەیوەندییەک کە لەبەینی ئەدیب و شـێوەدا، وەیا لە بەینـی باس و شـێوەدا هەیـە، وەکوو پەیوەندییەکە کە لـە بەینی ئاگر و گەرماییـدا هەیە؛ چۆن گەرماییەکە مەلزوومی ئاگرەکەیە، بەو جۆرەش شێوەکە مەلزوومی ئەدیبەکە وەیا باسەکەیە!!...

# شێوە و کەسیەتی ـ شەخسیەت!

کەسیەتی شتێکە کە یەکێکی لە یەکێکی‌تر پێ جیا ئەکرێتەوە؛ وەیا چەند سیفەتێکی ڕەوشتیی، ژیری و لەشییە کە تایبەتین بە ئادەمیزادەوە، لە غەیری ئەوا نین. ئەم کەسیەتییەش تاکیی ـ فەردی هەیە و کۆمەڵیی هەیە؛ واتە ئەو تاکییە لە یەکێکا هەیە و لە یەکێکی‌ترا نییە؛ وەکوو لە ڕەوشتیا بەخشندەیی و ڕاستی، وە لە ژیریدا زیرەکی و ڕاستیی شت وەرگرتن ـ «صِحّت استِنباط». وە لە لەشیدا جیایی کەلەخ لە ئەندامدا هەیە.

وە کۆمەڵییەکەش وەکوو ئازایەتی و فەرمانبەرداری و خۆبەختکردن؛ واتە ئەم کەسیەتییە وەکوو لە تاکا هەیە ئەو تاکە ژن بێ یا پیاو، گەورە بێ یا پچووک؛ لە نەتەوەشا هەیە، وەکوو باوەڕبەخۆبوونی ئنگلیز، دات و دستووری ئەڵەمان، ئازایەتیی کورد، زمانپاراویی عەرەب. بێ‌گومان ئەبێ ئەدەبیش بکەوێتە بەر پلاری ئەم کەسیەتییە!..

ئەمە شتێکی ئاشکرایە: کە سۆز ئەدەب جیا ئەکاتەوە لە زانیاری، کە جیای کردەوە، دیارە ئەمە کەسیەتییەکی بۆ خاوەن سۆزەکە دروست کرد ـکە ئەدیبەکەیەـ. یەکێ ئەگەر بیەوێ دیوانی هۆنەرێک وەیا نووسینی چەند جۆرەی نووسەرێک بخوێنیتەوە، لەوێدا بە تەواوی کەسیەتی و نەفسیەتی ئەو نووسەر و هۆنەرەی بۆ دەرئەکەوێ؛ ئەوەی بۆ دەرئەکەوێ: کە ڕەوشتی چۆن بووە، بیروباوەڕی بەرانبەر بە ژیان چۆن بووە، پلەی خوێندەواری چۆنە، تا چ ئەندازەیەک توانیویە و ئەتوانێ

بە وشەکە شت ڕۆشــن بکاتەوە، وەیا چۆن گوزارشت لەو شتە بداتەوە. تێ ئەگا وشــەکانی چۆنە، ڕێــگای پەی‌بردنی هۆنەر و نووســەرەکەی بۆ دەرئەکەوێ بە شــت، کە چۆن بۆی چوون؟. کە ئەم هەموو شــتانە ڕێ ناکەوێ لە دوو کەسا وەکوو یەک بن!..

کــە ئەمە هەبوو، ئەتوانرێ بوترێ: هــەر تاقە ئەدیب وەیا هۆنەرێک «پەیڕەو ـ ئوممەت»ــێکی سەربەخۆیە. نەوەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو هەر تاقە مرۆڤێک پەیڕەوێکی سەربەخۆیە!..

لەمــەوە ئــەوە دەرکــەوت: کە چەندە کەســیەتی زۆر بێ، شــێوەش ئەوەنــدە زۆر ئەبــێ. بگــرە ئەوە دەرکــەوت: کە لە شــێوەی ئەدەبیدا با دووپاتەکردنەوەش هەبێت لە ڕواڵەتا، ئەو دووپاتەکردنەوەیە لە بنچینەوە و لە گوزارەدا نییە!. بەڵکوو هەر شــتێک کە یەکجار وترا، تازە ئەو شــتە ناوترێتەوە، چونکە ئەو گوزارشتەی یەکێک لە شتێکی ئەداتەوە، جیایە لەگەڵ گوزارشــتێک کە یەکێکی‌تر هەر لەو شــتەی ئەداتەوە!.. نەوەک هەر ئەمە، بەڵکوو ئەو گوزارشــتەی کە تاقە کەســێک لە تاقە شــتێکی ئەداتــەوە، بۆ جاری دووەم کە گوزارشــتێکی‌تری هەر لەو شــتە دایەوە، ئەمەی دووەم جیایە لەگەڵ ئەوەی یەکەمدا!!...

لەســەر ئەمــە: ئەبــێ هــەر تاقــە کەســێک لــە هــەر کاتێکــدا کەســیەتییەکی هەبێ کــە جیا بێ لە کەســیەتییەکەی پێشــووی!. کە ئەمە هەبوو، دیارە شــێوەکەش جیا ئەبێ لەگەڵ شــێوەکەی پێشــوودا!. لەســەر ئــەو باوەڕە کە بڵێین: شــێوە ئەدیبە، ئەم ئەدیبــە بەچاو خودی خــۆی و لەشــەکەیەوە یەکێکە، بەڵام بەچاو ســیفات و بەســەرهاتەوە،

هەزاران سـیفات و بەسەرهاتی ئەدەبیی بۆ پەیدا ئەبێ!. کەوابوو، هەر شێوەیەک کەسیەتییەکی دروست کرد و هەر ئەدیبێک لە هەر جارێکا کەسیەتییەکە، کە جیایە لە کەسیەتییەکەی پێشووی!!...

❋❋❋

# ئەدەب و گۆڕانی بەشەکانی[١]

بەشکردنەکانی ئەدەب هەروەکوو خۆیان ئەمیننەوە، یان ئەگۆڕێن؟. ئەمە پرسـیارێکە ئەکرێ؛ ئەمجا ئەوترێ: هەموو شت پابەندی گۆڕانە، ئەدەبیـش بەو جۆرە ئەبێ ئەو گۆڕانەی بەسـەرا بێت. کە ئەمە هەبوو، بەشەکانیشی وەکوو خود ـ نەفس ــی خۆی ئەبێ ئەو گۆڕانە ڕووی تێ بـکا؛ واتـە: ئەدەبێک کە سـەردەمێک بـە ئەدەبی تازە دانـراوە، ڕۆژ و شـوێن وای لێ کردووە کە ئەو ئەدەبە ببێ بە ئەدەبێکی تازە و نوێ. کە ئەو ڕۆژ و شوێنە بەسەر چوو، ئەویش لەوانەیە ئەو وەسپەی نەمێنێ!. ئەمەش لەبەر ئەوەیە: کە ئەدیبەکە خورپەی ئەدەبەکەی لە ئاو و هەوا و کارەسـاتی ناوچەکەوە وەرگرتووە، کە ئەو ئاو و هەوا و کارەسـاتە نەما، با پارچـە ئەدەبەکەش بمێنێتەوە، شـتێکیتر دروسـت ئەبـێ کە جیایە لەوەی پێشوو!!...

ئـەو ناوچەیـە کارێکـی وای کـردە سـەر نووسـەر و هۆنەرەکە، کە پارچە نووسـین و هۆنراوەکەی ببێ بە چۆنیەتی، وەیا بە نیازیی، وەیا بە جەفەنگی بۆ ئەو ڕۆژە؛ پاش ئەوە شتێکیتر دێتە پێشەوە کە ئەو وەسپە سـۆزاوییە بۆ ئەو پارچەیە لەو ڕۆژەدا نەمێنێ و ئەو وەسـپە ببێ بە هی پارچەیەکی تازەتر!. هەروەها بەرانبەر بە کۆن و نوێش!..

ئەوەنـدە هەیە: لـەناو ئەمانەدا ئەدەبی کۆن هەر لەسـەر وەسـپی کۆنیەتی خۆی ئەمینێتەوە، هەر لەسەر ئەو وەسپە، نەوەک وەسپێکیتر،

---

١. مەبەست بە بەشەکانی ئەدەب: کۆن و تازە، وە چۆنیەتی نیازیی و جەفەنگییە.

چونکە ئەو ئەدەبە کۆنە ئەگونجێ چۆنیەتی وەیا نیازیی وەیا جەفەنگیی بووبێ، ئەگونجێ هەرکام لەمانە بگۆڕرێن بە وەسپێکی‌تر غەیری وەسپە پێشـووەکەیان!. وەکـوو ئەمە هەیە، ئـەوەش هەیە: ئەتوانـرێ بووترێ: گـۆڕان لـە نیازیـدا زۆر ئاسـانە، بەڵام لە چۆنیەتـی و جەفەنگیدا چۆن ئەبێ؟!.

ئەڵێیـن: ڕۆژگار جـۆرە گوزارشـتێکی‌تر دروسـت ئەکا کـە ئەتوانرێ بەهـۆی ئـەو گوزارشـتانەوە چۆنیەتـی و جەفەنگییەکـەی ئیمڕۆ گەلێ ئاشکراتر بن، لە چۆنیەتی و جەفەنگییەکەی دوێنێ!.

بـۆ وێنە: سـەیر ئەکـەی وەختـی خۆی گەلـێ لە هۆنـراوەکان[ی] «نالّی» بۆ ئەدەبی نیازیی دەستی داون، کەچی لەپاش سەردەمی ئەو، سـەردەمێکی‌تر هات، ئاو و هەوا و کارەسـات جـۆرە خورپەیەکی‌تری دا بـە هۆنەر، کـە هەندێ هۆنراوی وا بلّێت، بۆ ئـەوە بۆ ئەم ڕۆژە زیاتر بـەر نیازیی بکەوێ تا ئەوەی پێشـوو. وەکوو لە پارچەی هۆنراوی «ئەی مانگ»ـی «فایق بێکەس»ـدا ئەمەمان بۆ دەرئەکەوێ، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**ئەی مانگ! من و تۆ هەردوو هاودەردین**
**هەردوو گرفتـار یەک ئاهی سـەردین!**
**تـۆ وێـڵ و ڕەنـگ زەرد بە ئاسـمانەوە**
**منیـش دەربـەدەر بـە شـارانەوە!**
**دەخیلتم، ئەی مانگ! قیبلەی دڵداران**
**دەرمانـی دەردی دڵـی بیمـاران!**

**شــەوێکە و ئەمشــەو بگــەرە فریــام**
**بــێ یــار و هــاودەم عاجــز و تەنیــام!**

ئەم پارچەیە «١٩» هۆنراوە[یە]، لە دوو هۆنراوی دواییدا ئەڵێ:

**ئەی مانگ، ئەوەندە سەیری دنیات کرد**
**ســەیری نیفــاق و زوڵــم و ڕیــات کرد!**
**بۆیــە بــەم ڕەنگــە کاری لــێ کــردی**
**ڕەنــگ و شــعووری بــە جــارێ بردی!**

ئەوەنــدە هەیــە ئەتوانین بڵێین: وەکوو چۆن ئاو و هەوا و کارەســاتی ســەردەمی «ناڵــی» هۆنراوەکانــی ئــەوی کردووە بــە نیازیــی، هەروەها کارەســات و ئاوێنەی بیر و باوەڕگەلی سەردەمی «فایق بێکەس»ــیش هۆنراوەکانی ئەمی کردووە بە نیازیی. هەریەکە بۆ دەوری خۆیان نیازین، بــەڵام ئــەو نیازییەکی کۆن، ئەم نیازییەکی تازە!. لەســەر ئەم قســەیە: ڕۆژ و ناوچــە ناو بــۆ هۆنراوی هۆنــەر دائەنێ، نــەوەک هۆنەرەکە خۆی وەیا یەکێکی‌تر، ئەگەر یەکێکی‌تریش بۆی دانێ، ئەوە ڕۆشــنکردنەوەیە، دانان نییە..

هەروەهــا گەلێ شــت هەیە لــە وەختی خۆیــدا بــۆ چۆنیەتییەکی تــەواو دانــراوە و بەوە دائەنرێ، کەچی لەپاش ئەو ســەردەمە چەشــنە چۆنیەتییەکی‌تر هاتۆتە ناوەوە کە ئەوی پێشووی لە چۆنیەتیی خستووە؛ بە وێنە: وەکوو ئەو شتانە کە بۆ کارەساتی لافاوی «١٩٥٧»ی ـ سولەیمانی دانــراوە، وەیا وەکــوو ئــەو هۆنراوانە کە بــۆ وێرانکردنی «هیرۆشــیما» لە «١٩٤٤»دا وتــراون!... بــەڵام ئەوەنــدە هەیــە ئەدەبێکــی چۆنیەتــی بەو

گوزارەیــە کە ئێســتە ئێمە لێی ئەدەینەوە و ئەڵێین ئەبێ قســە لە ژیانی ڕەمەکی مەردمەوە بکا، زیاتر لەم ســەدەی بیســتەمەدا پەیدا بوو؛ واتە بەو چەمکە کە ئەیلێن..

کەوابــوو، ئەتوانیــن بلێیــن: ئەدەبــی چۆنیەتــی بــەم چەمکە، هیچ کۆنییەکــی تێــدا نییــە و هەمــووی تازەیە!. جا ئــەو ئەدەبــە ئەدەبێکی هۆنــراوە بــێ یا پەخشــان بــێ؛ بۆیــەش ئەمــە ئەڵێین، چونکــە هەندە ئەدەبێکیتر پەیدا بوو، کە ئەمانە هەموو بەر ئەدەبی چۆنیەتی ئەکەون و لە ســەردەمی پێشــوودا ئــەم ناوەیان نەبوو. وەکوو ئەدەبــی ئابووری، کۆمەڵایەتی، زانستی، سیاسی، ئازادی و شۆڕش. دیارە ئەدەب لەمانەش دەســتدارە؛ واتە ئەمانەش بەر ئەدەب ئەکــەون. بەڵام ئەوە مەرج نییە بوترێ بەر چ شــێوە ئەدەبێک ئەکەون؟. بەر شێوەی ئەدەبیی بکەون یا زانیاریــی هەر ئەدەبن. ئەوەندە هەیە، هەندێک لەمانە وەیا هەموویان هەرچەندە لە پێشیشا هەبوون؛ وەکوو لەسەر گوزارشتی ئێستە، ئەدەبی زانســتیی ـکە بەر شــێوەی زانیاریــی ئەکەوێ- بەڵام لــە وەختی خۆیا بــە ئــەدەب دانەنــراوە و ناوەکەی لەم ســەردەمەی دواییدا بــۆ دانراوە. هەروەها ئەدەبی ئابووریش دیارە پێشــووتر هەبووە، بەڵام بەر ئەدەبیان نەخستووە!.

وەکوو ئەمە هەیە، ئەوەش هەر هەیە: کە نووســەر و هۆنەر، شتێکی ئاشــکرایە چەشــەیان جیایە، ئەم جیاییە ئەکاتــە کارێ کە هەموو جۆرە وەســپێکی ئەدەبی لە ئەدەبا پەیدا ببێ و چەشــەیتر ترۆمی ئەدەبەکە لەیــەک جیــا کاتەوە. دیســان ئــەو پارچــە ئەدەبەی بەهۆی چەشــەی ئەدیبێکــەوە پەیــدا ئەبــێ، وەکــوو ئــەو چەشــەکەی جیایــە، لەگــەڵ

چەشەی خوێنەر وەیا گوێگرەکەیا، خوێنەر و گوێگرەکانیش لە بەینی خـۆیانا جیاییان بۆ پەیدا ئەبـێ؛ وا ڕێ ئەکەوێ پارچەیەک بە تەواوی خـۆی ئەخاتـە دڵـی خوێنەرێکـەوە و خوێنەرەکـە چەشـەی لەگەڵیا ڕێ ئەکـەوێ، کەچی بـە پێچەوانەی ئەو، پارچە هـەر ئەو پارچەیەیە، خوێنەرێکیتر ناتوانێ چەشـەی خۆی لەگەڵیا ڕێـک خا و هەرچەندە ئەکا ناچێتە دڵیەوە!..

لـەم دوو ڕێ نەکەوتنـەدا بۆ یەک پارچـە، سـەرەتای لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی دەست پێئەکا و لێکۆڵینەوە لەم شوێنەوە هەڵئەستێ!.

لەمەوە وەکوو ئەمەمان بۆ دەرکەوت، ئەوەشمان هەر بۆ دەرکەوت: کـە چەندە ئەدیـب و خوێنەر و گوێگـر زۆر بن، بە ئەنـدازەی زۆری ئـەوان چەمکـی ئـەدەب زۆر ئەبێ، تا ئەگاتـە پایەیەک کە لـە ژمارە نەیەت!!...

# پەیوەندی هۆنراو و پەخشان!

ئـایا چ ئاشـنایەتییەک هەیە لە بەینــی هۆنراو و پەخشـاندا؟.. ئێمە وتمـان: ئەدەب بە گـوزارەی تایبەتی برێتی بوو لە هۆنراو و پەخشـان، هۆنراو: زمانی ویژدان و پەخشـان: زاری ژیری بوو. پەخشـانیش بوو بە دوو جۆرەوە: پەخشـانێ کە لەسەر شـێوەی ئەدەبیی بێ، پەخشانێ کە لەسـەر شـێوەی زانیاریی بێ. جا ئەبێ ئەوە بزانرێ کە ئایا ئاشـنایەتی لەبەینی ئەم هۆنراو و پەخشانەدا چییە و چۆن لەوانەیە یەک بگرنەوە؟.

دیمـەن ـ شـکڵ هەیـە. بابـەت، باس ـ مـەوزۆع هەیـە. دیمـەن پەیکەرەکەیـە، بابـەت وەیا باس چۆنیەتی و چەبوونــی ئەو پەیکەرەیە. ڕەگەز لە هۆنراودا سۆز بوو، وەکوو هەر ئەو سۆزە بوو بە ڕەگەزی شێوەی ئەدەبیـش. لـەم ڕووەوە هۆنراو و شـێوەی پەخشـانی ئەدەبـی، یەکیان گرتـەوە؛ چونکـە یەکـێ لە ڕەگـەزی هەردوو لایان سـۆز بـوو، بەڵام لە دیمەنەکـەدا لێک جیا بوونەوە؛ جیا بوونەوەشـیان لەو دیمەنەدا لەبەر ئەوەیە کە ئاشکرابوون زیاتر لە پەخشانی شێوەی ئەدەبیدا هەیە تا هۆنراو، بەڵکوو ئەم ئاشـکراییە شـتێکە و تایبەتییە بە پەخشانەوە؛ وەکوو چۆن ئەوەش هەیە کە لە پەخشـاندا وەسـپی کەڵک‌لێوەرگرتن بەسەریا زاڵ ئەبێ تا کاریگەری. بەپێچەوانەی هۆنراو، ئەو وەسپی کاریگەری زیاتر بەسـەریا زاڵ ئەبێ تا کەڵک‌لێوەرگرتن. نـەوەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو لە هۆنراودا هێما و جەفەنگ زیاتر دەسـتی هەیە تا ئاشـکرایی، بەڵام لە پەخشـاندا پەردەی ئاشـکراییەکە زۆرترە تا هێما و جەفەنگەکە. هەر

لەبەر ئەمەیە کە ئەڵێن: بناغەی پەخشان بیرە و سۆز، یاریەدەریەتی. کەچی لە هۆنراودا سۆز بناغەیە و بیر یاریەدەریەتی!.

ئەمجا ئاشنایەتی هۆنراو لەگەڵ پەخشانێکی زانیاریدا ئەوەیە: کە پەخشانە زانیارییەکە باسی ڕاستی و چۆنیەتی ڕۆشن کردنەوەی ئەو ڕاستییە و ڕووناککردنەوەی بیروباوەڕ ئەکا، ژێری تیایا فەرماندارە، بیریش ئەبێ بە بناغە بۆی. ئەمە ئەو گوزارەیە نادا بەدەستەوە کە ئەم ڕەگەزانە لە هۆنراوەدا نەبن و نین، بەڵکوو تیایا هەن و زیاتر لەمانەش هەیە، کە سۆز و جۆش و خورۆشەکەیە!..

کەوابوو، لە پلەی یەکەما هۆنراو و پەخشانی زانیاری یەکیان گرتەوە، ئەمجا پاش ئەو پلەیە بەرەبەرە وەسپگەل و شتیتر پەیدا ئەبێ -وەکوو سۆز و خورۆش و ئەو شتانە کە لە هۆنراودا ئەبن و لە بێجگە لە هۆنراودا نابن- کە بە تەواوی جیای ئەکاتەوە لە پەخشان، تەنانەت لە پەخشانی ئەدەبیش!. بەڵام ئەوە دەرکەوت: کە ئاشنایەتی لەبەینی هۆنراو و پەخشاندا پەیدا بوو، وە هیچیان بێگانە نەبوون لەویکەیان!..

# جیایی هۆنراو و پەخشان!

زانرا: کە هۆنراو لە ویژدانەوە هەڵئەستێ و پەخشان لە ژیرییەوە، لەگەڵ ئەوەشا پێویستە وەکوو پەیوەندییەکەیان زانرا، ئەوەش بزانرێ: کە ئەم دووە هەریەکە تایبەتییان بە شتێکەوە هەیە؛ دوور نییە ئەو شتە بەو جۆرە تایبەتییە لەوی‌کەیانا نەبێت. جا لەم شتانەی خوارەوەدا لێک جیا ئەبنەوە:

۱ ـ بێجگە لەوە کە ویژدان هۆنراو دێنێتە ناوەوە، کێش و پێوانە ـ وەزن لە هۆنراودا گەورەتر شتێکە کە لەگەڵ پەخشاندا جیای ئەکاتەوە. جا ئەو کێشە کێشی عەرزووی بێ یا پەنجە. ئەو کێشانە کە لە هۆنراوی کۆندا هەن، وەکوو لە زانیاری عەرووزدا ناو براون، نزیکەی شانزە کێش، پێوانە وەیا بەحرن. ئەمە بێجگە لەوانەی کە تازە داهاتوون. ئەمانەش ناو ئەبرێن بە:

**«طَویل، بَسیط، مَدید، وافِر، کامِل، هَزَج، رَجَز، رَمَل، سَریع، مُنْسَرِح، خَفیف، مُضارِع، مُقْتَضَبْ، مُجْتَثّ، مُتَقارِب، مُتَدارَک»**[1].

ئەم ناوانە کراون بە ترازوو بۆ کێشەکان، بەڵام ئەمانە هەندێکیان زۆرترن لە هەندێکی‌کەیان، هۆنراو بەشی زۆری هەر لەسەر ئەمانە ڕۆیشتوون[2].

---

۱. «هزج»: گۆرانی بە ئاوازەوە. «رجز»: هۆنراو وتن. «رمل»: بارانی کەم. «سریع»: خێرا ڕۆیشتن. «مقتضب»: یەکێ ئیشێکی بخرێتە ئەستۆ پێش ئەوە کە بتوانێ بە چاکی بیکا. «مجتث»: پچڕاو.

۲. بێجگە لەم شانزەیە سێ کێشی‌تر هەیە پێیان ئەڵێن: «جَدید، قَریب، مُتَشاکِل». بەم

## بەڵێ! کێش لە دوای داهاتنی هۆنراو هاتۆتە ناوەوە، وە ئەمانەش

سێیەوە ئەبن بە «١٩» کێش. لەم نۆزدەیە پێنج کێشیان؛ واتە «طویل، مدید، بسیط، وافر، کامل» لە کێشە تایبەتییەکانی عەرەبن، مەبەست ئەوەیە کە غەیری عەرەب بەم کێشانە کەمتر هۆنراویان وتووە، بە تایبەتی فارس و کورد. ئەمەش لەبەر ئەوەیە: چونکە نەچووەتە دڵەوە، با کێشیشی تەواو بووبێ، مادام نەچووبێتەوە دڵەوە پێیان نەوتووە.

سێ کێشی دوایی کە «جدید، قریب، متشاکل»ـن، ئەمانە تایبەتین بە غەیری عەرەبەوە. واتە زمانی عەرەبی لەوانەدا هۆنراوی کەمە.

پانزە کێشەکەی‌تر کە: «هزج، رجز، رمل، سریع، منسرح، خفیف، مضارع، مقتضب، مجتث، متقارب، متدارک»ن، عەرەب و غەیری عەرەب بەمانە هۆنراویان وتووە.

ئەمە و دیسان ئەوەش هەیە: کە پانزە کێش لەم کێشانە، واتە «طویل، مدید، بسیط، وافر، کامل، هزج، رجز، رمل، سریع، منسرح، خفیف، مضارع، مقتضب، مجتث، متقارب» خەلیلی کوڕی ئەحمەدی بەسری «٩٤ ـ ١٧٠ ە» دایهێناون، کە ئەم خەلیلە لە ڕاستیدا داهێنەری زانیاری عەرووز بووە. بۆیەش عەرووزی پێ ئەوترێ، چونکە ئەم «عەرووز ـ عَروض»ـە شوێنێکە لە بەینی «مەککە» و «مەدینە»دا، خەلیل زانیارییەکەی بە ناوی شوێنەکەوە داناوە. هەندێک ناوی ئەم خەلیلە بە خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی ئەبەن. «فەراهید» تیرەیەکە لە عەشرەتی «ئەزد»، لە بنەڕەتا خەلیل لەو عەشرەتەیە، بەڵام خۆی لە بەسرە هاتۆتە دنیاوە و لەوێش مردووە. هەندێکیش ئەڵێن: هاتنە دنیاکەی لە ساڵی سەدی هیجریدا بووە.

کێشی «متدارک» ئەبولحەسەنی ئەخفەش دایهێناوە. کێشی «جدید» لە داهێنراوی «ئەبووزەڕجەمهەر»ە. کێشی «قریب» هی مەولانا یووسفی نەیشاپوورییە. «متشاکل»یش هی زانایەکی ئەم سەردەمیی دواییە.

❋❋

لە شێوەی زانیاریی عەرووزدا «میزان» هەیە، «مەوزوون» هەیە؛ میزان ئەو شتەیە کە وەکوو تەرازوو شتی پێ ئەکێشرێ، وەیا وەکوو پێوانەیەک شتی پێ ئەپێورێ. لە عەرووزدا هۆنراو بەو پێوانەیە ئەپێورێ، ئەگەر وەکوو ئەو و بە ئەندازەی ئەو دەرچوو، ئەوە تەواوە، ئەگەر دەرنەچوو تەواو نییە.

ئەو کێش و پێوانانەش کە لە عەرووزدا هەن وە لەسەر زمانی ئەو بە «ڕُکن» ناو ئەبرێن، هەشت

ـ واتە ئەم کێشانەـ سەرەتا لە هۆنراوی عەرەبیدا پەیدا بوون، بەڵام ئەمە

---

ڕوکنن؛ دوویان لەسەر پێنج پیت ئەڕۆن، شەشیان لەسەر حەوت پیت. ئەوانەش ئەمانەن:
**«١ـ فَعولُن. ٢ـ فاعِلُن. ٣ـ مَفاعیلُن. ٤ـ مُسْتَفعَلُن. ٥ـ فاعِلاتُن. ٦ـ مَفعولاتُ. ٧ـ مُفاعَلَتُن. ٨ـ مُتَفاعِلُن»**.

ئەو شانزە وەیا نۆزدە کێشە کە هەن لەمانە دروست ئەبن، کە دوو وەیا سێیان بە ڕێکی وەیا بە پاش و پێشی ئەکەونە پاڵ یەک. وەکوو لە کێشی درێژا ئەڵێ: «فَعولُن، فَعُولُن، فَعولُنْ، فَعُولْ». وە لە کێشی «مُجتثّ»ـدا ئەڵێ: «مَفاعِلُن، فَعَلاتن، مَفاعلُن، فَعْلان». وەیا لە کێشی «رمَل»ـدا ئەڵێ: «فاعِلاتن، فاعلاتُن، فاعلاتنْ، فاعلُنْ».

✽✽

«**بەیت**» بەلای هۆنەرەکانی عەرووزی عەرەبییەوە بە تاقە هۆنراوێک ئەڵێن و هەر بەلای ئەوانەوە برێتییە لە دوو «مِصْراع» وەیا «مِصْرَع»؛ واتە لە دوو نیوە هۆنراو، ئەمجا هەر نیوە هۆنراوێک چەند «پایە ـ رُکن»ـێکی هەیە.

پایەی یەکەمی نیوەهۆنراوەی یەکەم پێی ئەڵێن: «صَدر». پایەی دووەمی هەر نیوەهۆنراوەی یەکەم ـکە ئەکەوێتە دوایی ئەو نیوە هۆنراوەوەـ پێی ئەڵێن: «عەرووز». پایەی یەکەمی نیوەهۆنراوەی دووەم پێی ئەڵێن: «اِبتِدا». پایەی دووەمی هەر نیوەهۆنراوەی دووەم ـکە ئەکەوێتە دواییەکەیەوەـ پێی ئەڵێن: «ضَرب» وە «عَجُز». پایەکانیتری کە لە بەینی «صَدر» و «عەرووز» و «ابتدا» و «عجُز»دان پێیان ئەڵێن «حَشو» وەیا زیادە و تیاخێنراو.

ئەمجا ئەم پایانە ـکە هۆنراوەکە لەوان دروست ئەبێ ئەمانیشـ لە چەند «پاژ ـ جُزء»ـێک دروست ئەبن. ئەم پاژانەش لە شێوەی بەرەی عەرووزدا ناویان: «سَبَب، وَتَد، فاصلە»یە.

«**سبب**» لەسەر دوو جۆرە: سەبەبی سووک، سەبەبی گران. سەبەبی سووک: وشەیەکە کە تێکڵاو بێ لە دوو پیت، یەکەمیان «جووڵاو ـ مُتَحرِّک» و دووەمیان «نەجووڵاو ـ ساکن» بێ. وەکوو «سەر» لە کوردیدا و «هَل» لە عەرەبیدا. سەبەبی گرانیش: وشەیەکە کە تێکڵاو بێ لە دوو پیتی جووڵاو. وەکوو «گەمە» لە کوریدا و «لَکَ» لە عەرەبیدا.

«**وتد**»یش لەسەر دوو جۆرە: کۆمەڵ و بڵاو ـ «مجموع و مفروق». کۆمەڵ: وشەیەکە کە تێکڵاو بێ لە سێ پیت، یەکەم و دووەمیان جووڵاو و سێیەمیان نەجوڵاو بێ. وەکوو «کەچەڵ» لە کوردیدا و «نَعَم» لە عەرەبیدا. وەتەدی بڵاو: ئەویش دیسان وشەیەکە تێکڵاو بێ لە سێ پیت، یەکەم و سێیەم جووڵاو و دووەمیان نەجووڵاو بێ. وەکوو «شەڵتە» لە

ئـەوە ناگەیەنـێ کە هۆنراوی کـوردی وەیا تەنانەت فارسـیش دوورن لە چەنبـەری ئەم کێشـانە، بەڵکـوو هۆنراوەکانی کوردیـش چ کۆن چ تازە، هەر دەرناچن لە باڵکێشانی ئەم کێشانە بەسەریانا. تەنانەت ئەو هۆنراوە کوردییانەش کە لە پێش داهاتنی کێشدا دانراون، وەکوو هۆنراوەی کۆنی عەرەبـی ئەوانیـش هەر بـەر ئەم کێشـانە ئەکەون![1]. مەبەسـت بەم

---

کوریدا و «ماتَ» لە عەرەبیدا.

«**فاصلە**»ش دوو جۆرە: پچووک و گەورە. فاسیلەی پچووک: وشـەیەکە تێکڵاو بێ لە چوار پیت، سێ پیتی هەوەڵ جووڵاو و پیتی چوارەم نەجووڵاو بێ. وەکوو «کەلەبەر» لە کوردیدا و «سَـکَنُوا» لە عەرەبیدا. فاسیلەی گەورەش: وشـەیەکە کە تێکڵاو بێ لە پێنج پیت، چوار پیتـی هەوەڵـی جـووڵاو، پیتی پێنجـەم نەجووڵاو بێ. وەکـوو «تەڕەدەوەن» لـە کوردیدا و «قَتَلَهُم» لە عەرەبیدا.

١. بەڵێ! ئەوە ئەوترێ: کە هۆنراوی کوردی بەر ئەو کێشـانە ئەکەون، مەبەسـت ئەوەیە: کـە ئـەو کێشـانە «نێوار ـ عەرەز»ێکن و بەسـەر هۆنـراودا هاتوون. هۆنـراو خۆی لە پێش داهاتنی کێشـدا هەبووە و داهاتووە، بەتایبەتی هۆنراوی کوردی ئەو سـەردەمە کە کێش دانەهاتووە ـوەکوو زۆرتری ئەم دەوری دواییەـ هەر لەسەر ژمارەی پەنجە ڕۆیشتووە.
مەبەسـت بەوە کە لەسـەر ژمارەی پەنجە ڕۆیشتووە ئەوەیە: کە ژمارەی ئەوە کراوە، پیتی دەنگدار و بێدەنگ دراون لەیەک و بەو جۆرە هۆنراوەکەی پێ دروست کراوە.
پیتـە دەنگـدارەکان برێتی بوون لە «سـەر ـ فَتْحَە. ژێر ـ کَسْـرَە. بـۆر ـ ضَمَّە» ـکە ئەمانە دەنگداری کورتن ـ وە لە «ئەلف» و «واو» ـواو بە هەردوو چەشنەکەیەوەـ «ی» ـئەویش بە هەردوو چەشنەکەیەوەـ واتە گووشراو و بڵاو لە هەردووکیانا. بێجگە لەمانە ئەو پیتانە کە هەن هەموویان بێدەنگن. مەبەست بەوە کە ئەوترێ بێدەنگن، ئەوەیە: دروستبوونیان بەهـۆی پیتـە دەنگدارەکان و بزووتنەوەی هەردوو زمان لەناو دەمدا بە جۆرێ کە بکەونە شوێنی تایبەتیی ئەو پیتانە، لەگەڵ دەنگێکی ئاوازەدار کە شانبەشانیان بێتە دەرەوە.
جا هۆنراوی کوردی پێش داهاتنی عەرووز، لەسەر ئەم ڕێچکەیە ڕۆیشتووە، پاش ئەوە کە عەرووز هاتە ناوەوە، توانی باڵ بکێشـێ بەسـەریا ـواتە بەسەر هۆنراوی کوردیداـ دیسان ئەمـەش ئـەوە ناگەیەنـێ کە هەر خاڵـی بێ لە هیجا وەیا پەنجە؛ عەرووز بڕوا بەسـەریا یا

> **هۆنراوانــە، ئەو هۆنراوە هەرە کۆنانە نین کە پێش ئیســلامەتی کەوتوون.**

نەڕوا، ژمارەی پەنجەکەی هەر تێدایە.

کـە کەوتـە ئەم سـەردەمی دواییە، وە بـە تایبەتی کە بازاڕی «فولکلـۆر» زیندوو کرایەوە و گۆرانییە نەتەوەییەکان کەوتنەوە برەو، لەسـەر ڕووناکی ئەوانە، جۆری هۆنراو گۆڕا و ئەو قسەیە داهات کە گوایە هۆنراوە دوور کەوتۆتەوە لە عەرووز!..

بەڵـێ! دوور کەوتۆتـەوە، بـەڵام ناتوانـرێ بوترێ بە تەواوی لێی بێبەشـە، وەکوو ناشـتوانرێ بوتـرێ ئـەو هۆنراوانە کە لەسـەر عـەرووز ئەڕۆن بێبەشـن لە ژمارەی پەنجـە!. وەکوو چۆن عەرووز شتێکە و پاش داهاتنی هۆنراو هاتووە، ژمارەی پەنجەش هەروەها پاش داهاتنی ئەو داهاتووە! بە پێچەوانەی «هِجا» ئەو لەگەڵ داهاتنیا شانبەشان لەگەڵیا هاتۆتە خوارەوە..

پاش ئەوە کە ناوی ئەم دووە داهات، ئەڵێین: هۆنراوی کلاسیک لەسەر عەرووز و ڕومانتیک لەسـەر پەنجـە ئـەڕوا. ئەمە وا پیشـان ئەدا کە بوونـی هۆنراو ئەبێ بەهـۆی ئەوانەوە بێ؛ واتـە زانیاریـی عـەرووز و ژمارەی پەنجە هۆنراو دروسـت بکەن!.. لەگەڵ ئەوەشـا وا نییە؛ ئەوانەی پێش مێژووی داهاتنی عەرووز و پەنجە، نە عەرووزیان زانیوە نە ژمارەی پەنجە، کەچـی هۆنراویشـیان وتـووە!. وەیـا وا ئەچێتـە دڵەوە ئەوی عـەرووز وەیا ژمـارەی پەنجە ئەزانێ، پێویسـتە ئەبێ هۆنەریش بێ؛ وەیا ئەوی هۆنراو ئەزانێ پێویسـتە هەردووک وەیا یەکێکیان بزانێ!. لەگەڵ ئەوەشا وا نییە، چونکە زۆرێکی زۆر هەیە هۆنەرە و هیچ عەرووز و ژمـارەی پەنجـەش نازانێ. هۆنراو خورپە و بەشـێکی نهێنییە لە دڵی هۆنەرەکەدا جێگیر ئەبێ، بەهۆی ئەو بەشە نهێنی خواییەوە هۆنراوەکە ئەڵێ، پاش ئەوە عەرووز وەیا ژمارەی پەنجەکەی بەسەرا ئەنوخێنرێتەوە.

مەبەسـت لـەم درێژەپێدانـە ئەوەیـە: وەکوو چـۆن نوخاندنەوەی زانیاری عەرووز بەسـەر هۆنـراوی ڕومانتیکدا، وەکوو کراسـێکی تەسـک و ترووسـک وایە کە کرابێتـە بەر پیاوێکی قەڵەو، نوخاندنەوەی ژمارەی پەنجەش بۆ هۆنراوی کلاسـیک، چەشـنی سەمەرەیە؛ وەکوو ڕەخنـە لـە زانیاریـی عەرووز ئەگیررێ بەچاو ڕومانتیکەوە، چەشـنی ڕەخنـەش ڕوو ئەکاتە ژمارەی پەنجە بەچاو کلاسیکەوە!. ئەوەندە هەیە ئەوترێ: پێویستە ئەندازە و کۆتکەیەک هەبێ بۆ ئەوە یاسـا و ڕەوشـت تێک نەچێ، ئەو ئەندازەیەش دانراوە بە زانیاریی عەرووز و ژمارەی پەنجە.

❀❀

بوونی ئەم کێشانە لە هۆنراودا ئەوە ناگەیەنێ کە پەخشان بە تەواوی بێبەشە لەمانە، پەخشانیش هەر کێشی تێدا هەیە با کەمتریش بێ لە هی هۆنراو. کێش لە پەخشاندا و بۆ پەخشان دیمەن ـ مەزهەرێکە بۆ بەهێزکردنی ڕستەکە و بۆ جوانیی ڕواڵەتەکەیەتی. لەمەوە ئەوە دەرئەکەوێ: کە کێش دیمەنێکی سروشتییە بۆ ڕستە، جا ڕستە هەر ڕستەیەک بێت!..

٢ـ لە هۆنراودا سەروا هەیە، کە ئەم سەروایە نیشانەیەکی هۆنراوی و غەیری کێشەکەیە. سەروا ئەوەیە: کە دوایی هۆنراوەکان لە چەند پیتێکدا وەکوو یەک بن، ئەم وەکوویەکبوونە لە ڕستەی پەخشانیشدا ئەبێت، ئەوەندە هەیە وەنەبێ شتێکی پێویست ـ لازم بێت. بەپێچەوانەی هۆنراو، بوونی لەودا پێویستە.

---

هۆنراو لە کێشی هیجائیدا پێویستە ژمارەی هەر پارچەیەک لەگەڵ ئەویتریا بە ئەندازەی یەک بن. هیجای ئەم نیوە هۆنراوانە لەبەر ئەوە کە بە پەنجە ئەژمێررین، پێی ئەڵێن ژمارەی پەنجە. کێشی عەرووزیش دیسان هەر هیجائییە، بەڵام لە عەرووزدا مەرج نییە ژمارەی پیتی نیوە هۆنراوەکان بە ئەندازەی یەک بن، چونکە کێشی عەرووز لەسەر بڕکەی پیتی جووڵاو و نەجووڵاو ئەڕوا. جووڵاویش لە نووسیندا وەک پیت نانووسرێ، بەڵکوو بە هۆی «حەرەکە»وە دەرئەکەوێ و جۆری بزووتنی پیتەکان پیشان ئەدا، بەڵام لە کوردیدا وا نییە؛ ئەم پیتانە کە هۆی جووڵانی پیتە نەجووڵاوەکانن، خۆیشیان شوێنێکیان لە نووسیندا بۆ خۆیان داناوە!.

ئەمە و دیسان هۆنراوی کوردی، خۆی کەسیەتییەکی سەربەخۆی هەیە و لە ڕیشە و ڕەگەزدا جیایە لە زمانێکیتری وەکوو سامی؛ لەبەر ئەمە، هەرچەندە لەپاش داهاتنی زانیاریی عەرووز، ئەم هۆنراوی کوردییە ـ بەتایبەتی کلاسیکەکەی ـ تێکڵاوییەکی لەگەڵیا پەیدا کرد، بەڵام ئەمە لەو کەسیەتییە سەربەخۆییەی خۆی ناخا کە وەختی خۆی هەیبووە و لەسەر ژمارەی پەنجە و پیت ڕۆیشتووە و ئەڕوا!...

٣ـ وشـەی هۆنـراو ئەبێ هەڵبـژاردە بێت، ئەبێ بـە ئاوازەکەی و بە گوزارەکەی بیروباوەڕ و جۆشـێکی نەفسیی بدا بەدەستەوە؛ واتە: ئەبێ زیادە لەززەت و پیرۆزی و سـۆزێکی مووسـیقایی لە دەنگی وشـەکانا هەبێت، پەخشـانی ئەدەبیـش ئەمەی تێدا ئەبێ، بـەڵام ناگاتە پایەی هۆنـراو، چونکـە هەندە وشـەیەک هەیە لە هۆنـراودا بـەکار ئەهێنرێ، ئەگەر ڕستەپەخشان بێ، ئەو جۆرە وشانەی تیا بەکار ناهێنرێ!..

٤ـ ئەمجا وێنە ئەندێشەییەکان وەکوو: «لێکچوون، خوازە، خواستن، گۆشـە، جوانیی بایـس، دژیـەک[1]»، ئەمانە لە هۆنـراودا هێز و پێز و دیمەنیـان زۆرترە هەتا لە پەخشـاندا، ئەمانە ئەگەر لە پەخشـانا هەبن، ئەبێ زیاتر لا بەلای ئاشـکراییەوە بکەن، پاشان بەلای کاریگەرییەوە؛ مەبەستی یەکەمیش لە هۆنراودا کاریـگەرییە نەوەک ئاشکرایی؛ وەکوو چۆن مەبەست لە پەخشانا ئاشکراییە نەوەک کاریگەری.

لەبەر ئەمە، گۆشـە و خواسـتن زۆرتر لە هۆنـراودا ئەبن، لێکچوون زۆرتـر لە پەخشـانا. ئەم جیاییەش لەبەر ئەوەیـە چونکە: ئیش و کاری هۆنراو کاریـگەریی و پێکهێنانی خورۆشە، ئیشی پەخشان تێگەیاندن و ئاودان و ڕووناککردنەوەی ژیرییە؛ لەبەر ئەمە هۆنراو زۆرتر پێویـستی پێیان ئەبێ، بۆ ئـەوە بە تەواوی کاروباری خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت. پەخشـان، کە وەریان ئەگرێ بۆ سـەرنج و ئاشـکراییەکە، ئەگەر هات و ئەم پەخشـانە لە وەرگرتنی ئەمانـەدا ڕێگای هۆنراوی گرت ـ واتە زۆر

---

١. «دژیەک»: بەرانبەریکردنی دوو شتی نەگونجاون پێکەوە لە هۆنراودا، کە پێیان ئەوترێ: «مُطابَقَه» و «مُتَضاد». وەکوو گەرمی و ساردی، ڕووناکی و تاریکی، شـەو و ڕۆژ، نزمی و بەرزی و...هتد.

لەگەڵیـان خەریـک بوو و زیاد لە ئەنـدازە وەریگرتن- ئەوە لە ڕێگای خۆی لای دا و مەبەستی بەجێ نەهێنا!...

٥- لـە هۆنـراودا سەربەسـتی زیاتر هەیـە، بۆ ئەوە کە وشـە لە هەر شـوێنێکا دابنـرێ دائەنـرێ، ئەمـەش لەبـەر ئەوەیـە کە لـە هۆنراودا پێویسـت بەوە هەیە کە کێش دروسـت بکرێ، لەبەر ئەم پێویسـتییە ڕستە بە جۆرێکی غەیر سروشتی دێتە ناوەوە؛ بەڵام لە پەخشاندا ڕستە لە چەشـنە سروشـتییەکەی خۆی لانادرێ، مەگەر لەبەر مەبەسـتێکی پۆشراوی وەکوو ترساندن و بڕیاردانێک نەبێ!..

٦- هۆنەر لەبەر ئـەوە بتوانێ ڕێکی و نزیـکییەک پەیدا کا لەبەینی کێشـە هۆنراوییەکانا و لە بەینی وشە هەڵچنراوی زمانییەکانا، ئەبێ پەنا بەرێتە بەر یەکێ لەم دوو شتە:

یا ئەبـێ گـوێ بـە کێش نـەدا ـکـە دیارە ئـەم گوێنەدانـە زیان و ناڕێکیـی بـە هۆنراوەکـە ئەگەیەنـێ، چونکـە ڕسـتەکە بـە جۆرێکـی سروشـتیی نایەتە ناوەوە-. یا ئەبێ وشـە لە شـوێنی خۆیا دانەنێ ـکە لەمەدا پێویستییە هۆنراوییەکە پەیدا ئەبێ و ئەوە دێتە ناوەوە کە ئەڵێ: «ئـەوی بۆ هۆنەر دروسـتە، بۆ بێجگـە لە هۆنەر دروسـت نییە»-. ئەم قسـەیە ئەوە ئەگەیەنێ: کە هۆنەر ئەتوانێ بە هەموو جۆر بۆ ڕێکەوتنی هۆنراوەکەی، دەسـتکاری وشـەکە بکا؛ وەکوو لێی کـورت بکاتەوە، وەیا درێـژی بکاتـەوە!. ئەمانەش بۆ ئەوە ئـەکا کە مووزیقـای هۆنراوەکەی دروست بکا؛ دیارە ئەم جۆرە شتانە لە پەخشاندا نییە. کەوابوو، بەمەش پەخشان لە هۆنراو جیا بووەوە.

٧- لەبـەر ئـەوە کـە هۆنراو زیاتـر ئەکەوێتـە ناو هونـەرەوە و زیاتر

بارووی هونـەر دروسـت ئەکا، زۆرتـر لا ئەکاتەوە بـەلای کورتبڕییەوە، لەبەر ئەمە ئەتوانێ هەر ڕەگەزە سەرەکان بێنێتەوە لە ڕستەکەیا. وەکوو: «مُسـنَد» و «مُسْـنَد إلَيْه»، یا هەر یەکێکیان، یا «مُقَدّمات» باس بکا و نەتیجە خۆی لە خۆیا دەرکەوێ؛ یا نەتیجە بڵێت و واز لە موقەددەمات بێنـێ؛ یا پیتـی پێبەسـتنەوە ـ حەرفی ڕەبـت ـ زۆر بێنـێ. هەروەها لا بکاتـەوە بـەلای هێما و جەفەنگەوە و هیچ پێویسـتیی بـە دەربڕین و گوزارشـت لێدانـەوە نەبـێ. بـەڵام ئەمانە هیچیـان لە پەخشـانا نابن، چونکە پەخشـان ڕسـتەیەکە ئەگەر شتی جیای لە ئاشـکرا تێدا هەبوو، لەوانەیە لە پەخشانیی بکەوێ!..

٨ ـ هۆنراو بە پیت و گوزارەکان ئەناسرێتەوە، پەخشان وا نییە؛ واتە: هۆنراو ئەگەر وشـەکان و ڕێختەکەی نەمێنێ، سـەری تیا ئەچێ، بەڵام پەخشـان ئەگەر خودی وشەکانیشـی نەمێنـێ، گوزارەکـەی ئەمێنێ و ئەخرێتە ناو چوارچێوەیەکی ترەوە؛ هەروەها هۆنراو ئەگەر «نَصّ»ـەکەی نەمێنێ و بخرێتە قاڵبی چەشـنە وشـەیەکی ترەوە، ئەوە نابێ ناو بنرێتە هۆنراو!. هەر لەبەر ئەمەیە بۆیە ئەو هۆنراوانە کە وەرئەگێڕرێن، ئیتر لە هۆنراوی دەرئەچن و ئەو ناوەیان نامێنێ!..

٩ـ دیسـان لە شـێوەی هۆنـراودا وەسـپێکی تری تایبەتـی هەیە، کە ئەمـە پاکژیی هەموویەتی و لەگەڵ چەشـەی هۆنەردایـە؛ هۆنەر ئەو هۆنـراوە کـە دائەڕێژێ، سروشـتەکەیەتی کەوا هێـز و جوانیی ئەدا بە هۆنراوەکـە و بـەو هۆیـەوە کەسـیەتییە هونەرییەکـەی دەرئەکـەوێ. لەبەر ئەو سروشـتەیە، بۆیە ئەوانەی کە لـە هۆنراو ئەکۆڵنەوە، ئەکەونە سەرسـامییەوە و ناوی ئـەو کەسـیەتییە هەندێ جار بـە «بلیمەتی» و

هەنـدێ جار بـە «بەش» و هەندێ جار بە «خورپـە» ئەبەن!. چونکە ئەگـەر هۆنەرەکە خۆی بێنی، ناتوانێ ئـەو لێکۆڵینەوەیە لە هۆنراوەکەی خۆیا بکا، وەکوو یەکێکی‌تر کە ئەیکا!!..

❋❋❋

# دەسەڵاتی پەخشان لە ئەدەبدا!

کە باسـی ئـەدەب ئەکـریّ، زۆرتر ئـەوە بـە دڵا دێت: کـە ئەدەب بریّتی بیّ لە هۆنراو، وەیا ئەو ئەنجامانە کە هۆنراو ئەیدەن بەدەستەوە، پەخشـان ئـەوەی پـیّ ناکریّ؛ لەبـەر ئەوە ئەبـیّ هۆنراو پایـەی هەرە بـەرز بگریّ بۆ خۆی!!...ئەم واچوونەدڵـەوەش لەبەر ئەوە بووە کە دوور نەبووە تا ئێسـتا لە زمانی کوردیدا لێکۆڵینەوە و شیکردنەویەکی زانیاری بەرانبەر بە شـیکردنەوەی ئەم دووە نەکرابیّ!. بەڵکوو هەر ئەوە زانراوە: کە ئەدەب هۆنراوە و ئەوی پەخشان بیّ پایەیەکی وای نییە!. جا لەبەر ئەوە، پێویسـتە ئێمە لـە چەبوونی زانیاریی ئـەم دووە تۆزیّ بکۆڵینەوە، بـۆ ئەوە پلـەی هەردوو لایمـان بەرانبەر بـە شـیکردنەوەی زانیاریی بۆ دەرکەویّ:

وەکـوو تێگەیشـتین: هۆنراو لەسـەر سـۆز و پەخشـان لەسـەر بیر هەسـتاون؛ بیر بۆ هۆنراو یاریـەدەری سـۆزەکەیە، سۆزیش بۆ پەخشان یاریـەدەری بیرەکەیە. کەوابوو ئەدەبێکی هۆنـراو ئەگەر بیرەکە یارمەتی نـەدا، بە ئـەدەب ناژمێرریّ، وەکوو ئەدەبێکی پەخشـان ئەگەر سـۆزی لەگەڵ نەبیّ بە ئەدەب دانانریّ!..

لەمـەوە ئـەوە دەرکەوت: کـە ئەدەب سـۆزە و بیـر؛ پاژی دووەم لە ئەدەبـی هۆنـراو بوو بـە بیرەکە، کـە ئەم بیـرە پاژی یەکەمـی ئەدەبی پەخشـانە. ئەو هۆنراوەی کە بـە ئەدەب دانراوە، بەبـیّ یاریـەدەرەکەی ناتوانـیّ بەرگی ئەدەب بکا بە بەردا، کە ئەم یاریـەدەرە یەکەم بەشـە بۆ

ئەدەبێکی‌تر ـکە ئەدەبی پەخشانەـ.

کەوابـوو، دەرکـەوت: کـە پەخشـان دەسـتێکی زۆری هەیـە لـە دروستکردنی ئەدەبدا و ئەتوانرێ بوترێ: ئەدەب بەبێ پەخشان دروست نابێ، دروستنەبوونەکەشـی لەبـەر ئەوەیە ـوەکوو وترا ـ: ئەم لەسـەر بیرێـک دروسـت ئەبێ کە ئەو بیرە پاژێکی هۆنراوە. ئەمە وا ئەگەیەنێ کـە لە نەبوونی ئـەم، هۆنراوەکەش نابێ؛ چونکـە نەبوونی پاژ، نەبوونی «هاماو ـ کُلّ»ـە!. کەوابوو دەسەڵاتی پەخشان لە دروستکردنی ئەدەبدا بە ئەندازەی دەسەڵاتی هۆنراوە!...

# پەخشانی زانیاریی

پەخشانی زانیاری ـکە ئەمە یەکێکە لە دوو لقەی پەخشانـ برێتییە لە:

«وتار ـ "مَقالَـة". مێـژوو ـ تاریـخ ـ ژیان‌نامە ـ "سـیرَة". وتوویرە ـ "مُناظَرة". دانان ـ "تألیف"»...

کە هەریەک لەمانە مەیدانێک ئەگێڕن و سووچێک لە سووچەکانی ئەدەب دروست ئەکەن. وەکوو چۆن پەخشانی ئەدەبیش برێتییە لە:

«وەسـپ، "رِوایَة" ـکە گێڕانەوەی باسێکەـ.، "مَقامَة" ـکە خوتبە وە یا ئامـۆژگاری وە یا گێڕانەوەی باسـێکە لە کۆڕێکا و بەسـەر کۆمەڵێکاـ. "رِسـالَة" ـکە ئـەو نامەیەیە وا ئەنێرڕێ بۆ یەکێکی‌تـرـ. خەتابە». بەبێ گومان ئەگەر ئەم هەموانە نەبن، ئەوە ئەگەیەنێ کە بەشـێکی زۆر زل لە ئەدەبا نەبووە.

ئەمێنێتەوە سـەر ئـەوە بزانین: ئەم ڕەگەزانە کە ئەدەبی پەخشـانی زانیاریی لەوان دروست ئەبێ، چین و چۆن باس ئەکرێن؟..

**«وتار»**؛ وتار، لە پەخشانی زانیاریدا ئەوەیە: کە نووسەرەکە باسێکی زانیاری، یا ئابووری، یا کۆمەڵایەتی یا شتێکی‌تر دێنێ و لەسەری ئەڕوا و شەرحی ئەکا، بە بەڵگە بە خەڵکی ئەسەلمێنێ و ئەیباتە دڵیانەوە. وەکوو ئەمەیە، ئەوەشـە کە ئەو نووسەرە باوەڕێکی تایبەتی خۆی وەیا بیرێکی تێکڕایی هەیە، ئەو دێنێ ئاشکرای ئەکا و لەسەری ئەڕوا.

**«مێـژوو»**؛ لە مێـژوودا دوو باوەڕ هەیـە: کە ئایا مێـژوو زانیارییە یا

ئەدەب؟..

ئەو کەسە کە تەماشای مێژوو ئەکا، بەو چاوەوە: کە مێژوو کارەسات کۆ ئەکاتەوە و مێژوونووسەکە لێی ئەکۆڵێتەوە و باسی بابەتەکانی ئەکا [و] ئەڵێ: ئەمە زانیارییەکە وەکوو زانیاری «زەویناسین - ژیۆلۆژی» تەنها هەر ئەمە و هیچیتر؛ واتە کە ئەڵێ: زانیارییە، مەبەستی ئەوە نییە کە زانیارییەکە وەکوو زانیاری «گەردوون - فەلەک» کە پێویست بە بینین و تاقیکردنەوەی ڕواڵەتی بێ. وەیا وەکوو زانیاری کیمیا کە پێویستی بە تاقیکردنەوەی کردەوەیی بێ، بەڵکوو ئەڵێ: زانیارییەکە تەنها بۆ لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەیە.

ئەو کەسەش بەو چاوەوە سەیر ئەکا: کە پێویستە بۆ مێژوو بیرێکی وردی نازکی نووسەرەکە هەبێ بۆ ئەوە بتوانێ کارەساتەکان ڕێک بخا و وەکوو ئەڵقەی زنجیر بیانهۆنێتەوە و گیانێکیان بکا بە بەرا و دەسەڵاتێکی تەواوی لە ڕێکخستنی ڕستەدا هەبێ؛ جا ئەو کەسە لەم ڕووەوە ئەڵێ: مێژوو بوو بە ئەدەب و نەبوو بە زانیاری!.

مێژوویش دوو ڕەگەزی هەیە: یەکێ «مایە»کەی، یەکێ ڕێگای ڕێکخستنەکەی -کە شێوەی ژیری و ڕێچکەیەتی-.. مایەکە بریتییە لە: کارەسات و هاڵوهەواڵی ڕابووردوو، ڕێچکە و شێوەی ژیرییەکەش بریتییە لە کۆکردنەوەی کەرەستە و بەڵگەی مێژوویی و لێکۆڵینەوە و گوزارشت لێدانەوەی.

**«ژیاننامە»**؛ ژیاننامەش مێژوویەکی تایبەتییە بە ژیانی تاقە کەسێکەوە کە ئەوەش بە زۆرتر سێ ڕێگای هەیە:

یەکەم ئەوەیە: کە ئەم مێژوونووسە ژیانی یەکێکیتر ئەنووسێ، بە

هەموو جۆر لە لایەن ڕەخنەگرتن و ڕستە دانانەوە ئەتوانێ سەربەستیی خۆی بنوێنێ[١].

دووەم ئەوەیە: کە ئەم مێژونووسە ڕێگایەکی دووربڕی؛ واتە: دێنێ بیروباوەڕی ئەو کەسە کە ئەو لێی ئەنووسێ، ئەینووسێ؛ بەبێ ئەوە ئەو هیچ ڕەخنەیەکی لێ بگرێ، وەیا بگەڕێ بەشوێن ڕستەی جوانی ئەو کەسەدا و بیهێنێ، بەڵکوو لەوانەیە گەلێ شتی بێکەڵکیشی هەر باس ئەکا[٢].

سێیەم: ئەو ژیاننامەیە کە ئەو ئەینووسێ، باسی ژیان و ڕابواردنی خۆی ئەکا و نووسینەکەی لە ئاقاری خۆی دەرناچێ[٣].

«**وتوویـره**»؛ ئەمەش ئەوەیە: کە دوو کەس لە باسێک ئەدوێن و قسەی لێوە ئەکەن، هەردوو لایان بە بەڵگە دێنە ناوەوە بۆ ئەوە ڕاستییەکە دەرکەوێ.

هەرچەندە مەبەست بە وتوویـره ئەمەیە کە وترا، لەگەڵ ئەوەشا جیاییەک لە مەبەستەکەیدا هەیە لە بەینی وتوویرەی ئێستا و هی سەردەمی پێشوودا؛ مەبەست لە وتوویرەی ئەم وەختەدا بە تەواوی دەرکەوتنی ڕاستییە، بە پێچەوانەی سەردەمی پێشوو، لەوا زیاتر بۆڕدانی بەرانبەرەکەی بووە.

لە وتوویرەدا ڕستە و شێوەی وشەیی کارێکی زۆر ئەکاتە سەر

١. وەکوو ڕێگای «سەجادی» لە ژیانی مەلای جزیریدا. وەیا «خاڵ» لە ژیانی موفتی زەهاویدا.

٢. وەکوو ڕێگای «ڕشتەی مرواری».

٣. لە کوردیدا شتێکی وا نییە.

بەرانبەرەکـە، لـەم ڕووەوە وەنەبـێ جیاییەکـی هەبـێ لەگـەڵ وتار و خەتابـەدا. بەڵام لە لایەکی تـرەوە لەوان جیا ئەبێتەوە؛ لـەوەدا کە ئەم ـواتـە وتوویـرە ـ بەسـتراوە بـە بەرانبەرەکەیەوە، چونکە بناغە و باسـی وتوویرەکە هەر لەسەر ئەو شتە ئەڕوا کە هۆی تێک گیرانەکەیانە. ئەبێ هـەردوو لایان چـاویان لەوە بێ، شـتێک کـە بە کەڵکی باسـەکەیان نەیـەت و لەو کەمەیە دەرچێت، نەیڵێن. ئەگەر هات و یەکێک لەوان پێویسـتیان کەوتە لای شـێوەی خەتابە، ئەم پێویسـتییەش بۆ ئەوە کە بتوانێ کار بکاتە سـەر بەرانبەرەکەی، ئەبێ زۆر خۆی لەوە بپارێزێ کە بـە تەواوی نەچێتە ناو جەرگی ئەو شـێوە خەتابەیەوە، چونکە وتوویرە لە پێش هەموو شتێکا باسێکی ژیری و پێ سەلماندنە و هیچی‌تر؛ واتە: ئەیەوێ لە ڕێگای بەڵگەی ژیرییەوە ویسـتەکەی خۆی بسـەلمێنێ بە بەرانبەرەکەی.

**«دانان»**؛ دانان، لەگەڵێ شتا ئەبێ، لە ژمارە و هەندەسە و گەردوونە، لە ئەدەب، لە سروشـتی و کۆمەڵایەتی و شتی‌تریش. هەریـەک لەمانە دیارە کارێکیـان هەیـە بۆ دروسـتبوونی دانراوەکە، هەروەها کەسـیەتی دانەرەکەش کارێکی‌تر ئەکاتە سەر دانراوەکە.

دانەری وا هەیە لە کاتێکا کە شتێک ئەنووسێ، شتەکەی هەموو لە ژێر پەردەیەکی زانیاریدایە، واتە ئەو گفتوگۆ و دوانە کە لەو شتە ئەدوێ و قسـەی لێوە ئەکا، هەمووی پەردەی زانیاری بەسـەرا ئەکێشـێ، زۆرتر ئەگەڕێ بەشـوێن شتی ڕاستیدا، لە ئەفسـانە و ڕازونیازی گوێ‌ئاگردان خۆی دوور ئەخاتەوە، بەڵکوو بە گیانێکی زانیاریی گوزارشت لە هەموو

شتەکان ئەداتەوە[١].

دانەری واش هەیە کە شێوەیەکی چیرۆکیی وەرئەگرێ لە دانراوەکەیا، واتـە: وەکـوو ئەوەیە کـە گۆیا لەگـەڵ مەردمی ئەو سـەردەمە ژیابێت و لەگەڵیـان بووبێت، ئەوەندە هەیە کارەسـاتەکە بە شـێوەیەکی جوان ئەگێڕێتەوە، ئیتر بۆ لێکۆڵینەوە و چوونە بنج و بناوانیەوە خۆی نابەستێ بە ڕێچکەی زانیارییەوە[٢].

جـۆرە دانەرێکیتریـش هەیـە کـە وەکـوو ئەدیبێکـی زانا کورتیی کارەسـاتەکە ئەگێڕێتەوە، بەڵام لە شوێنە گرنگەکانیا، گێڕانەوەکەشی بە جۆرێکە وەکوو دەمەتەقێ بێ لە بەینی دوو کەسدا.

١. وێنەی ئەمەشیان هەر وەکوو ڕێچکەی «سەججادی» لە ژیانی «ئەحمەدی خانی»ـدا.

٢. وێنەی ئەمەیان وەکوو ڕێچکەی «دوکتۆر ڕەحیمی قازی» لە چیرۆکی «پێشمەرگە»کەیدا.

# ترۆمی پەخشان![1]

ئەمانەی پێشوو کە باس کران، بەراوردێک بوو لە بەینی پەخشان و هۆنراودا. لە لایەکی تریشەوە ئەوە بوو: پەخشان بوو بە دوو بەشەوە: پەخشانی زانیاریی، پەخشانی ئەدەبیی. پەخشانی زانیاری برێتی بوو لە: «وتار، مێژوو، ژیاننامە، وتوویرە، دانان». پەخشانی ئەدەبیش برێتی بوو لە: «وەسپ، گێڕانەوەی باس، خوتبە وەیا ئامۆژگاری وەیا گێڕانەوەی باسێک لە کۆڕێکا و بەسەر کۆمەڵێکا، نامە، خەتابە».

ئەمجا بێجگە لەم بەشکردنە کە لەم پەخشانەدا کرا، لەلایەکی ترەوە بە جۆرێکی‌تر هەر ئەم پەخشانە -ئەدەبیی بێ یا زانیاریی- ئەبێ بە سێ جۆرەوە:

**یەکەم:** پەخشانێکی ڕووتی سادە کە دوورە لە هەموو جۆرە خۆعەزیەتدانیك بۆ دانانەکەی، وە ڕووتە لە هەموو پیشەیەکی بەلاغی. ئەمەیان دیارە زۆرتری پەخشانە زانیارییەکە ئەگرێتەوە.

**دووەم:** پەخشانێکە کە خاوەنی کێشی بێ‌سەروایە؛ واتە مەوزوون و بێ‌قافیە؛ کە ئەمە لەلای زانایانی بەلاغە پێی ئەڵێن: **«نَثْر»ی «مُرَجَّز»**.

**سێیەم:** پەخشانێکە خاوەنی سەروادار و هیچی‌تر؛ واتە: سەرواداری هەیە، بەڵام کێشی نییە؛ کە لەلای زانایانی بەلاغە پێی ئەڵێن: «نَثْر»ی «مُسَجَّع».

بەشی یەکەم پێویست بە قسەلێوەکردن ناکا، چونکە ئاشکرایە.

---

١. ترۆم: نەوع.

بەشـی دووەم ـکە خاوەنی کێشـی بێسـەروایە- واتە لەگەڵ یەکێ لـە کێشـەکانی هۆنـراودا ڕێ ئەکـەوێ؛ بـەڵام وەنەبێ ئەو ڕسـتانە کە ئەهێنرێنەوە هەموویان یەک سەروایان هەبێ[1]. وێنە بۆ ئەم بەشەیان وەکوو ئەڵێ:

**«ڕشتەی مرواری قسە و باسیە، نەوای قومرییان وێنەی ڕازیە. بیرە وردەکەی خوراکی گیانە، قسەی ڕەوانی تەلی کەمانە»**[2] لێرەدا کێش هەیە، بەڵام سەروا جیایە.

دیسـان ئەمە و بێجگە لەمەش: ئەو ڕسـتانە کە دائەنرێن، با ئەگەر هات و وەکوو کێشەکانیان ڕێک بوو، سەرواکانیشیان هەر ڕێک بوون، وەکوو ئەم ڕستەیە کە ئەڵێ:

**«قەڵەم کە نووسی نەخشی زەڕ کفتی، شەیدای دەنگێ بوو کەوا ژنەفتی. ئەو دەنگە دەنگی نەوای خانیی بوو، شمشاڵی گیانی نەوجەوانی بووا.»**[3] پێویسـتە لەگـەڵ ئەم ڕێکی کێش و سـەروادا، دانەرەکەی نیـازی ئـەوەی لەگـەڵا هەبێ کـە ئەمـە هۆنـراوە، ئەگەر ئـەو نیازەی لەگەڵا نەبوو، نابێ بە هۆنراو، بەڵکوو هەر بەر پەخشـانە خاوەن کێشـە بێسەرواکە ئەکەوێ و وەکوو ئەم ڕستەیە لێ دێتەوە کە ئەڵێ:

**«هاژەی قەڵبەزەی شەتاوی بەفراوان، لەگەڵ نەوای ڕۆحەفزای بولبولان تێکلاوە، ڕەشماڵی پڕ لە ماڵی وەک ڕەشخاڵی گۆنای ئاڵی ناو دەسماڵی دڵخوازان هەڵدراوەا»**[4].

بەشی سێیەم کە پەخشانی سەرواداره و کێشی نییە، ئەمەش ئەبێ

---

١. مەبەست بە سەروا پێش سەرواشە.

٢ و ٣ و ٤. مێژووی ئەدەبی کوردی.

بە سێ جۆرەوە:

«(١) هاوڕوو ـ مُتَوازی. (٢) هاوسەر ـ مُطرَّف. (٣) هاوکێش ـ مُتَوازِن».

بەشـی یەکـەم ـ کە هـاوڕووە- ئەوەیە: کـە لە دوایی دوو ڕسـتەی لەشـوێن‌یەکەوە دێن. ئەمـە لە لایەن کێش[1] و ژمـارەی پیت و پیتی دواییـەوە «حَرْف»ـی «رَوِيّ» ـکـە پیتـی بنچینەیـی سـەرواکەیە و ڕاوەستانی سەرواکە لەسەر ئەوە- یەکن. وەکوو ئەم ڕستەیە کە ئەڵێ:

**«دڵۆپی بارانی بێ ژمارەی خۆشبەختی، هەموو لایەکی گرتبوو، خوانی فراوانی بێ ئەندازەی، هەموو سووچێکی پڕ کردبوو»**. وەیا ئەڵێ: **«خۆشخوان و خۆشنەوا، شۆڕشگێڕ و بێ‌پەروا»**.

بەشـی دووەم ـکە هاوسـەرە- ئەو سـەروادارانەن کە لە دوو وەیا لە چەنـد ڕسـتە و بەندێکی بەشـوێن‌یەکدا دروسـت ئەبـن. ئەمەیان لە لایەن کێش و ژمارەی پیتەوە وەکوو یەک نین، بەڵام لە پیتی دواییدا[2] وەکوو یەکن. وەکوو لەم ڕستەیەدا کە ئەڵێ:

**«تیشکی ڕۆژ لەو دانگی ئێوارەدا لەسەر زەنگۆڵی بەفر لەو بنارەدا، وەکوو ڕەنگی شاپەڕی پەری خەرمانەی داوە؛ گوڵۆپ‌گوڵۆپ لە دڵۆپ دڵۆپی ئەو بەفراوە بە ڕیز وەستاوە، وێنەی بێ‌وێنەی ڕۆژیان پیا ئاڵاوە!»**[3].

وەیا ئەڵـێ: **«وەفا نەبوو کە تۆ لە دیاری کامەرانیی چاوێ نەڕێژیت،**

---

١. مەبەسـت بەم وشـەی کێشـە: بەرانبەریکردنە، واتە: لە لایەن بەرانبەریکردن و ژمارەی پیت و پیتی دواییەوە یەکن.

٢. مەبەست بە پیتی دوایی، دوایی تەواوی ڕستەکەیە، نەوەک بەشێک لە ڕستەکە.

٣. مێژووی ئەدەبی کوردی.

**لە بازاڕی ژیانا بەرگێ نەپۆشیت، لەناو یارانا بیرێ نەبەخشیت!»**.

بەشی سێیەم ـکە هاوکێشەـ ئەو سەرواداراننەیە کە لە دوو وەیا چەند ڕستەیەکی یەک بەشوێن یەکدا دروست ئەبن، (ئەمە لە پەخشان و هۆنراودا هاوبەشن) لە کێشدا بەرانبەرن، بەڵام لە پیتی دواییدا جیا ئەبنەوە. لە پەخشاندا وەکوو ئەم ڕستەیە کە ئەڵێ:

**«بیری لەپڕ فڕیوە سەرەوژوور لەو ئاسمانی شینەوە، هێناویە گوڵدەستەی شیعرێ، خاڵییە لە کەم و زۆری کین، داویە بەدەست ئەو کەسانەوە وا چاوەڕێی ئەدەب و تینووی ئەون!»**.

لە هۆنراویشدا وەکوو ئەم هۆنراوەی «مەحوی» کە ئەڵێ:

**لەسەرخۆچوونە، شەیدابوونە، قوڕپێوانە، سووتانە**
**هەتا مردن مەحەببەت ئیشی زۆرە، ڕێزی لێ دەگرم!**

# ترۆم و مەبەسی هۆنراو[١]

شتێکی‌تر هەیە شناساندنی ئەدەب ئەیگرێتەوە؛ وەکوو ئەوە کە ئەوترێ چەمکی ئەدەبی سەرۆکی ـ بە چاوپۆشی لە پەخشان و هۆنراو ـ وەکوو ئێمە لەسەر چەشەی زمانی خۆمان وتمان: کۆن و نوێ وەیا لەسەر گوزارشتی تازە ئەڵێین: کلاسیک و ڕۆمانتیک.

کلاسیک، هەر لە سەردەمی یونانییەکانەوە هەبووە و تایبەتی بووە بە چین وەیا ڕێچکەیەکی تایبەتییەوە؛ واتە: بە سەر و باڵای ئەو چینەوە یا بەو ڕێچکەیەدا هاتۆتە خوارەوە. لەودا زۆرتر بایەخ دراوە بە ڕازاندنەوەی وشە. پاش ماوەیەک بەرانبەر بە کلاسیک ئەدەبی ڕۆمانتیک پەیدا بوو؛ ئەم، ئەو یاسا پێشووەی تێک دا، لەباتی ئەوە خەریک بێ هەر بۆ چینێک، دەستی دا بە خزمەتکردنی هەموو کەسێکەوە. سۆز کەوتە جووڵە، گوزارە زاڵ بوو بەسەر وشەدا. لە ڕاستیدا ئەم ڕۆمانتیکە ئەدەبی لەو چوارچێوە تەنگە ڕزگار کرد و دای لە شەقەی باڵ بۆ ئاسمانی خەیاڵ!...

ماوەیەکیش بەم جۆرە ڕۆمانتیک لەگەڵ ئەندێشەدا خەریک بوو، وردەوردە وای لێ هات لە چۆنیەتی بناغەی کارەسات دوور کەوتەوە!. داهاتنی شتی تازە و پێشکەوتنی پیشەسازی، ڕۆژبەڕۆژ بۆ پێشەوە بە گوڕ سنگی ئەنا؛ ڕۆمانتیک لە دەریای خەیاڵەکەی خۆیدا نقوم بووبوو، پێی نەئەکرا لا بکاتەوە بەلای ئەم شتە داهاتووە تازانەوە و بەلای چۆنیەتی

---

١. ترۆم: نەوع. مەبەس: غەرەز ـ "غَرَض ـ أغْراض".

ڕووداوەوە!.. لە ئەنجاما ئەدەبێکی‌تر بە ناوی ئەدەبی «سەریالی»یەوە پەیدا بوو، کە بەتەواوی لەگەڵ چۆنیەتی ئەم شتانەدا بگونجێ!..[1] بەم جۆرە کلاسیک، ڕومانتیک و سەریالی پەیدا بوون، وەیا بەرەبەرە ئەم ناوانە بۆ ئەو جۆرانەی ئەدەب داهات. لەمەوە وا ئەچێتە دڵەوە کە لەبەر ئەوە ئەدەبی سەریالی شۆڕشی پیشەسازی و شتی تازەبابەت دای‌هێناوە و ناوی «واقِعی» داوتێ؛ واتە ئەمەیان بە تەواوی لە چۆنیەتی شتەوە قسە ئەکا، وا ئەچێتە دڵەوە لە سەردەمەکانی پێش داهاتنی ئەمدا؛ واتە:

---

١. وەیا بە گوزارشتێکی‌تر ئەڵێین:

ئەدەبی کلاسیک پاڵ ئەدا بە عەقڵەوە، واتە ژێری حوکم ئەکا بەسەریا، زاراوەی زمان «قَواعِد»ی «لُغَة» لەوا بە مەرج گیراوە. هەروەها ئەم ئەدەبی کلاسیکە زیاتر مەیل ئەکا بەلای شوێنپێ هەڵگرتنی کۆنەکانەوە، وەکوو «اِغریق» و ڕۆمان. ئارەزووی لە نیزام و بەستنەوەی شتە بۆ ئەوە هەرکە بۆ خۆیی ڕوو نەدا. پاڵ ئەدا بە بیر و قەرێحەوە، گوێ بە «اِنفِعالات» نادا. بە کورتی مەزهەبێکە ئارەزووی بەلای گەورەکانەوەیە و سروشتی لە سروشتی ئەوانایە!.

ئەدەبی ڕومانتیک پشت ئەدا بە تاک «فەرد»ەوە، ئەیەوێ لە قیوودی کۆمەڵایەتی ڕزگاری بێ، بەڵکوو ئەیەوێ کە نەفسی ئینسان ڕزگاری بێ لەو زنجیرانەی کە پێی بەستراونەتەوە؛ گیانی تاکیی زیاد کرد؛ واتە تاک پاڵ بدا بە خۆیەوە، ئەو تاکەی خستە سەر ئەوە کە ڕەشبینی، زۆر بیر کردنەوە لە کاروباری ئایینی، وردبوونەوە لە کەون و لەو ئاشنایەتییە کە ئینسان هەیەتی بە کەونەکەوە، ئەمانە بکا بە نیشانەی خۆی.

لە بەینی کلاسیک و ڕومانتیکدا مەزهەبێکی‌تر جگە لە «سەریالی» پەیدا بوو بە ناوی «پارناسی»ـیەوە.

«پارناسی» دەستەیەکن نیسبەتی خۆیان ئەدەنە لای «پارناس» ـ کە کێوی «ئەپۆلۆن»ـە لە یونان و بەلای یونانییەکانەوە خوای هۆنراو بووە!. گوایە ئەمانە ئەڵێن: سرووش لە خوای شیعرەوە وەرئەگرن و بەم هۆنراوانەیان خۆیان لە پایە و ڕیزی ڕەمەکی مەردم دوور ئەگرن!.. هەروەها بە گرتنی ئەم ڕێگایەیان ئەیانەوێ بگەڕێنەوە بۆ کلاسیکی یونان.

لە سەردەمی کلاسیک و ڕۆمانتیکدا ئەبێ «واقِـع» نەبووبێ!. لەگەڵ ئەوەشا وا نییە، بەڵکوو لە هەموو سەردەمەکانی کلاسیک و ڕۆمانتیکدا چۆنیەتییەک هەر هەبووە؛ ئەدەبێک هەر هەبووە کە قسە لە ڕاستی کارەساتەوە بکا، بەڵام نە بە ئەندازەی سەردەمی سێیەم کە سەردەمی سەریالییە. بە وێنە چۆنیەتییەکانی «هومیروس»ـی یونانی سەدەی نۆیەمی پێش میلاد و «شکسپیر»ی ئنگلیزی «١٥٦٤ ـ ١٦١٦»، وەیا لە ناو ئێمەدا «ئەحمەدی خانی» «١٦٥٠ ـ ١٧٠٦» کە هەریەکە خاوەنی قوتابخانەیەکی سەربەخۆ بوون لە سەردەمی خۆیانا، ئەوەمان پیشان ئەدەن کە لەگەڵ کلاسیک و ڕۆمانتیکیشدا ئەو ئەدەبە کە ئەیلێن، هەر هەبووە، ئەوەندە هەیە لەو سەردەمانەدا ناوەکەی نەبووە، ئەگینا ناوک هەبووە!..

دیارە ئەم قسانە کە وتران بەچاو هەموو ئەدەبی گێتییەوەیە، واتە ئەدەبی ڕووت ـ مُطْلَق ـ نەوەک هەر بەچاو ئەدەبی کوردییەوە.

❃❃

لێرەدا بۆ ئەوە باسەکەمان بە تەواوی بۆ دەرکەوێ، ئەگەڕێینەوە سەر باسی هۆنراو. جارێ هۆنراو ئەبێ بزانرێ: کە هونەرێکی جوانە لە باری ویژدانییەوە، لە نەفسی ئادەمیدا سەرهەڵئەدا و بە وشەی ئاوازەدار گوزارشت لە هەموو جۆرە «سۆز ـ اِنفِعال»ێک ئەداتەوە. ئەم سۆزەش کە ئەیلێین، هێزێکی ویژدانییە بەسەر نەفسا زاڵ ئەبێ کە هەندێ جار گۆڕانێکی ئاشکرا لە لەشدا پەیدا ئەکا و هەندێ جاریش ئەو گۆڕانە لە هەست و ژێرییەکی نهێنیدا ئەبێ!. ئەمە زۆر جار پیاو لە

خۆیدا وە لە غەیری خۆیشیدا ئەیبینێ، لەو کاتەدا کە تووشی تووڕەیی وەیا خۆشییەک ئەبێ. ئەمجا کە وشەکە کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئەم سۆزەوە، ئیتر بە جۆرێکی ڕێکوپێک دروست ئەبێ بۆ ئەوە کە بوو بە ڕستە، بتوانێ بە تەواوی سۆزەکە دەربڕێ!.. مەبەست بەو توانینەش ئەوەیە: کە سەیر ئەکەی مووزیقاکەی هەندێ جار بەهێزە، هەندێ خاوە، یا دروشت و زبرە، یا وردە و نەرمە. ئەمانە هەموو دیمەنێکی سروشتین ـ ظَواهِر طَبیعِیّە ـ و شێوە دایانئەگرێتەوە!...

کورتیی ئەم قسانە دێتە سەر دوو شت: یەکەم جیایی پایەی سۆزەکەی لە هێز و پێزیدا، دووەم ڕاستی ئەو گوزارشتە کە بە وشە و ڕستەکە لێیان ئەدرێتەوە. چونکە دیارە وشە وەیا ڕستەیەک کە گوزارشت لە تووڕەیی بداتەوە، بەهێزترە لەوەی کە لە دڵتەنگی و ترس ئەداتەوە!. بەمەدا ئەوە ئەزانین: کە شێوەی «دلێری» ئەبێ بەهێزتر بێ لە شێوەی «هەڵبەسە، لاوانەوە، لەخۆبوردنەوە». شێوەی «سروشت، بە تانوپۆدا هاتن، مەیۆشی، پارێزگاری، زانست» مامناونجێ ئەبێ لەبەینی دلێری و هەڵبەسەدا!..[1]

١. دلێری: حەماسە. هەڵبەسە: غەزەل. لاوانەوە: «رِثاء». لەخۆبووردنەوە: مەدح. مەیۆشی: «خَمْرِیّات». پارێزگاری: زوهد و تەقوا. زانست: حیکمەت و مەعریفەت. سروشت: تەبێعەت.

# بەشکردنی هۆنراو!

هۆنراو لەبارەی «ترۆم»ـەوە بەشێکی هەیە و لەبارەی «مەبەس»ـەوە بەشێک. بەچاو ترۆمەوە ئەبێ بە چوار بەشەوە:

«گۆرانیی، شەڕوشۆڕ، لاسایی وەیا مەسرەحی، فێرکەر»[1]

١ـ **«گۆرانیی»**، یەکەم هۆنراوێکە کە لەگەڵ پەیدابوونی ئادەمیزاددا هاتۆتـە خوارەوە. بۆیـەش پێی ئەڵێـن گۆرانیی، چونکە ئەم هاتنەی هەر لەگەڵ سـاز و ئاوازدا بووە. هەروەها ئەگونجێ پێشی بوترێ «ویژدانی» چونکە گوزارشت لە ویژدان و کەسیەتی هۆنەرەکە ئەداتەوە، واتە: هەر شـتێک کە ئەو هۆنەرە ئەیڵێت، هەمووی گوزارشـت لە هەستی خۆی ئەداتـەوە. وەکوو ئەڵێ: **«خۆشم ئەوێ، ڕقمە لێت، وام بۆ کردی، ئەو ئیشەم بۆ نەکردن»** جا لەبەر ئەمە ئەتوانرێ هەر ئەم جۆرە هۆنراوانەش بە هۆنراوی «خودی ـ ذاتی» ناو ببرێن!.

بەڵـێ! ئـەم هۆنـراوی «خودی»ـیە هەرچەندە لە تاقە کەسێکەوە پەیدا ئەبێ، بەڵام، با ئەو کەسـە خۆیشی ون بکا لەناو خێڵەکەیا، وەیا تەنانەت لەناو نەتەوەکـەیا، لەو خودییەی خۆی هەر ناکەوێ!. چونکە لەم کاتانەدا بەهۆی ئەو پێشهاتانەوە کە بۆیان دێتە پێشەوە، نەفسیەتی نەتەوەکـەی وەیا خێڵەکـەی ئەچێتە پێسـتی ئەوەوە؛ وەیا نەوسـی ئەو ئەبێ بە هی ئەوان و هەموویان ئەبن بە وەکوو یەک کەس. وێنەش بۆ ئەم چوونە پێستی یەک کەسەوە، ئەم هۆنراوانەی «فایق بێکەس»ـە،

---

١. گۆرانیی: «غِنائی». شەڕ و شۆڕ: «مَلحَمَة». لاسایی: تەمسیلی. فێرکەر: تەعلیمی.

کـە لە ڕواڵەتا تاکییەکی ڕووتە، بەڵام لە ڕاسـتیدا زمانی نەتەوەکەیە، لە کاتێکا کە ئەڵێین و ئەڵێ:

**بیست‌وحەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم**
**بــە نــان و ئــاو و جــل و بەرگــی خۆم**
**خزمەتــم کردوویــت لــە ئێــران و ڕۆم**
**لــە پێنــاوی تــۆ شــکاوە ئەســتۆم**
**کەچی هێشــتا هەر دیــل و ڕەنجەڕۆم!**
**گوناهــم چی بــوو بــەم دەردەت بردم؟**
**بۆچی لە ناحەق وا ســووکت کردم؟!**[1]

لەم هۆنراوانەدا ئەوەندە هەیە دوور نییە بوترێ نیشـانەیەک نییە کە لە «تاکی»ـی دەرکردبێ و خستبێتیە پێستی نەتەوەکەیەوە؟... ئەڵێین: لە هەموو شـتێکی وادا کە مێژووی دانانی ئەو شـتە زانرا، کارەسـاتەکە ڕوون ئەبێتــەوە کــە چــۆن وە بە هــۆی چییــەوە وتراوە؟ وە ئــەو هەموو ناوهێنانەی خۆی، مەبەســت نەتەوەکەیــە و خۆی لەگەڵ ئەوانا بۆ جیا ناکرێتەوە.

ئەمە و دیسان: کە ئەوترێ هۆنراوی گۆرانیی، ویژدانی و زاتیشی پێ

---

١. ئەم هۆنراوانەی لە سـاڵی «١٩٤٦» لە سـولەیمانی وتووە، لە کاتێکا کە «ئەدمونس»ـی ئنگلیـزی ـ کـە کاربەدەسـتێکی گـەورە بـوو لـە عێراقـدا ـ چووبـوو بـۆ ئەوێ، ئەیەویسـت بچێتەوە بۆ «لەندەن» ماڵاوایی لە خەڵکی سولەیمانی ئەکرد.

کۆبوونەوەیەکـی بۆ کرا. «مَعروف جیاووک» موتەسـەڕڕیفی ئـەوێ بوو. فایق بێکەس ئەم هۆنراوانـەی لـەو کۆبوونـەوەدا لە بەردەسـتی ئەدمونسـدا خوێندەوە و مەبەسـتی ئنگلیز بووا هەموو پارچەکە «٩» حەوت‌خشتەکییە. ئەمەی ئێرە یەکێکیان بوو.

ئەوتـرێ ـبەتایبەتی خودییەکەی. لەبەر ئەو شـتەیە کـە باس کرا، ئیتر ئەمـە مەرج نییە کە چەمکەکەی لەناو هەمـوو نەتەوەیەکدا بێتە دی، بەڵکوو تەنها چەمکە زانیارییەکە مەبەسـتە ـکە چەمکێکی گشـتییە.. ئەگـەر هات و لە شـوێنێکا وەیا لـە نەتەوەیەکا هاتـە دی، ئەوە ئەوەی گەیاند: کە ئەو چەمکە هەبووە و هەیە.

ئەمجـا بۆ ئەوە کە ئاشـکراتر بێ، سـەیر ئەکەیـن هۆنەرێکی وەکوو «ناڵی» بە تەواوی ئەم چەمک و گوزارەیەی دەرخسـتووە، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**عاشـقی بێ دڵ دەناڵێ مەیلی گریانی هەیە**
**بێشکە، هەورەتریشـقە تاوی بارانی هەیە!**

لێرەدا لە «خودیی» دەرچووە، هەموو «حەسپن ـ عاشق»ـی کردووە بە یەک و نەوسی ئەوانی هەموو کردووە بە نەوسی خۆی، وەیا خۆی لە ناو ئەواندا ون کردووە!. بە چیشـدا ئەمە ئەزانین کە نەوسی خۆی لەناو ئەوانایە؟ هەر بەو هۆنراوەیدا کە بەشوێن ئەوا ئەڵێ:

**چاوی من دەمدەم دەڕێژێ ئاوی سـاف و خوێنی گەش**
**تـا بڵێـن دەریـای عوممانـە دوڕ و مەرجانـی هەیە!**

دەری خسـت کە لە هۆنراوەی پێشـوویدا دەسـتی لە خودی خۆی هەڵگرت و چووە ناو زاتی هەموو عاشقانەوە!..

٢ـ «شەڕوشـۆڕ»؛ ئـەم هۆنـراوی شەڕوشـۆڕە لـە سـەرەتای ئـەو سەردەمەوە کە ئادەمیزاد کەوتە ناو ژیانێکی تۆزێ ڕێکوپێکەوە، داهاتووە و هەبـووە. هۆنـەر باسـی خۆی ناکا، بەڵکـوو وەکوو مێژوونووسـێک تۆ

ئەخاتە ناو ئەندێشـەی کارەساتێکەوە. لەو کارەساتەدا پاڵەوانەکان و ئەو کەسـانە کە هەراکە هەڵئەسـووڕێنن، هەموو ئەکەونـە بەرچاوت. دیارە ئەم جۆرە هۆنراوانەش سەرتا هەر لە یونانەوە داهاتووە و پاشان وردەوردە لەناو نەتەوەکانیترا بڵاو بوونەتەوە.

**٣ـ «لاسـایی»**: هۆنراوی لاسـایی وەیا مەسـرەحی وەیا تەمسـیلی. ئەم بەشـەش چیرۆکێکە لەناو خۆیـدا بەش‌بەش ئەبێتەوە، وای لێ‌دێ ئەبێ بە وەکوو دەمەتەقێ لە بەینی دوو کەسـا!.. لێرەدا وەسپی دیمەن و کەسـان مەبەسـت نییە، بەڵکوو مەبەسـت کارەسـاتەکەیە. دیسـان ئەمەش هەر لە یونانەوە داهاتووە.

ئـەم هۆنـراوی لاسـایی وەیا مەسـرەحییە، لە لایـەن کاریگەری و کارتێکردنەوە ئەبێ بە «نمایشـی ماتەم ـ تراژیـد» وە «نمایشی خۆشی ـ کومید»ەوە.

**«تراژیـد»**: کارەسـاتی گرنگی بە بایـەخ ئەگێڕێتەوە، بە شـەقڵێکی دوور لە گەپ و گاڵتە ئەو کارەساتە شەقڵ ئەکا. تراژید هەستی پیاوەتی و مەردایەتـی و ویژدان و ئازایەتی لە سـەیرکەرەکانیانا ئەبزوێنێ. زۆرتر دوایـی بە مـردن وەیا کوشـتن وەیا ماتەمێک دێت. داسـتانی «مەم و زین»ـی «ئەحمەدی خانی» لە کوردیدا تراژیـدە.

**«کومید»**: بەزم و هەرایەکی گەپ و گاڵتەیە، پێکەنین و خۆشـی لە سەیرکەرانا پەیدا ئەکا و زۆرتر دوایی بە خۆشیی دێت. داستانی «ئەمیر ئەرسەلان»ـی وەرگێڕ ـ ڕاوی «عەلی کەمال باپیر» لە کوردیدا بۆ کومید دەست ئەدا.

دیسـان مەرج نییە کارەسـاتی لاسـایی هەر ئەبـێ یا تراژید بێ یا

کومیـد، واتـە هـەر یەکێـک لەمانە بـێ، بەڵکـوو ئەگونجـێ لە یەک داسـتانا هـەم تراژیدیـش بێ و هەم کومیـد. وێنە لە کوردیـدا «لەیلێ و مەجنوون»ـی «مـەلا وەڵەدخان» و «شـیرین و فەرهاد»ی «خانای قوبادی» هەردوو پەردەکە ئەگێڕنەوە!..

٤ـ «**فێرکـەر**»؛ هۆنـراوی فێرکـەر بە گوزارەی ڕاسـتیی هۆنـراو بەر هۆنراو ناکەوێ، چونکە هیچ هەستێک نابزوێنێ، وەیا بڵێین: سۆزێکی تێدا نییە؛ ئەندێشـەکەی بێ‌هێزە، ڕێخت و داڕشـتنەکەی شـتێکی وا نییـە، کاریگەرییەک نابەخشـێ. هەر ئەوەندەیـە زانین و زانیارییەک ئەدا و هیچی‌تر. لە کوردیدا وێنە بۆ ئەم جۆرە هۆنراوانە ئەو هۆنراوانەی «زێوەر» ئەبن بە وێنە، کە لە بارەی قوتابخانە و جوغرافیاوە دایناون.

✽✽

لەگەڵ ئەم باسـکردنەی ئەمانەشا بەم جۆرە، ئەبێ ئەوەش بزانرێ: کە یەکێکی وەکوو «ئەرەسـتوو» کاتێ کە باسی هۆنراو ئەکا، ئەو دان بە گۆرانیـی ـ غینائیدا نانـێ و ناوی هەر نابا!. بەڵکوو باوەڕی ئەو لەسـەر ئەوەیـە کە ئەڵـێ: هۆنراو دوو جـۆرە: یەکێ دلێری، یەکێ داشـۆرین ـ هیجـا. ئـەم دووە پێکەوە ڕێگا پاک ئەکەنەوە بۆ هۆنراوی لاسـایی. ڕێ پاککردنەوەکەشـیان ئەوەیـە کـە لـە دلێریـی تراژید پەیـدا ئەبێ و لە داشۆرین، کومید دروست ئەبێ!.

کەوابوو، بەچاو بیروباوەڕی یەکێکی وەکوو ئەرەسـتووەوە هۆنراو هەر ئەوەندەیە، چ لە باری ترۆمەوە، چ لە باری مەبەسەوە!.

✽✽

وترا هۆنراو لە باری ترۆمەوە بەشێکە و لە باری مەبەستەوە بەشێک. باسی ترۆمەکەی کرا، ئەمێنێتەوە سەر ئەوە کە: بزانرێ مەبەست لەو هۆنراوەدا چییە و کامەیە؟. لەم لایەنەشەوە ئەوترێ: هۆنراو بەچاو مەبەستەوە برێتییە لە:

«هەڵبەسە، دلێری، لاوانەوە، بەتانوپۆداهاتن، داشۆرین، فیز و خۆهەڵکێشان، مەی‌نۆشی، وەسپ، پارێزگاری، زانست».

١ـ **هەڵبەسە؛** ـکە غەزەلەـ یەکێ لە گوزارەکانی بێ‌هێزی و کۆشش‌کردنە بۆ شۆخیکردن لەگەڵ «ڕەسەن ـ جنس»ـێکی‌ترا؛ واتە: لەگەڵ ئافرەتدا، وەیا ئەم لەگەڵ پیاودا. هەڵبەسە لە دڵا ناتەوانی و بێ‌هێزییەک ئەگەیەنێ، وەیا بە واتەیەکی‌تر: ئەو سۆزە کۆمەڵایەتییە ئەگەیەنێ کە گوزارشت لە بێ‌هێزی ئەداتەوە، ئەمجا کراوە بەناو بۆ پارچە هۆنراوەیەک کە ژمارەیان لە حەوت کەمتر و لە دوانزە هۆنراو زیاتر نییە ـمەگەر بە دەگمەن نەبێـ. وشەکانی ئەبێ نەرم و نازک بن؛ چونکە هۆنەرەکە هەست بە ناتەواوییەک ئەکا لە خۆیدا، بەو وشانە ئەیەوێ ئەو ناتەواوییە نەیەڵێ!.

هۆنەر یا وەسپی ئافرەتێک ئەکا، یا وەسپی خۆی ئەکا کە چۆن سووتاوە، یا وەسپی هەردووکیان ئەکا. هەموو ئەمانە زەبوونییەک و لارەملییەکی تێدایە. وێنە لە هۆنراوی کوردیدا بۆ هەڵبەسە وەکوو ئەم هەڵبەسەیەی «نالی»یە، کە ئەڵێ:

**زولفت کە لەسەر ڕوو بە خەم و تابوشە ئەمڕۆ**
**دوودی سیەهی عوودە لەسەر عارزی پشکۆ!**

**دەستم کە بەســەد وەعدە لەســەد جێگە[1] شکاوە**
**جەبــری نییە ئەم کەســرە هەتا نەیخەیە ئەســتۆ!**
**خاڵــت چییــە؟ دانەی گەنمــی جەننەتــی ڕووتە**
**چــاوت چییە؟ فیتنەی حەرەمــی قیبلەیی ئەبرۆ!**
**شەوبۆی ســەری ســونبولی زوڵفت لە سەری دام**
**ئێستەش سەرەکەم مەستە لەبەر نەشئەیی شەوبۆ!**
**[نەمبیســتووە هەرگیــز لــە دەمت بێنــی وەفایێ**
**هەرچەنــدە ســەراپا گوڵــی، ئەمما گوڵــی هێرۆ]**
**قوربــان! وەرە تــا ئەم غەزەلــە تازە لەبــەر کەین**
**عیــزز و شــەرەفی «ناڵی»یە تەشــریفی قەدی تۆ!**

سەیر ئەکەین ئەو هەموو شناساندنە کە بۆ هەڵبەسە هەیە و وتراوە، بە تەواوی ئەم پارچە هۆنراوەی «ناڵی» ئەچێتە ژێر سێبەریەوە.

**٢ـ «دلێــری»**؛ ـکــە حەماســەیە ـ بــە مــانا هێــز و توندوتێژییــە لە ئیشــا، بە تایبەتی هێــزی ئازایی و پاڵەوانییە بۆ شەڕوشــۆڕ!. لە هۆنراوی دلێریدا ئەبێ شێوەکەی بەهێز بێ، زەنگی وشەکانی توندی و تیژی، وە گوزارەکەی بوونیەتییەک بگەیەنێ. وەکوو : شــیر، تیر، لێدان، کوشــتن، بڕیــن. دیمەنی ڕەگەزی وشــەکان هەموو دەنــگ و ڕەنگ و کردەوەی کارەســات بگێڕێتــەوە. وەکــوو «بریقــەی شــیر، گیزەی گوللــە، تەقەی تفەنگ، خوێنی گەش، لەشــکری بێسامان، نرکەی پاڵەوان و...هتد».

---

١. «لاوە» نسخە.

ئەمجا ڕستەکەشی تێکڕا باسی مووزیقایەکی نەوسیی بەرز بگێڕێتەوە. وێنەش بۆ ئەم باسە چامەکەی «سالم»ـە، کە لە هەرای بابانەکانا وتوویەتی؛ ئەمە چەند هۆنراوێکە لەو چامەیە:

**لێم گەڕێن با گۆشەگیر بم، دەستەئەژنۆ، کەفزەنان**
**گێژەڵووکەی بای نەدامەت تاری کرد سەفحەی جیهان!**
**بەزمی سەیدی ئێمە سەییادی فەلەک کارێکی کرد**
**ڕەنگە بالای تیرقەدانمان بێتە تەرکیبی کەمان!**
**دڵ لە میحنەت کەیلە، تابی سەیری ناوشارم نییە**
**عەینی چاوم خوێنی تێزاوە لە داغی مەردمان!**

**✽✽**

**ئاگری نەگبەت لە خەرمەنهایی تالع کەوتووە**
**شەمعی دەوڵەت هەر تەرەف دەگرا، هەموو خامۆش کران!**

**✽✽**

**شارەزوور بەحر و سولەیمانی لەسەر ئەو گەمیەڕەنگ**
**بۆ شکستی وەک نەهەنگ، بوو فیتنەیی ئاخرزەمان**
**ساعیقە و بەرقی نەدامەت زوڵمەتی دا شەرق و غەرب**
**بەردەبارانە بە مەخسووسی لەسەر موڵکی بەبان!**

**✽✽**

**گوێی فەلەک کەڕ بوو لەبەر ناڵەی نەفیری ئەهلی شــار**
**لامەکانــی گرت ســەدای ناڵــە و فوغــان و ئەلئەمان!**

**❀❀**

**ڕەنگی سەحرای مەحشەری بووشیوەکەی لای پیرمەسوور**
**گرمەگرمــی تۆپی ڕۆمــی، هەوهەوی ســوارەی بەبان!**
**بــوو بە جارووبی مەحەللە هەر تــەرەف پەنجەی پەڕیو**
**پەی کــراو بێ پێ لــە مەیــدان، پەهلەوانــی پاڵەوان!**

دیســان وەکوو تەماشــا ئەکرێ، بە تەواوی شناســاندنی دلێریی ئەم پارچەیە ئەگرێتەوە و وێنەیەکە لە ئەدەبی کوردی بۆ ئەو مەبەستە.

**٣ـ «لاوانــەوە»**؛ لاوانەوە، باســی مردن و چۆنیەتــی مردن و زمانی دڵتەنگــی و بەینەتــە ـوەفــاـ. شــێوەکەی نەرمــە، بەڵام نە بــە نەرمیی هەڵبەســە، توندوتیــژە نــە بە ئەنــدازەی دلێریی، وشــەکانی پێشــوازی نەبوونــی یو ماتەمیی ئەکا. وەکوو: «مــردن، تالان، گۆڕ، منالی بێ‌باوک و...هتــد». وە یا کارەســاتی گەورەی ترســێنەر، وەکوو: «لافاو، ســووتان، بوومەلــەرزە و...هتد». هەروەها بۆ کردەوەی چاکــەی مردوو. وێنەیەک لــە هۆنراوی کوردیدا بــۆ لاوانەوە، ئەم پارچە هۆنراوەی «مەولەوی»ــیە کە ئەڵێ:[1]

**تۆ نــەی کۆچدا کار وێــت مەحکەم کەردەن**
**بــەڵام ڕیشــەی مــن جــە بێــخ ئــاوەردەن**

---

١. مەولەوی، ئەم پارچەیەی لە لاوانەوەی «عبدالرحمان»ـی کوڕی مەحموودی یاروەیسی، پیاوماقووڵی مەحموودپاشای جافدا وتووە، کە بریندار بووە.

**تـۆ مـەردەی شـەهید، زینـدەی بێباکـی**
**مـن زینـدەی مـەردەی دەشـت خەمناکی**
**تـۆ ئـازاد پـەی سـەیر جـای جاویدانـی**
**مـن پـا بەسـتەی بەند ئـەی دنیـای فانی**
**تـۆ لـوای بـەو ئەجـر سـەختی زامـەوە**
**مـن پـەرێ حەسـرەت دووریـت مامـەوە**
**پـەی تـۆ ڕاحـەت بـۆ پـەرێ مـن زامەت**
**هـەر شـەو ڕۆڕۆ بـۆ تـا ڕۆی قیامـەت!**

وەکـوو بۆمان دەر ئەکەوێ، ئەم پارچە هۆنراوەیە هەموو شـێوەیەکی ماتەمـی تێدا هەیە و بە تەواوی هونەری لاوانەوەی لە دڵی خۆیدا جێ کردۆتەوە.

٤ـ **«بەتانوپوا هاتن»** و **«داشـۆرین»**؛ هۆنـراوی پیاهەڵوتن، بۆ ڕێز لێگرتن و خۆشەویستییە. هی داشۆرین: بۆ نزمبوونەوە و کینە لێبوونە. هەرچەنـدە ئـەم دووە لە هـۆی ویژدانییـەوەن ـ باعیسـی ویجدانی ـ؛ بەڵام لەوانەیە هەردوو لایان یەک شێوەیان هەبێ، چونکە سەرچاوەکە خوشەویسـتی و لەجەرییە. وشەکان بە گوزارەکانیانەوە زۆر جار قەڵەو ئەبن، هەندێ جاریش ئاسان و سادەن. لە ڕاستیدا ئەم شێوەیە ئەچێتە بەینی توندیی «دلێری» و نەرمیی «هەڵبەسەوە»!...

وێنەیەک لـە زمانی کوردیدا بـۆ بەتانوپۆدا هاتن، ئـەم هۆنراوانەی «زێوەر»ە کە بە «شێخ قادری سۆڵە»دا ئەیڵێ:

بنازم شـوعلەیی عەشـقێ کە ڕۆشـن کا موسـوڵمانی
بنـازم شۆڕشـی زەوقـێ! مەلەک بـێ بۆ سـەناخوانی
بنازم بارگاهی شـێخ حوسـەین و نەسـڵی مەحبووبی
تەریقـەی قـادری ڕوون بوو بـە عەبدولقادری سـانی
چ عەبدولقـادرێ؟ فەیـزی لەبـۆ خاس و لەبـۆ عامە
وەکوو هـەوری بەهاران ڕەحمەتە ئەلتاف و ئیحسـانی
حوسەینی نیسـبەتە، والاحەسەب: شـێخ قادری سۆڵە
لە فەیزی قیسمی نەفسـانی موبەددەل بوو بە ڕۆحانی!
مـەداری ئیفتخـاری میللەتـی کوردانـە بـۆ دنیـا
بـە ئیتعامـی تەعامـی و خزمەتـی ئەهلـی فەقیرانی
چراغـی بەزمی ئیرشـادە، عـەدووی ئەهلی ئیفسـادە
لـە بوغـز و کینە ئـازادە، بـە قەلبـی پـاک و نوورانی
جەبینـی لامیع و ئەنـوەر، کەفی وەک کانـی زیو و زەڕ
دڵی عەرشـی خوادی ئەکبەر، موتیعی حوکمی قورئانی
بە قەمچی دەسـتی تەئدیبی هەواخواهانی نەفسی کرد
عەسـای دەسـتی وەکوو گۆچانە بۆ حیفـزی موریدانی
خـودا ئـەم بـارەگاه و تەکیـە ئـاوا کا بـە ئیقباڵـی
بژی بـۆ خزمەتی میللـەت وەکیلی غەوسـی گەیلانی

وێنەیەکیـش هـەر لە زمانـی کوردیدا بۆ «داشـۆرین»، ئـەم پارچە

هۆنـراوەی «شـێخ ڕەزا»ی تاڵەبانییـە کـە لە خوسـپی حەمەی وەسـتا فەتاحدا ئەیڵێ و ئەڵێ:

**هـەزار ئەفسـوون و جـادووی پێـوە ئاوێزانە ئەم ڕیشـە**

**عیلاجـی گـەر ببـێ یا گـووزە یـا گوێزانـە ئەم ڕیشـە!**

**بە تەحریکی تەڵێکی سـەد هەزار نەفسـی بە کوشـتن دا**

**ڕەئیسـی حیلـەکاران، شـای قوماربازانـە ئـەم ڕیشـە!**

**بەبای سەرسەرلەشوێن خۆی ناجمێ، ڕیشەی ئەمەند سەختە**

**بەبێ حیکمەت نییـە گەر جاربەجار لەرزانە ئەم ڕیشـە!**

**بـە زاهیـر سـافە وەک زیوی سـپی، ئەممـا لـە باتیندا**

**ڕەش و پیـس و ملـەووەس، وەک بنی قازانە ئەم ڕیشـە!**

**بـە مەکـری ئەمڕەتێنـێ حـەز بکا هـەر لێرە تـا موکری**

**پەناهـم دەی خودایـا، خاوەنـی زۆرزانـە ئـەم ڕیشـە!**

**کە سـەیرم کرد دەزانم شـێخ لـە من مەسـرووورە یا عاجز**

**حەمەی وەسـتا فەتاح! بـۆ حاڵی من میزانە ئەم ڕیشـە!**

**هەزار هەوسار و دەسـبەند و گوریسی لێ دروست ئەکرێ**

**بە سـەد باتمان خوری گەر بیکڕی، هەرزانە ئەم ڕیشـە!!**

ئەم دوو پارچە هۆنراوە وەسپ و خوسپە تێی گەیاندین کە بە هەموو جۆر لەلایەن وشە و گوزارە و شێوەوە چوونەتە ژێر ئەو شناساندنەوە کە بۆ هەردوو بابەتەکە کراوە.

٥ـ «وەسپ»: مەبەست بەم وەسپە وەسپێکی ئەدەبییە کە سروشت

و مرۆڤ و شوێنانی بەنرخ و شتی جوان و کارەسات ئەگرێتەوە. هێزی خۆی ئەخاتە سەر ئەندێشە و ڕاستیی گوزارشت. ئەو شتەش کە ئەم وەسپە وا بەم جۆرە دێنێتە ناوەوە، ئەو دیمەنە بەشکۆهەیە کە لە دیمەنە ڕواڵەتییەکەدا هەیە و ئەبێتە هۆی سەرسامیی هۆنەرەکە و بەپێی ئەو کارتێکردنە کە کاری تێ‌کردووە، بۆی دێتە وتن!.

جا لەبەر ئەمە شێوەکەی زۆر شت ئەگرێتەوە؛ وەسپی ئەو شتانە کە بینراو و ئەبینرێن جیایە لە وەسپی ئەو شتانە کە نەبینراو و نابینرێن؛ ـ واتە «حسّیّات» و «مَعنَویّات»ـ. وەسپی شەڕوشۆڕ جیایە لە وەسپی چاوەنداز. ئەو زمانە کە گوزارشت لە دەنگ ئەداتەوە، جیایە لەوەی کە لە ڕەنگی ئەداتەوە. نەوەک هەر ئەوەندە، بەڵکوو لە ڕاستیدا هیچ هونەرێک نییە خاڵی بێ لە وەسپ. بە وێنە: وەسپ لە شەڕدا دلێرییە، لە جوانیدا لێکچوونە، لە ڕاست و گەورەییدا پیاهەڵوتنە، لە دڵتەنگیدا لاوانەوەیە!..

جا لەبەر ئەمە، زۆرێکی زۆر ـ مەگەر بە دەگمەن نەبێ ـ لە هۆنراو بەر وەسپ ئەکەوێ، جیایی شێوەکەی بە جیابوونەوەی باسکراوەکەیە.

سەیر ئەکەی شێوە بەهێز و تیژە لە شەڕ و لە دەنگی گرمەی هەور و لە کارەساتی ترسێنەردا، نەرمە لە دڵنەوایی و خۆشی و مەینۆشیدا، پلەیەکی ڕاکێشەر و ناوازەی هەیە لە باسی پرشنگی ئەستێرە و تریفەی مانگ و جوانی گوڵ و دەنگی بولبول و دیمەنە جوانەکانی‌تردا.

لەسەر ئەم قسانە، ئەوە دەرکەوت: کە هۆنراوی وەسپ لەگەڵ «وێنە ـ ڕەسم»ـدا یەک ئەگرنەوە؛ ئەوەندە هەیە: ئەو دیمەنە کە لە وێنەدا هەیە، بەچاو سەیرکەرەکەیەوە بە یەک جار ئەکەوێتە بەرچاو،

بەڵام لە هۆنراوی وەسپدا بەرەبەرە ئەخرێتە بەرچاو!..

ئەمجا وێنەیەک لە هۆنراوی کوردیدا بۆ وەسپێک کە لە سروشت و مرۆڤ و شتی جوانا دەرکەوێ، بەپێی ئەو شناساندنە کە کرا، ئەم پارچە هۆنراوەی «گۆران» ئەوەمان پیشان ئەدا؛ لە کاتێکا کە باسی ئۆغرکردنی کڵاولارێک ئەکا و ئەڵێ:

**کڵاولار، گورجی کەوڕەفتار، نــەزەر ناکەی! ئەڕۆی ئۆغر؟**

**لە تیــری ئاهــی ناکامیم حــەزەر ناکەی! ئــەڕۆی ئۆغر؟**

**بە دووتا ئەشــکی حەسرەت خوێن ئەبارێنێ بەسەر دەشتا**

**تەماشــای لالــەزاری ڕاگــوزەر ناکــەی! ئــەڕۆی ئۆغر؟**

**لــەلای خەڵکی گەدایــە گەردی ژێر پێــی موڵکی دڵداری**

**بە سایەت وەک «هوما» تاجم لە سەر ناکەی! ئەڕۆی ئۆغر؟**

**بــە لــەرزە و زەلزەلەی ئــەو پلپلانەی دەوری پووشــینت**

**بینای هەســتیم هەموو زێڕ و زەبەر ناکەی! ئەڕۆی ئۆغر؟**

**ئــەوا واعیــز ئەڵێ: لادە لــە قیبلە و عەشــق و جوانی ڕوو**

**ســەماعی وەعزی ســەرتاپا زەرەر ناکەی! ئــەڕۆی ئۆغر؟**

**فریشــتەی! یا پەری! یا حۆری! ئەی شۆخی مەلەک شێوە**

**بە عیشوە و خوو لە هاوجنسی بەشەر ناکەی! ئەڕۆی ئۆغر؟**

**بە تای دووری غەزەل ئەچنم لە حەسرەت ڕشتەیی گێسووت**

**مەتای عومری درێــژ کردووم لەبەر ناکەی! ئەڕۆی ئۆغر؟**

**ئەڕۆی ئۆغر؟ ئەڕۆی ئۆغر؟ نــەزەر ناکەی ئەڕۆی ئۆغر؟**
**حەیام، عەقڵم، دڵ و دینــم، هەدەر ناکەی! ئەڕۆی ئۆغر؟**

ئەم پارچە هۆنراوەی «گۆران» ئەوی پێی بڵێی وەسـپی سروشـت و ئادەمی و دیمەنی جوانی تێدا هەیە، ئەو مەبەسـتە کە لە وەسـپ داوا ئەکرێ، وشەکان و گوزارەی وشەکان هەمووی دەرئەبڕێ و تێیدا هەیە.

وەیا لە وەسپی شوێنانی بەنرخ و ڕازاندنەوەی دیمەنە سروشتییەکانا بە ئەندێشەیەکی بەرزی هۆنەری «پیرەمێرد» ئەڵێ:

**ســبەینێ بوو لە خەو هەســتام کە ڕوانیــم بەفرە باریوە**
**ســولەیمانی ئەڵێی بەڵکیســە تــارای زیوی پۆشــیوە!!**
**دەمێک بوو چاوەڕێی بەفرێکی وا بووم، موژدە بێ باری**
**ســەرم بەفرە، کەچی هێشــتا شــەڕەتۆپەڵمە بۆ یاری!!**
**لە بیرمە «شێرە بەفرینە»م ئەکرد، سواری ئەبووم بێ زین**
**نسێی بوو جێگەکەی ئەیبەست، ئەما تاکوو دەمی هاوین!**
**بە بەرگی سپییەوە چەند شۆخە شاخی «گۆیژە»، بیبینە**
**لــە ڕەنگی ئاســمان دڵبەرترە ئەم ســپییە ئەو شــینە!!**
**ئەوا ســامالّی کرد، ڕۆژ کەوتە سەر شــاخی «گڵەزەردە»**
**بەسەر ئەو بەفرەدا تیشــکی هەتاو، ئەڵماسی خواکردە!**
**لەسەر سەربان بەفر توێژاڵی بەست، وێنەی چوڕی شیرە**
**قەتارەی ســەر لق و پۆپــی درەختان چەنــدە دڵگیرە!**
**چلــوورەی گوێســوانە پڵپڵــەی زیــوی کچــە کــوردە**

**سەهۆڵ ئاوێنەیە، لێکدانەوەی ئەم دوو شتە وردە!**
**کە پیریژن سەر و پۆیلەی بە شینی چللە تێک ئاڵا**
**بەهار یەت، داری پیر ئەژیێتەوە، دێتە قەد و باڵا!**

لەم هۆنراوانەی پیرەمێرددا جیهانێکی‌ترت دێتە بەرچاو؛ جیهانێکی وا کە کەونێکی گیانلەبەریی دروست کردووە ـالکائنات الحَیّة- لەو دیمەنەدا کە لە خودی خۆیانا هیچ گیانێکیان نییە، ئەو بە وەسپە ئەدەبییەکەی، وای لێ‌کردوون هەموو دیمەنە بینراوەکان لە بەرچاوتەوە بووە بە تاپۆیەکی زێڕینی‌تری گیانلەبەر، کە لە هەموویانا ئاوازێکی نهێنی سروشتێکی گەشەدار دێتە بەر گوێت و لە وەسپا ئەتخاتە جیهانێکی‌ترەوە!!..

٦- «**مەی نۆشی**»؛ سەرچاوەی مەی‌نۆشی لە خۆشییەکەوە هەڵئەستێ کە لە خودی مرۆڤەکەدا بە هۆی هەندێ سۆزی دەروونییەوە دروست ئەبێ. وشەکانی نەرم و بە ئاوازەیە و گوزارشت لە خۆشی و هەڵپەڕکێیەکی نەوسیی ئەدەنەوە. ئەگەر ورد بکرێتەوە، گوزارەکەش وشەکە ئەخاتە سەما!. بە هەردوویانەوە ـواتە: وشە و گوزارە- جیهانێکی دوور لە ناکۆکی دروست ئەکەن. ئامانج لە هۆنراوی مەینۆشیدا پەرەسەندنی هەستی دڵە بۆ لای خۆشەویستیی؛ ئەو خۆشەویستییە کە گەردوونەی ژیان هەر بۆ ئەوە!. وێنەش بۆ ئەم مەینۆشییە لە کوردیدا، ئەم هۆنراوانەی «بێکەس»ـە کە ئەڵێ:

**[ساقی فیداتم... ساقی فیداتم]**
**دڵ پەستە! هەستە ساقی فیداتم**

حەیرانــی لەنجــە و بــەژن و باڵاتــم
شــەرابێ بــا بــێ بــۆ دڵــەی ماتــم
ڕەونەقــێ، شــەوقێ بــا بــە حەیاتــم
لــە دەســتی پەســتیی بــدا نەجاتــم!
شــەرابێ وابــێ عومــری نووحــی بێ
سەفابەخشی دڵ، نەشــئەی ڕۆحی بێ
کــۆن و موســەففا، لابــەری جەفــا
بــەزم و ڕابیتــەی یارانــی وەفــا
شــەرابێکی وا بــە تەنهــا جامــێ
تەکامــول بــکا خامــێ، نەفامــێ!
قــەدەح پەیــا پــەی پــڕ کــە لێواولێــو
بێنــە، مەترســە لــە تەعنــە و جنێــو!

**

[ســاقی فرســەتە... ســاقی فرســەتە]
دەخیــل مەوەســتە ســاقی فرســەتە
وەختی خواردنەوە و کەیف و عوشــرەتە
موغەننی! ســا تــۆش ڕۆژی هیممەتە!
دڵ زۆر موبتــەلای دەنــگ و نەغمەتە
توخــوا قەتــارێ، دڵ بــۆت لەتلەتە!

بــە ناڵەی نەی و نەغمــەی ئەرغەنوون
بە نەشــئەی مەی و شــەرابی گوڵگوون
با لــە دڵ دەرکەین ســزایی گــەردوون
ئاســوودە ســاتێ دڵ ببــێ مەجنوون!

**

ســاقی! ئۆباڵــی منــت بــە ئەســتۆ
دنیایــە وەســیەت ئەکــەم لــە لای تۆ
کــە مــردم توخوا هــەر بە مەی بمشــۆ
بــۆم مەکــەن شــین و گریــان و ڕۆڕۆ!

**

لــە جێــی یاســین و تەڵقیــن و شــینم
بێن کــۆڕی بگــرن لــە ژوور ســەرینم
بــە بــەزم و ڕەزم و بــە ئــاوازی خۆش
ئێسک و پرووسکم هەموو بێتە جۆش!

ســەیری ئەم هۆنراوانە ئەکەی ئەبینی ئەوی بۆ ناساندنی مەی‌نۆشی وتراوە، هەمووی لەمانەدا بەجێ هاتووە؛ بە تەواوی بە وشــە و گوزارەوە گوزارشــت لە هەموو جۆرە ســۆزێکی نەوســیی ئەدەنــەوە و دوورن لە گشت ناسازییەکەوە!.

**

لەبەر ئەوە کە وەکوو لە پێشەوە باس کرا، شێوەی خۆهەڵکێشان و پارێزگاری و زانست مامناونجییەکە لە بەینی دلێری و هەڵبەسەدا، وەکوو چۆن وەسپ و مەینۆشیش چەشنی شت بوو، وێنەمان بۆ ئەم دووە هێنایەوە؛ لە مامناونجی ئەمانەوە ئەوانیشمان بۆ دەرئەکەوێ، جا لەبەر ئەمە وێنەی ئەوانمان بەجێ هێشت. نەهێنانەوەکەی لەبەر ئەوە نەبوو کە لە کوردیدا نین، بەڵکوو لەبەر ئەوە بوو کە بە چاو شێوەوە وەکوو زیادە دەرئەچوو.

ئەمە و دیسان: ئەگەر بە قووڵی بچینە ناویەوە، ئەڵێین لە ڕاستیدا ئەمانە هەموو ئەگەڕێنەوە بۆ ئەو سۆزە کە لە نەوسی مرۆڤەکەدا هەیە. بە وێنە: تووڕەیی: شەڕوشۆڕ و ترساندن و خوسپ دروست ئەکا. سەرسڕمان: پیاهەڵوتن، وەسپی جوان و زانست دروست ئەکا. خۆشەویستی: هەڵبەسە، پیاهەڵوتن و خواناسی دروست ئەکا. دڵتەنگی: لاوانەوە دروست ئەکا. خۆشی: خۆهەڵکێشان و مەی‌نۆشی دروست ئەکا!!..

# هۆنراو لە ترۆمی کۆندا!

تا ئـەم شـوێنە لەلایەن تـرۆم و مەبەسـتی هۆنراوەوە ئەو شـتانەی کـە زانیاریـی تازە داوای ئەکرد، باسـمان لێیانەوە کرد و بەشـکردنەکان بەچاو ترۆمەوە ئەوەبوو بوو بە: «گۆرانی، شەڕوشـۆڕ، لاسایی، فێرکەر». لە باری مەبەستیشـەوە بوو بە: «هەڵبەسە، دلێری، لاوانەوە، پیاهەڵوتن، داشـۆرین، خۆهەڵکێشان، مەی‌نۆشی، وەسپ، پارێزگاری، زانست» وە بۆ زۆرتر لەمانە وێنە هێنرانەوە، ترۆم و مەبەسـتەکە بەسەر بەش‌بەشی هۆنراوەکانا دابەش کران.

ئەمجـا بەجۆرێکی‌تر ئەمانـەوێ ئەو ترۆمانـەش بزانین کە زانایانی هۆنـراو پێش ئەم ناسـاندنەی دواییە، ئەوانیش بە جۆرێکی‌تر باسـیان کـردووە. ئەمانـەوێ لە ناسـاندنەکەی ئەوانیش ئاگادار بیـن، وە ئەوەی ئەوانیش ـکە هۆنەرانی کورد تا ئەم سەردەمەی دواییە هەر لەسەر ئەوە ڕۆیشـتۆن. بزانیـن، وە تێ‌بگەین کە هۆنراوی کوردی چـۆن بەر ئەوانە ئەکەوێ؟ وە چۆن ئەوانەیان بەسـەرا سـەرەونخوون ئەکرێن؟.. لەسەر ناسـاندنی ئەم دەسـتەیە کە وتمان، هۆنـراوی کـوردی ـوە بگرە هەموو هۆنراوێـک. ئەبێ بەم بەشانەی خوارەوە:

«(١) دووتاکی ـ مەسـنەوی. (٢) هەڵبەسـە ـ غـەزەل. (٣) چامە ـ قەسیدە. (٤) پارچە ـ قەتعە. (٥) یەک تاکی ـ فەرد. (٦) چوارخشتەکی ـ ڕوباعی. (٧) بەندی دووبارە ـ تەرجێع‌بەند و تەرکیب‌بەند. (٨) داچنراو ـ موسـەممەت. (٩) زیادکراو ـ موستەزاد. (١٠) چیل ـ مولەممەع. (١١) ڕازاوە ـ موششەح».

**١ـ «دووتاکی»: مەسنەوی ـ «مَثْنَوی»**

هۆنراوی دووتاکی ئەوەیە کە هەر هۆنراوێک بە تەنها، دوایی هەردوو نیوە هۆنراوەکەی یەک سەروای هەبێ، وە بەم جۆرە داستانی کۆمەڵە هۆنراوەکە ببڕێتەوە. ئەم جۆرە ڕێچکەیە زۆرتر لە داستان و چیرۆکی هۆنراویدا ئەبێ، وەکوو داستانەکانی «مەم و زین»ی «هەژار» و «شیرین و فەرهاد» و «لەیلێ و مەجنوون» کە هۆنراوەکان هەموو لەسەر ئەم ڕێچکەیە ڕۆیشتوون. بە تایبەتی «مەولەوی» بۆ هۆنراو لە هەموو چامەکانیا ئەم ڕێگایە گرتووە. بۆ وێنەی دووتاکی وەکوو «هەژار» لە داستانی «مەم و زین»دا ئەڵێ:

**دایەن سەری سوڕ بوو لەم وتانە**
**ڕووی کردە کچان وتی چتانە؟**
**چۆن ئێوە نەچوون بە تیلی چاوان**
**کوڕ ڕاو کەن و دڵ بەرن لە لاوان؟!**
**بۆ خۆ کچ و کچ نەبن بە یاروو**
**لام وایە شلۆقە کار و باروو**
**دڵداری کچان لە ئێوە نایە**
**کەس ناچتە سەمایە بەو هەوایە**
**پێویستە کچان بە کوڕ بنازن**
**لاویش گەرەکە کچان بخوازن!**

******

**٢ـ «هەڵبەسە»: غەزەل ـ «غَزَل»**

لە هۆنراوی هەڵبەسەدا نیوە هۆنراوەی یەکەمی سەرەتای هەڵبەسەکە لەگەڵ نیوەکەی‌تریا لەسەر یەک سەروان، ئەمجا ئیتر هەموو هۆنراوی کۆمەڵەکە هەر لەسەر ئەو سەروایە ئەڕوا تا ئەبڕێتەوە. ئەم هەڵبەسەی «ناڵی»یە وێنەیەکە، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**چـاوت لـە بـرۆ یەعنی لـە ژێـر تاقی نـەزارەت**
**بێ پـەردە عەیـان دێتـە تەکەللوم بە ئیشـارەت**
**شایسـتەیی شـان، لایقـی مـل، توڕڕەیـی تۆیە**
**نەک توڕڕەیی شاهەنشـەهی و تەوقـی وەزارەت!**
**سـەر خاتیمەیی حوسـنی عیـادەت کـە نەهاتی**
**بـارێ بکـرێ فاتیحەیـی دەئبـی زیـارەت!**
**کێ دەسـتی دەگاتە بەهێ و ناری نەگەیشـتووت!**
**لەو تەختە کەوا سـاحیبی سـەدرن بە سەدارەت!**
**دەسـرۆکەیی هـەوری چ حیجابێکـە کـە تێیدا؟**
**شەمسی فەلەک ل حوسـنە ئەنارت، فەتەوارەت!**
**هەرچەنـدە گوناهـی دەمەکـەت بارە لەسـەر لێو**
**حەددی چییـە «ناڵی» کە بڵێ ماچـە کەفارەت!!**

تەماشا ئەکەین: سەروای ئاخری هەموو هۆنراوەکان وەکوو سەروای ئاخری نیوەهۆنراوی یەکەمە.

### ٣ـ «چامە» قەسیدە ـ «قَصیدَة»

چامەش وەکوو هەڵبەسە، نیوەهۆنراوەی یەکەمی سەرەتای چامەکە لەگەڵ نیوەی دووەمیا لەسەر یەک سەروایە. ئەمجا هەموو چامەکە لەسەر ئەو سەروایە ئەڕوا.

### جیایی لەبەینی هەڵبەسە و چامەدا:

جیایی لە بەینی هەڵبەسە و چامەدا لە باسەکە و لە ژمارەی هۆنراوەکاندایە؛ لە باسدا ئەوەیە کە باو وایە هەڵبەسە: بۆ «حەسپن»[1] وەیا بۆ تێگەیشتن و زانیارییە، ژمارەی هۆنراوەکانیشی ـ مەگەر بە دەگمەن نەبی ـ ئەگینا لە دە یا دوانزە هۆنراو تێپەڕ ناکا. چامە: ئەگونجێ پیاهەڵوتن، یا ئایینی، یا فەلسەفی، یا باسی ڕەوشتی بێ، وە ژمارەی هۆنراوەکانی ئەوەیە کە لە بیست هۆنراو زیاتر بێ.

ئەمجا وێنەش بۆ چامە، چامە درێژەکەی «مەحوی»یە کە لە ژێر ناوی «بەحری نوور»دا دایناوە و برێتییە لە «١٢٣» هۆنراو. ئەمەی خوارەوە چەند هۆنراوێکە لەو:

**«وَصَلَّی اللّه عَلَی» ئەوبەحری نووری عیلم وعیرفانە**
**کە دەرکی غەوری ناکا «غَیْر عِلمِ اللّه سُبْحانَه»**
**«وَصَلَّی اللّه عَلَی» ئەو زاتی پاکی قودسی ئایاتە**
**کە ئەخلاقی پەسەندیدەی جەنابی حەیی مەننانە!**
**«وَصَلَّی اللّه عَلَی» ئەوحەزرەتەی ساحێب کەمالاتە**

---

١. [حەسپن: حەسپەن، دڵداری شێت و شەیدا. گراو، ئەویندار، عاشق].

**کە ئەعلا موعجیزەی قوربانی بم من، نووری قورئانە**

**لە زوڵماتی شەوی کوفرا بە یەک دەم لەمعەیەکی دا**

**هەزار و سێسـەد و بیسـت و دووە، دنیـا چراخانە**

**چرایەک نووری بێچوونیی مومیددی بێ، ئەبێ وابێ**

**چرایەک دەستی قودرەت خۆشی کا بۆ تا ئەبەد مانە!**

**

هەروەها چامە وەکوو ئەو شـتانەی باس کران ئەیانگرێتەوە، ئەشێ ماتەمنامـە، بیـرەوەری، بەهاریـی، وتوویـرە، پرسـیار و وەڵامیش بێ. وێنەی ئەمانە لە هۆنراوی زمانی کوردیدا زۆرە، وەکوو داستانی «ئاسمان و زەوی»، «شـەماڵ و زریان»، «شـەو و ڕۆژ». کـە ئەمانـە هەموو بە هۆنـراو دروسـت کـراون و هـەن. ئەوەندە هەیـە «پرسـیار و وەڵام» لە شێوەی هەڵبەسەشدا دێت.

لەم بابەتانەش وێنەیەکی چامەی «بیرەوەری» چامەکەی «ناڵی»یە کـە لـە وڵاتـی «شام»ـەوە بـە «٤٣» هۆنـراو یادی وڵاتی سـولەیمانی کردۆتەوە. ئەمە چەند هۆنراوێکە لەو:

**قوربانــی تـۆزی ڕێگەتـم ئـەی بـادی خـۆش مروور**

**ئـەی پەیکی شـارەزا بــە هەموو شـاری شـارەزوور!**

**ئـەی لوتفەکـەت خەفــی و هەواخـواه و هەمدەمــە**

**وەی سـروەکەت بەشـارەتی هــەر گۆشــەیی حوزوور**

**ئـەی هــەم میزاجی ئەشـکی تـەڕ و گەرمی عاشـقان**

**تۆفانـــی دیـــدە و شـــەرەری قەلبـــی وەک تەنـــوور!**
**گاهـــێ دەبـــی بـــە ڕەوح و دەکـــەی باوەشـــێنی دڵ**
**گاهـــێ دەبـــی بـــە دەم، دەدەمێنـــێ دەمـــی غـــوروور!**
**مەحـــوی قەبووڵـــی خاتـــری عاتـــر شـــەمیمتە**
**گـــەردی شـــەماڵ و گێژی جەنـــووب و کـــزەی دەبوور!**

**

### ٤ ـ «پارچە» قەتعە ـ «قطعَة»

پارچە، لەوانەیە بەشێ بێ لە چامە، وە ئەشگونجێ هەر ئەو پارچەیە لە دانانەکەیا لەوانە بێ خۆی پارچەیەکی سـەربەخۆ بێ و ئاشـنایەتی لەگـەڵ ئەوانیترا پچڕابێ؛ واتە: لەوانەیە هۆنەر تەنها ئەوەی ویسـتبێ، وە ئەشـێ گوزارەکەشـی تـەواو بێ. وەکـوو چۆن ئەمەیـە، ئەبێ خۆی سـەربەخۆ پارچەیەکی تایبەتی بێ و هیچ لەناو چامەدا نەبێ. وێنەی ئـەوە کە پارچەیەک بێ لـە چامە لە زۆرتر چامـەکانا هەیە. وە وێنەی ئـەوەش کە لە چامە نەبێ و سـەربەخۆ بێ، ئـەم پارچەیەی «حاجی قادری کۆیی»یە کە ئەڵێ:

**ئـەم ئاهـووە مومکیـن نییـە نەخچیـری بـە تەدبیر**
**هەڵناخەڵەتـێ، باوکەسـەگی پیـرە لـە تەزویـر!**
**چاهـی زەقەنـی مەهلەکـە ئـەی دڵ! بـە گوریسـی**
**ئـەو زوڵفە، ئەگـەر سیلسـیلەیە خۆت مەخە نـاو بیر!**

**بــێ دیتــن و بــێ واسـیتە چاتــر لــە مــن و تــۆ**
**هیچ کــەس نییە نەیناســێ، ئەگەر شـێتە، ئەگەر ژیر!**
**بــێ میننەتە خوانــی وەلــی نیعمەتــی «حاجی»**
**ئــەم شـێخە چییــە؟ قونچکی پیوازە ســەری سـیر؟!**

**

**٥ـ «یەک تاکی» ـ فەرد ـ «فَرد»**

یەک تاکی ئەوەیـە: کە هۆنەر هەندێ جار هەندە بیرێکی بۆ پەیدا ئەبێ و ئەیخاتە ناو هۆنراوێکی تەنهاوە. ئەم هۆنراوە ئاشـنایەتی لەگەڵ هیچ شـتێکی‌تردا نییە، خـۆی بۆ خۆی سـەربەخۆیە. وێنە وەکوو ئەم یەک تاکییەی «نالی» کە ئەڵێ:

**ســەوتی نەغمەی بولبولە؟ یــا چەهچەهەی خرخاڵییە!**
**دەنگــی ســۆلە؟ یــا لەژێــر پێــی ناڵەناڵــی ناڵییــە؟!**

وەیا وەکوو «شێخ ڕەزا» ئەڵێ:

**لەسایەی دەهری دوون‌پەروەر، ئەمێستە لەک، لەلەک ئەدوێ**
**بەکۆڵــێ کلکەوە ڕێوی لەگەڵ کەوڵــی دەڵەک ئەدوێ!**[1]

---

١. [وا دیارە ئەم شیعرە پێکهاتەی دوو بەیتی مەحوییە، کە دەڵێ:

**لەسایەی دەوری چەرخی سوفلەپەروەر لەک بەلەک دەدوێ**
**ســەگی ئاواتەخــوازی ئێســکی وشــتر لە شــەک دەدوێ**
**دەبینم شــێری شــێرئەفگەن دەڵەک کەوڵی دەکا، دەبیەم**
**بــە کۆڵێ کلکــەوە ڕێوی لەگــەڵ کەوڵی دەڵــەک دەدوێ**

لاپەڕەی ٣٥٦ و ٣٥٧ی دیوانی مەحوی. چاپی: بڵاوکردنەوەی کوردسـتان؛ سـاڵی ١٣٩٧هـ ـ

### ٦- «چوارخشتەکی» ڕوباعی - «رُباعي»

چوارخشتەکی: چوار نیوەهۆنراوە. لە شێوەی کۆندا وەکوو باس کراوە: ئەبێ هەر نیوەهۆنراوێکی لەسەر کێشی «لا حَوْلَ وَ لا قُوَّةَ إلّا بِاللّه» بێت. وە ئەبێ سەرواکانیشی جیا بێ؛ واتە ئەبێ سەروای نیوەهۆنراوەی یەکەم و دووەم و چوارەم یەک بن و هی سێیەم جیا بێ. وێنەی چوارخشتەکی بۆ ئەم ناساندنە، وەکوو ئەم چوارینەی «هەژار» لە گۆڕینی «خەیام»دا کە ئەڵێ:

**ئەم بوون و ژیانەی هەیە چۆن ڕووی داوە؟**
**ئەم گەوهەرە تا ئێستە بە کەس نەساوە**
**هیچ کەس نەبووە و نیشە بە ڕاست بیزانێ**
**هەرکەس بە خیاڵ شتێکی بۆ هەڵداوە**

❀❀

**چاو مەستە دە هەستە بێرە لام خونچە گوڵم**
**ماچم دەیە، بمدوێنە، مەشکێنە دڵم**
**لەم دەفری شەرابە کاسەیەک تێکە هەتا**
**نەکراوەتەوە دەفر و کاسە و گۆزە، گڵم**

هەروەها ئەگونجێ چوارخشتەکی دوو هۆنراو بێت لە «چامە» و «هەڵبەستە»، وە ئەبێ سەروای نیوەهۆنراوەی سێیەم -لەگەڵ ئەوەشدا کە لەناو چامە وەیا هەڵبەسەکەدایە- جیا بێ. لێرەدا کە لەناو چامە وەیا

---

[٢٠١٨ز].

هەڵبەسەدا بوو، مەرج نییە لەسەر کێشی «لا حَوْلَ وَ لا قُوَّةَ إلّا بِاللّه» بێ!.

وێنە بۆ ئەم جۆرەیان وەکوو ئەم دوو بەیتەی «دڵزار» کە خستوویەتە ناو هەڵبەسەکەیەوە و هەڵبەسەکەش بۆ ناسین و زانیارییە و حەوت هۆنراوەیە، وە هەمووی لەسەر ئەم ناساندنە ڕۆیشتووە کە وتمان:

**لاوی کورد! بخوێنە، خوێندن مەرهەمە بۆ زامی گەل**
**تیشکی زانینە ئەدا ڕۆشن بە ئەستێرەی ئەمەل**
**میللەتی جاهیل لە قافڵەی ژین و تاریخی بەشەر**
**دەستەپاچەکەوتووە، جێ ماوە، لەش ئیفلیج و شەل!**

**٧- «بەندی دووبارە» تەرجێعبەند و تەرکیببەند - «تَرجیعْ بَنْد» و «تَرْکیبْ بَنْد»**

بەندی دووبارە: کۆمەڵە هۆنراوێکە لەوانەیە هەموو جۆرە هۆنراوێکی بەرکەوێ؛ لە پێنج خشتەکی، شەش خشتەکی، حەوت خشتەکی، داچنراو، زیادکراو.

ئەم بەندی دووبارەیە دەستە هۆنراوێکە بەندبەند، لە دوایی هەر بەندێکا هۆنراوێک ئەوترێتەوە، بەو هۆنراوە بەندەکان لەیەک جیا ئەبنەوە. هەروەها بەندەکان یا بە هەموویانەوە، وەیا بەندبەند هەموو هۆنراوەکانی یەک سەروایان هەیە.

جیایی لە بەینی تەرجێعبەند و تەرکیببەندا ئەوەیە: ئەگەر ئەو

هۆنـراوەی کە لەبەینی بەندەکانا ئەوترایەوە، یەک هۆنراوی تایبەتی بوو، ئەوە بە کۆمەڵەکە ئەوترێ «تەرجیع‌بەند». ئەگەر یەک هۆنراوی تایبەتی نەبوو، بەڵکـوو هەر جارە هۆنراوێـک ئەوترایەوە کە جیا بوو لە هۆنراوی بەندی پێشوو، ئەوە بە کۆمەڵەکە ئەوترێ «تەرکیب‌بەند».

جـا وێنـە بـۆ تەرجیع‌بەنـد، ئـەم تەرجیع‌بەنـدەی «حەمـدی ساحێبقڕان»ـە، کـە برێتییە لە سـێ بەنـد؛ بەندی یەکـەم نۆ، بەندی دووەم هەشـت، بەندی سێیەم دە هۆنراوە. لە ناوەندی هەموو بەندەکانا ئەم تاقە هۆنراوە دووپاتە ئەکاتەوە کە ئەڵێ:

**شیرەکەم پێتان حەڵاڵە، خوێنەکەم گەر گوم نەکەن**
**نامــداران و حەمییــەت کاری ئــەولادی وەتــەن!**

ئەمەش بەندی یەکەمەکەیەتی کە ئەڵێ:

**ئەی وەتەن! کوانێ نەسیمی سوبحی عەنبەربارەکەت؟**
**کوا گوڵی خەنــدان و کوانێ عەندەلیبی زارەکەت؟**
**قومرییێ سەرشــین کە تەوقێکی لــە ملدایە ئەڵێ:**
**کوانێ پەنجەی سەروی نازت؟ بۆلەبی جۆبارەکەت!**
**کوا وەکــوو ڕۆحانییان فیرقــەی منەووەرتینەتت؟**
**بێنە سەیری مەزرەعەی ئومێدی ئەهلی شارەکەت!**
**وەک لە مەحشەردا کە عالەم گوم بکا نامەی عەمەل**
**کوا لــە مەیدانا گەڕانــی کاســب و توجارەکەت؟!**
**کوا ڕەگی ڕۆحی عومـوومی بۆ خوتووتی تەلگراف؟**

**بۆیــە ناگاتــە دراوســێ بتکــوژن، هاوارەکــەت!**

**وەک لــە نەزعا بــێ وەســییەت کا حەزینانە وتی:**

**نیمــە یارایــێ جوابــی جوملەیــی گوفتارەکەت!**

**هەر ئەمەندەت پێ ئەڵێم، ئەمما بە خەڵکیی تۆ بڵێ؛**

**هــەر لە یارت تــا ئەگاتە جوملەیــی ئەغیارەکەت:**

**شیرەکەم پێتان حەڵاڵە، خوێنەکەم گەر گوم نەکەن**

**نامــداران و حەمییــەت کاری ئــەولادی وەتــەن!**

وێنــەش بــۆ «تەرکیب‌بەنــد»، تەرکیب‌بەندەکــەی «مــەلای جزیری»یە، کە برێتییە لە «۱۳» بەند، هەر بەندێکی لە بەینی چوار و پێنج هۆنراودایە، لە دوایی هەر بەندێکیەوە هۆنراوێکی هێناوە کە جیایە لە هۆنراوی ئاخری بەندەکانی‌تر. ئەمەش یەکێکە لە بەندەکان:

**یار قەســتە جان یەغما کرت، دا موعجــزێ پەیدا کرت**

**ڕەمزێ ژ ڕەنگ عیســا کرت، دیسا شــەهیدان ڕاکرت!**

**دەوڵــەت ژ کولــێ ناکرت، جــارێ غەریبان شــاکرت**

**ڕاســتی یەدێ بەیزا کرت، مســکێ د جەرحان ڕاکرت!**

**نی خوش بکت ئەحیا کرت، شــەفقێ کە یارەب داکرت**

**ڕەش کاکولێ تاتا کرت، ســەد حەلقە چین‌چین تا کرت!**

**حەمیان ل دێم توغرا کرت، ئەو لەعل شــەککرخا کرت**

**یا ســحر بو ســینا کرت، ئەمــری هومایون ســەرمەتێ!**

بـەم جـۆرە هـەر سـیانزە بەندەکـە تـەواو ئـەکا و لـە ئاخـری هەر بەندێکـەوە هۆنراوێـک دێنێ کە جیایە لە هۆنراوی ئاخری بەندەکانی‌تر. وە سـەرواکانی ئـەم تاقەتاقە هۆنراوانـەش کە ئەیانهێنـێ هەموو وەکوو یەک وانە. بە وێنە لە ئاخری بەندێکی‌ترا ئەڵێ:

**لێ کەشـف ئەسـرار خۆ کە، مەخمـوور خەممار خۆ کە**
**حەیـران و ڕەفتار خـۆ کە، کوشـتینە تیـرا مەحبەتێ!**

**

## ٨ـ «داچنراو» موسەممەت ـ «مُسَمَّط»

بۆ ناساندنی هۆنراوی داچنراو چەن بیر و باوەڕێک هەیە:

١ـ زانایانـی هۆنـراوی عـەرەب ئەڵێـن: هۆنـراوی داچنـراو ئەوەیـە کـە بەشـەکانی عـەرووزی تیدا بێ و سـەرواداریش بێ، بـەڵام پیتی سەرواکان جیا بێ.

٢ـ زانایانی هۆنراوی فارسـی ئەڵێن: هۆنراوی داچنراو ئەوەیە شـەش نیوەهۆنـراو بـێ، واتە وەکوو شـەش بڕ بـێ، پێنج نیوەهۆنراوی لەسـەر یەک سـەروا بێ، نیوەی شەشەم سەروایەکی‌تری هەبێ کە جیا بێ لە پێنجەکەی‌تر. ئەم جۆرەیان لە زمانی کوردیدا وەنەبێ زۆر بێ.

٣ـ بـەلای کوردەوە هۆنراوی داچنراو ئەوەیە: کە شـەش بڕ بێ، دوو نیوەهۆنـراوی دوایی خاوەنی سـەروایەک بێ کە جیا بێ لە سـەروای چوار نیوەکەی پێشووی.

٤ـ هەندێکی‌تـر لـە زانایانـی هۆنـراو ـبەتایبەتـی قوتابخانـەی «رَشیدالدّین»ـی وەتـوات‌ـ ئەڵێـن: هۆنـراوی داچنراو ئەوەیـە لە هەر

هۆنراوێــکا نیــوە هۆنراوەکان ببن بــە دوو پارچەوە، وە هــەر پارچەیەک لەگەڵ پارچەکەیترا هاوسەروا بن.

جا وێنە بۆ باوەڕی یەکەم ئەم هۆنراوانەی «مەلای جزیری»ـیە کە ئەڵێ:

**«صَباح الخَیْر» خانێ من، شەهێ شیرین زبانێ من**

**تووی ڕۆحێ ڕەوانێ من، ببت قوربان تە، جانێ من**

**«تَعالَی اللّه» چ زاتی تۆ؟ چ وێ شیرین سیفاتی تۆ؟**

**نەوەک قەند و نەباتی تۆ، یەقین ڕۆح و حەیاتی تۆ!**

**حەیــات و ڕاحەتا جانــم، ســەباحەلخەیر یا خانم**

**وەرە بیناهییــا چەهڤــان، ببینــم بــەژن و بالایێ!**

وێنــە بــۆ باوەڕی دووەم ئەم پارچە هۆنراوەی «ع.ع»ــە، کە لە «٧» پارچە دروست بووە و هەموو بەم جۆرە دروست کراوە:

**بێ یار و تەنیا هەست ئەکەم بە مەستی**

**لــە کونجێکــەوە ئەڕەوێنــم پەســتی**

**چەنــد جوانە ژینــی کامەران پەرســتی**

**هەروەک ئێستالەچوارچێوەی سەربەستی**

**ئەبیســم دەنگــێ، ئەبینــم ڕەنگــێ**

**شــاییە، بەزمــە، ئاهەنگــە، ڕەزمە![1]**

١. گەلاوێژی ژمارە «٩»ی ساڵی «٧».

وێنە بۆ باوەڕی سـێیەم کە زۆرتر کورد لە هۆنراوی داچنراودا لەسەر ئەم ڕێگایە ڕەویشـتوون، ئـەم پارچەیەی «بەختیار زێـوەر»ە. پارچەکە برێتییە لە «نۆ» بڕکە، وە هەمووی لەسەر ئەم شێوەیە چووە بەڕێوە:

**لەسـەر لووتکـەی بوڵەنـدی پیرەمەگروون**

**کـە لای مـن بۆتـە شـاخی زیـو و ئاڵتوون**

**شـەوێک دیم دوو پەری پڕ سۆز و مەحزوون**

**ئەیانوت: تێبگـە ئەی چەرخـی گەردوون**

**ئەگەرچـی ڕۆژهەڵاتیـن و کەساسـین**

**لـە ڕۆژئاوایـی جوانتـر دوورشناسـین!**(١)

وێنە بۆ باوەڕی چوارەم ـکە وێنەی ئەم جۆرەیان زۆر هەیە لە زمانی کوردیدا ـ ئـەم هۆنراوانەی «عەبدولقادر ئەحمـەد»ە، کە پێنج بڕکەیە و ئەمە یەکێکیانە:

**دڵـداری نەوگوڵێکـم، هوزاری سـەرچڵێکم**

**زەدەی زام لە دڵێکم، عەوداڵی خوو سـڵێکم**

**تـازە گوڵێکـە بـەرزە، چڵێکە هـەزار تەرزە**

**دڵان ئەخاتە لەرزە، ئاسکێکە چواردە وەرزە!**(٢)

ئـەم بەشـی چوارەمە بەتایبەتی لـە هۆنراوی «مەلای جزیری»ـدا زۆرە. وەکوو وێنەی بەشی یەکەمەکە کە بۆ ئەم بەشەش ئەشێ.

❀❀

١. گەلاوێژی ژمارە «٨»ی ساڵی «٧».

٢. گەلاوێژی ژمارە «٣»ی ساڵی «٩». لە نیوەی سێیەمدا «هـ» هەزار لە کێشدا زیادە.

**٩ـ «زیادکراو» موستەزاد ـ «مُسْتَزاد»**

هۆنراوی زیادکراو ئەگونجێ لە چوارخشتەکی و هەڵبەسە و چامەدا هەبێ، وە ئەمەش برێتییە لەوە: کە لەدوای هەر نیوە هۆنراوێکەوە، تیکەیەکی کورتی ڕێکەوتوو لەگەڵ چەشنی کێشدا زیاد بکرێ، بەڵام نیوەهۆنراوە بناغەییەکان چ لە کێش و چ لە سەروادا هیچ پێویستێکیان بەو زیادانە نییە. هەروەها ئەم تیکە کورتانەش لە بەین خۆیانا هاوکێش و هاوسەروان.

جا وێنە بۆ ئەم زیادکراوە، ئەم هەڵبەسە زیادکراوەی «ناڵی»ـیە کە ئەڵێ:

**ئـەی تـازە جـەوان پیـرم و ئیفتـادە و کەوتووم**
**تا ماوە حەیاتم**
**دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم**
**قوربانی وەفاتم!**

**تۆ یووسـفی نەوحوسنی لەسەر میسـری جینانی**
**من پیرم و فانی**
**لـەم کولبەیـی ئەحزانە نە زینـدووم و نە مردووم**
**هەروا بەتەماتم**

**فەرقێکـی نەکرد نەفسـی نەفیسـم بـە عینایەت**
**وەحشی لە ویلایەت**
**لەم گۆشـەیی وێرانەیـە هەر مامـەوە وەک بووم**
**وەیشوومی وڵاتم!**

ئەی قوببەیی «طیّبە» کە دەڵێ حوققەیی «طِیب»ی
مەئوایی حەبیبی
مســکینم و بــەو خاکــە عەترناکــەوە هاتــووم
بەو بۆنەوە هاتم

هەرچەندە کە مــن عەبدم و ڕووزەردم و عاســیم
مەئموولە خەلاسیم
قوربانــی بیلالــم کــە هیلالانــە هەڵاتــووم
هەر عەفوە خەڵاتم

موددەیکــە کە هەمگەردشــی دەورانی ســوپیهرم
ئەغبەر بووە مێهرم
ئاوێنــەی دڵ شــاهیدە هەرچەنــدە ســیەهڕووم
میرئاتی جەلاتم!

ئەی مەســجید و میحرابگەهت قیبلەیی حاجات
بۆ ئەهلی موجانات
مەحجووبی هەوام و ئەمەتە مەشــهەدی مەعلووم
بۆ ڕاهی نەجاتم

ئــەی مەتلەعــی ئەنــواری هەموو قاســی و دانی
شەمسی سەمەدانی
وەک زەڕڕەیی بێ جیلوە، نە مەوجوود و نە مەعدووم
جۆیایی بەراتم!

لەم خاکی دەری ڕەحمەتــی بێزەحمەتە «نالی»!
فیردەوسە مەئالی
حاشــا کە لــە مێــدا ببمە ســائیلی مەحــڕووم
هەرچەند لە عوساتم!

**١٠ ـ «چیل» مولەممەع ـ «مُلَمَّع»**

هۆنراوی چیـل: چامەیەکە، کە هەر هۆنـراو وەیا نیوەهۆنراوێکی بە زمانێـک بێ، جا ئەو زمانە هەر زمانێک بێ. وێنەی ئەوە کە چامەکە هەر هۆنراوێکی بە زمانێک بێ وەکوو ئەم هەڵبەسـەی «نالی»ـیە کە برێتییـە لە دە هۆنراو؛ هۆنراوێکی بە عەرەبی و هۆنراوێکی بە کوردییە. ئەمە چەند هۆنراوێکە لەو:

**«یـا بَـدرُ عُلُـوّاً و ضِیـاءً و کمـالا**
**الغصْـنُ مَعَ الأصْـلِ إلَـی فَرْعِکَ مالا»**
**تا سونبولی زوڵفت لە نیهالی قەدت ئاڵا**
**من دوودی هەناسەم گەییە عالەمی باڵا!**
**«مَـا عادَلَـكَ الْبـانُ و لَا اللّینَـةُ لِینـا**
**إذْ عَدَّلَـكَ الْبـارِئُ حُسْـناً و جَمـالا»**
**من گریە و تۆ خەندە بە یەکدی دەفرۆشین**
**من لەعلی بەدەخشان و ئەتۆ لوئلوئی لالا!**

وێنـەش بۆ ئـەوە کە نیوەهۆنراوێکـی بە کـوردی و نیوەکەی‌تری بە زمانێکی‌تر بێ ئەم هەڵبەسەی «سالم»ـە کە برێتییە لە حەوت هۆنراو، هـەر نیوەهۆنراوێکی کـوردی نیـوە هۆنراوێکی فارسـی لەگەڵایە. ئەمە چەند هۆنراوێکە لەو:

**بێنە سـا بادی سـەبا لەم وەختـەدا پەیغامی دۆسـت**
**تـا کنـم جـان از سـر رَغبـت فـدای نـام دوسـت!**

**وەختــە بنیــادی وجــوودم نەیســیفەت ئاگــر بــدا**
**طوطــی طبعــم ز عشــق شــکر بــادام دوســت**
**ئاوی کەوسەر قەت قبووڵ ناکا لە دەست غیلمان و حوور**
**هر کە چون من در ازل یک جرعە خورد از جام دوســت**
**ناڵە بێتەئیســرە ئەی دڵ! زەحمەتــی خۆت بەس بدە**
**دردســر باشــد نمــودن بیــش از ایــن ابرام دوســت!**

**١١ـ «ڕزاوە» موەششەح ـ «مُوَشَّح»**

هۆنـراوی ڕزاوە لـە بنچینـەدا لـە داهێنـراوی ئەندولووسـییەکانە. ناساندنی ئەم جۆرە هۆنراوەیە بە سێ جۆر ئەناسێنرێ:

**یەکـەم:** هۆنـەر چامەیەک دائەنێ لەسـەر چەنـد بڕکەیەک، ئەم بڕکانـە هەریەکە بۆ خۆیان سـەروایەکیان هەیە، لەوانەیە هەریەک لە بڕکـەکان ئەمانیش بۆ خـۆیان ببن بە چامەیەکی سـەربەخۆ، ئەوەندە هەیە: مەرج نییە بڕکەکان هەریەکە سـێ هۆنراو بن، بەڵکوو زیاتریش ئەبن.

لەسـەر ئـەم ناسـاندنە هەنـدێ لـە «تەرکیب‌بەند»ەکانـی مەلای جزیـری و حەمـدی سـاحێبقڕان ئەگونجێ بۆ وێنە، بـەڵام ئەبێ چاو لەوە بپۆشرێ کە ئەوانە تەرکیب‌بەندن، واتە لەو ناوە.

**دووەم:** هۆنەر لەسـەر هەر هۆنـراو وەیا نیوەهۆنراوێکی چامەکەی، چەن «پیت»ـێک دائەنێ، ئەگەر ئەم پیتانەی کە بەو جۆرە دایناون، هەموو کۆ بکرێنەوە، بە ناوی یەکێک دەرئەچن، وەیا ڕستەیەکی خاوەن

گوزارە دروست ئەبێ.

ئـەم جۆرەیان لە زمانی کوردیـدا نییە. بەڵێ هۆنەرانی کورد بە زمانی عەرەبی وەیا فارسـی شـتی وایان داناوە، بەڵام بە زمانی کوردی بەرچاو ناکەوێ.

سێیەم: هۆنەر چامەیەک دائەنێ، دوایی هەر هۆنراوێکی بە چەند پیتێکـی تەنهـا دێنێتەوە، ئەو پیتانە کۆ ئەکاتەوە ئەیانکا بە وشـەیەک و ئەیکا بە یەکەم وشەی هۆنراوی دوای ئەو هۆنراوە. وێنەی ئەمەیان ئەم پارچەیەی «ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕانە» کە ئەڵێ:

**نیمـە یارایـێ نیگاهـی (غ، م، ز، ە)**
**غەمـزە دڵـدۆزە، لەتـم کە، تـۆ بـە (ش، ی، ر)**
**شیری ئەبرۆت یەک ئیشارەی بۆ منی شەیدا بەسە**
**تیژە چونکە داویـە کوورەی موحەببـەت (ئا، ب)**
**ئابـی تێغـت دیـارە ئـاوی زیندەگانـی تێکەڵـە**
**کوشـتەکانت زینـدوون تـا ڕۆژی (ح، ش، ر)**
**حەشـرە هەسـتاوە لە عالـەم قاپی تەوبـە داخرا**
**غولغولـەی عالەم کـە گەییە ئەوجـی (چ، ر، خ)**
**چەرخـی کەچڕەفتـارە باقـڵ دەورەیەکی تـر ئەدا**
**پـڕ زەهـر کـە جامەکـەم وەک (ش، ر، ب، ت)**
**شـەربەتی مەرگی لە ئاوی زیندەگی پێ خۆشـترە**
**وەعدەیـی وەسـڵی نەدەیتـێ (ح، م، د، ی)**

**حەمــدی تاکەی هــەر بنالێنی لە ژێر بــاری غەما**
**بۆچی نابێ ئەی سەنەم ڕەحمت بەویشا جارێ بێ؟!**

سـەیر ئەکەین پیتەکانی «غ، م، ز، ە»ی کرد بە «غمزە» و کردی بە یەکەم وشــەی ســەرەتای دووەمی نیوەهۆنراوەی هۆنراوی یەکەم. «ش، ی، ر» بــوو بە «شـیر» بۆ ســەرەتای هۆنــراوی دووەم. «ئــا، ب» بوو بە «ئاب» بۆ ســەرەتای هۆنراوی سـێیەم. «ح، ش، ر» بوو بە «حشـر» بۆ ســەرەتای هۆنــراوی چــوارەم. «چ، ر، خ» بــوو بە «چرخ» بۆ ســەرەتای هۆنــراوی پێنجــەم. «ش، ر، ب، ت» بــوو بە «شــربت» بۆ ســەرەتای هۆنراوی شەشەم. «ح، م، د، ی» بوو بە «حمدی» بۆ سەرەتای هۆنراوی حەوتەم. وە بەم جۆرە پیشەیەکی لە هۆنراوەکانیا دروست کرد.

❃❃

شـتێک هەیـە لێرەدا: کە ئـایا هۆنــەر ناو وەیا نازناوی خۆی ئەخاتە هۆنــراوەوە؟ ئەمە لە چ ســەردەمێکا ئەبێ داهاتبێ؟. لەگــەڵ ئەوەدا لە چەرخەکانی پێشــووی تەنانەت ئیسلامیشــدا ئەم ڕەوشــتە نابینرێ!.. وا دیارە ئەم ڕەوشــتە بەرانبەر بــە هۆنراو لە پاش دەســەڵاتی مەغوولەکانا بوو بەســەر ئــەم ناوچانەدا و ئــەم ڕێچکەیە ئەبێ لەوانــەوە داهاتبێ!. بیروباوەڕی «دوکتۆر ئەدوارد براون» بەرانبەر بە هۆنراوی فارسـیش هەر چەشنی شتە.

لەپاش پشکنینی من ـ وەکوو بۆم دەرئەکەوێ ـ لەناو ئەدەبی کوردیدا لەپێـش چەرخــی مــەلای جزیریــدا یەکێکی‌ترمــان بەرچــاو ناکەوێ کــە ناوی خــۆی خســتبێتە هۆنــراوەوە!. مەلاش ئاشـکرایە کــە لە پاش

مەغوولـەکان بووە، چونکە دەسـەڵاتی مەغوول لـە چەنگیزخانەوە لە «١٢١٧»ی میلادییـەوە بوو تا «١٣٣٥»، دەوری «ئەبووسـەعید». مەلا لە «١٤٠٧ ـ ١٤٨١»دا بـووە. پێش ئەم مێـژووە هۆنەرێک لە کورددا بەرچاو ناکـەوێ کە ناوی خۆی لـە هۆنراودا دانابێ. کەواتـە ئەگونجێ داهاتنی ئەم ڕەوشـتە لەناو کورددا ـکە هۆنەر ناوی خۆی بخاتە هۆنراوەوەـ پاش دەسەڵاتی مەغوول بووبێت بەسەر ئەو ناوچەیەدا..

# وردبوونەوەیەک لە هۆنراوی کوردی!

شـوێن و کات و چۆنیەتی ژیان، دەسـتێکی درێژیان هەیە لەوەدا کـە خورپەی خـۆیان بە هۆنەر بگەیەنن بۆ دانانـی هۆنراوەکەی؛ واتە: کارەسـاتی ئەو ناوچەیە هۆنراو دروست ئەکا و هەر ئەو کارەساتەشە کە هۆنـراوەکان لە یەک جیا ئەکاتەوە، تا هۆنەرەکـە وای لیٚ دیٚ ئەکەوێتە ناو یەکیٚ لە قوتابخانەکانی هۆنراوەوە و لەو ناوچانەوە سەر هەڵئەدا.

ئەوەنـدە هەیە: ئایا ئەم پەردانە بۆ بێجگە لـە هۆنەرەکە، لە چییەوە وەرئەگیررێـن؟. دیارە وەرگرتنەکە لە جەرگی هۆنراوەکانەوەیە؛ بیٚگومان شـتێک پاڵـی ناوە بـە هۆنەرەکـەوە بـۆ دانانـی هۆنراوەکـەی، هۆنراو و بەرهەمەکـە ئەبـن بە ئاوێنە بـۆ ئەو شـتە و ئەتوانریٚ کـە بەرهەمەکە خوێنرایـەوە، بـە تەواویی چۆنیەتی ئەو شـتانە دەرکـەویٚ کە ئابلۆقەی هۆنەرەکەیان داوە.

ئەمـە بـە جۆرێکی تێکڕایی، بـە جۆرێکی تایبەتیـش بۆ ئەدەب و هۆنـراوەی کـوردی ئەوەیە: هەتا دوورتـر بیٚ لە ناسـاندنە زانیارییەکان، ئـەوە بـۆ کرۆکەکـەی بەنرختر ئەبـیٚ؛ واتە هـەتا کۆنتر بیٚ مەبەسـتی هۆنەرەکـە لە ناسـاندنەکان دوورتر ئەبیٚ، چونکە ئەم ناسـاندنانە کە بۆ ئەدەب و هۆنراو ئەکریٚ، هەموو لە زادەی ئەندێشە و لە بیروباوەڕێکی زانیارییەوە ڕوو ئەدەن، ئەم ناسـاندنی بەشـکردنانەش بەم جۆرە ناگاتە سـەدەیەک یا دوو سـەدەی پێـش ئیمـڕۆ؛ ئەویـش بـە مەرجێک کە گوزارەی ناساندنەکان گەیشتبیٚ بە هەموو کەس.

تەنانەت ئەتوانی هۆنراوی کوردێکی دوور لە هەموو ناوچەیەکی کۆمەڵایەتی و شارستانی ئیمڕۆ ـ با نیمچەخوێندەواریش بێ ـ لەلایەن ئەدەب و گوزارشتدانەوەیەکی سادەوە بۆ شت، بەلاتەوە بەرزتر بێ لە هی هۆنراوی کوردێکی تێکڵاو بەو کۆمەڵایەتی و شارستانییە ـ با دانانەکەشی کۆنتر بێ لەوی پێشوو ـ چونکە ئەگونجێ ئەمەی دواییان بەهۆی تێکڵاوبوونی بەو کۆمەڵایەتی و شارستانییەوە، بیرەکەی لە ناساندنی بەشکردنە زانیارییەکانیش وەربگرێ، بەڵام ئەوی یەکەمیان گومانی تێدا نییە کە تەنها لە ناوچەکەوە هەڵئەقوڵێ و خۆی هیچ ئاگای لە ناساندنی بەشکردنەکە نییە!. هۆنراوی ئەمەیان بە تەواوی بۆ ئەوە ئەشێ کە بیکەیت بە نموونە و بەڵگە بۆ هەموو ناساندنێکی تر[1]..

کەوابوو، ئێستە ئێمە ئەگەر بمانەوێ نموونەیەکی هۆنراوی زۆر کۆن لەچاو هۆنراوەکانی ترا بۆ ئەدەبی کوردی بگرین بەدەستەوە و چەند پەردەیەکی لێ وەربگرین، بەبێ ئەوە ئەو کەسەی دایناوە ئاگای لە بەشکردن و ناساندنی زانیاری هەبووبێ، ئەم چەند هۆنراوانەی خوارەوەیە کە چۆنیەتی هۆنراوەکان چەند پەردەیەکمان پیشان ئەدەن؛ هەم پەردەی ڕەگەزی زمانەکە، هەم پەردەی چۆنیەتی ئەو ڕۆژە، وە هەم بەڵگەیەک بۆ دروستکردنی هۆنراوی کوردی لەو سەردەمەدا. لەگەڵ ئەمانەشا یەکێ لە [نا]ساندنەکانی تازەش ـ کە چۆنیەتییە ـ تیایا دێتە دی و بەر ئەو ئەکەوێ لە لایەن ئەو بەشکردنەوە.

---

١. مەبەست بە بەشکردنەکان: جەفەنگی، نیازیی و چۆنیەتییە.

لە دەوروبەری سەدەی شەشەمی پێش میلاددا گێتی ئەم ڕۆژهەڵاتە پەردەیەکی تری بەسەرا هات، بەهۆی ئەو پەردەیەوە هەموو جۆرە کاروبارێکی ئایینی و کۆمەڵایەتیی سەردەمی پێشوو تێک چوو، ئەو ڕەوشت و خووانە کە لە سەردەمی پێشوودا بە سەدها ساڵ لەسەری بوون، بەهۆی تێکچوونی بیروباوەڕی ئایینییانەوە ئەوانیش ڕوویان کردە دوایی هاتن و چوونەوە بۆ جیهانی نەبوونی!..

ئەمە ڕەوشتی هەموو ئایینێکی تازەیە: کە کەوتە شوێنێکەوە لەبەر ئەوە کە زۆرتر لە ڕەوشت و پەیڕەوی ئەو شوێنە پێی بەندی ئایینە، هات و ئایینەکە تێک درا، ڕەوشت و پەیڕەوییەکەش تێک ئەچێ و جۆرە شتی‌تری تایبەتی وەها ئەهێنێتە پێشەوە، کە لەگەڵ بیروباوەڕی خۆیا بگونجێ!.

وڵاتی کوردەواری تا ئەو سەردەمە کە هەڵگری بیروباوەڕی ئایینی زەردەشتی بوو، ئایینی زەردەشتیش وەکوو هەموو جۆرە ئایینێکی‌تر یاسا و دەستوورێکی تایبەتی هەبووە بۆ خۆی، ئەوانەی شوێن ئایینەکە ئەکەون ئەو ڕەوشتە وەرئەگرن کە لەگەڵ کرۆکی ئایینەکەدا بگونجێ. ماوەی سیانزە سەدە ئایینێک لە شوێنێکدا ڕەگ داکوتێ، بێ‌گومان گەلێ خووڕەوشتی وا ئەچەسپێنێ کە ڕۆزگارێکی دوور و درێژی ئەوێ، تا ئەوانە بە تەواوی بنەبڕ بین!!...

لە سەرەتای ساڵی «١٧»ی هیجرییەوە ئایینی ئیسلام لە وڵاتی کوردەواریدا دەستی کرد بە بڵاوبوونەوە و دەستی کرد بە ڕوخان و لە بن دەرهێنانی ئایینی پێشوویان ـ کە ئایینی زەردەشتیی بوو ـ. دیارە هۆگر بوون بە ئایینێکی زیاتر لە هەزار ساڵییەوە هەروا بە ئاسانی بە ئایینی

تازەداهاتــوو لانابــرێ!. لەبــەر ئەمە لە ســەردەمی هاتنــی ئایینی تازەدا ئەوانەی کە هۆنەر و زمانی نەتەوەکەن، دێنە قسەکردن و ئەکەونە شت وتــن، ئەو وتنەی ئــەوان بۆ ڕۆژەکانی پاش ئەوان ئەبــێ بە بەڵگە و بە ئاوێنە بۆ ڕوونکردنەوەی بیروباوەڕی ئەو ڕۆژە!.

یەکێ لەو بەڵگانە کە ئێمە بۆ ئەدەبێکی هەزار و دوو ســەد ســاڵیی وەیا زیاتــر پێش ئەم ڕۆژە بیگرین بە دەســتەوە، ئەم هۆنراوانەن کە لە پارچە چەرمەکانی «هەزارمێرد»[1]دا بینراونەتەوە و ئەڵێن:

**هورمــەزگان[2] ڕمــان، ئاتــران کــژان**

**وێشــان شــاردەوە گەورەی گــەورەکان**

**زۆرکار ئــارەب کردنــە خاپــوور**

**گنــای پاڵەیــی هەتــا شــارەزوور!**

**شــن و کنیــکا وەدیــل بشــینا**

**مێــرد ئــازا تلــی وە ڕووی هوینــا**

**ڕەوشت زەردەشــترە مانووە[3] بێ کەس**

**بزیــکا نیــکا هورمــز وە هیــوچ کەس!**

جــارێ بەڵگە بۆ ئەوە کــە ئەم هۆنراوانە پارچــە هۆنراوێکی کوردین، تاک‌تاکــی ئــەو وشــانەیەتی کــە بــە زمانێکی کوردیــی پەتی وتــراون و ئــەو کوردییانەش بە شــێوەی ئــەردەڵان و موکری تا ئیمــڕۆ ماونەتەوە و

---

۱. گوندێکە لە وڵاتی سولەیمانی.

۲. «هورمِزگان» ـ نسخە.

۳. ماوە ـ ن.

ئەوترێــن، ئەمــە گەواهییەکی زۆرمان بۆ ئەدەن!. وشــەکانیش «رمان، شاردەوە، گەورە، کردن، خاپوور، پاڵە، هەتا، دیل، مێرد، ئازا، تل، ڕووی، ڕەوشت، بێ کەس».

ئەو وشانەش کە بەهۆی پیت وەیا لێوەرگرتنەوە هەن وەکوو:

«هورمــەزگان» وە یا «هورمــزگان» کە لە ڕیشــەدا لەگــەڵ مزگت ـ مزگــەوت یــەک ئەگرێتــەوە. «ئاتــران، ئاتــر = ئاگر، ئــاور، ئایــر، ئاهر» تەنهـا پیتی ناوەڕاسـت گۆڕاوە. «کژان = کوژان» کـە لە یەک بنەچەن. «وێشــان = خۆیان» کە ئێســتەش لــە هەوراماندا ئەوترێ «وێشــان». «گنــای = گوند، دێ»؛ دیارە گنای و گوند دوور کەوتنەوەی زەمان نەبێ هیچی‌تــر دەســتکاری نەکــردووە. «پاڵــە = کرێــکار» کە ئەم وشــەیە لە شــێوەی ئەردەڵان و لوڕدا هەر پاڵەیە. «شــن ـ ژن» بەینی وتنی شــین، ژێ، ئەوەمان پیشــان ئەدا کە گەلێ جار لە زمانی کوردیدا ئەم دووە لە شوێنی یەک دائەنیشن، وەکوو لە کوشتن و کوژراندا هەیە.

«کنیــک = کەنــی، کەنیشــک، کیــژ، کچ، کناچــە» وەکــوو بۆمان دەرئەکــەوێ ئــەو دەســتکارییەی کــە لــە بەینــی «کنیــک ـ کەنــی ـ کەنیشک»ــدا هەیە، هیچ زیاتر نییە لەو دەســتکارییەی کە لە بەینی «کەنیشک، کیژ، کچ، کناچە»دا هەیە. «بشینا» کە بە واتەی «بردن»ـە، ئێســتەش لە شــێوەی هەورامیدا هەر هەیە. «هویــن = هوون، خوێن، هــون» لە شــێوەی لوڕدا «هــوون». هوون و هوین هەموو چەشــەیەک ئەزانــێ کە لە یەکــن. «مانوە = مــاوە» بێجگە لەوە کە ئەم دوو وشــەیە جیاییەکەیان تەنها کەمبوونەوەی پیتێکە لە شــێوەی ئێســتەدا، شێوەی هەورامیــش هەر بەو جــۆرە ئەیڵێتەوە. «بزیــکا = بەزەیــی» ڕەگەکە لە

هـەردوو لادا هەیە «نیکا» لە شـێوەی لوڕدا ئەڵێ «نیـەکا»، لێرەدا واتە: «نایەتـەوە». دیارە نیەکا و نیکا لە وتن و گوزارەدا یەکن. «هیوچ = هیچ» گومانێک لەوەدا نییە کە درێژیی زەمان «هیوچ»ـی گۆڕیوە بە «هیچ».

بەپێی ئەم لێکدانەوەیە، ئەوە بۆ ئێمە سـاغ بووەوە: کە ئەم هۆنراوانە هۆنراوێکی کوردین و داستانێکی ڕابووردوو ئەگێڕنەوە.

مایەوە سـەر ئەوە کە ئەم پارچەیە ئەبـێ هی چ ڕۆژێـک بێ؟. وەیا چۆن بۆمان دەرکەوێ کە هی ئەو سەردەمەیە کە ئێمە مەبەستمانە؟!.

❋❋

ئـەم هۆنراوانـە دەردە دڵێـک و جـەوری ڕۆژێـک ئەگێڕنـەوە کـە دەسـتەیەکی بێگانـە چـوون ئەو شـوێنەیان تێـک داوە و وڵاتەکەیان وێران کردووە و دانیشـتووەکانیان بەدیل گرتووە. ئەمانیش بەرەنگاریان بوون و لەسـەر ئاو و خاکی خۆیان خۆیانیان داوە بە کوشت. کاتێ کە بە تەواوی بێهێزییان بەسەرا هاتووە، کەوتوونەتە گێڕانەوەی چۆنیەتی کارەساتەکە!.

ئـەم جۆرە شـتانە لـە هەموو چەرخێـکا و لە هەموو شـوێنێکا و لە ناو هەموو نەتەوەیەکدا ڕوو ئەدا کە شـوێنیان داگیر بکرێت و پاشـان بکەونە گێڕانەوەی بەسەرهاتی خۆیان. بەڵام ئەبێ ئێمە لەوە تێبگەین کـە ئـەم هۆنراوانە کارەسـاتی چ ڕۆژێـک ئەگێڕنەوە؟. بۆ ئـەوە بتوانین بیانکەین بە بەڵگە بۆ ئەو ڕۆژە..

بێگومـان لابـردن و هەڵکەندنـی بیروباوەڕێکـی ئایینـی ـکە ئەو بیروباوەڕە لەناو نەتەوەیەکدا ڕیشـە دابکوتێـ هەروا بە ئاسانی لانابرێ

و هەڵناکەنرێ!...

وەکوو لە پێشەوە باس کرا، ئەو نەتەوەیە کە ئەم هۆنراوانەی تیا وتراوە، وەیا وتوویە، ماوەی زیاتر لە هەزار ساڵێک لەسەر ئەو ئایینە پێشووە بوون، ئەو ئایینە تێکلاوی هەموو دەمارەکانیان بووە، کوتوپڕ کە لێشاوێک هات و ویستی ئەو بیر و باوەڕی ئایینە پێشووەیان بگۆڕێتەوە بە شتێکی‌تر، ئەم دەستەیە کە ئەم ئیشە ئەکا، ئەوە ئەگەیەنێ کە دەست ئەخاتە ناو دەستلێدانی جەرگی بناغەیەکی بیروباوەڕی لە هەزار ساڵ زیاتر!. کەوابوو ناتوانێ هەروا بە سووک و ئاسانی ئەو باوەڕانەی پێشوو لە مێشکیانا دەرکا. بەڵکوو هەڵکەندن و دەرکردنی باوەڕێکی وا بە لایەنی کەمەوە لە بەینی سەدوپەنجا تا دووسەد ساڵی ئەوێ؛ چونکە بەرە و نەتەوەی ئەو ماوەیە بەبێ گومان هەر چاو ئەبڕنە ئەو شتەی پێشوویان، وەیا دڵیان ئەڵهایەکی هەر بۆ ئەکا!..

کەوابوو، دانانی ئەم هۆنراوانە ئەکەوێتە بەینی ساڵانی «١٧-٢٠٠»ی هیجریەوە، چونکە پاشەرۆکی بەڵگەکانی پێش ئەو مێژووە تا بەینی دوو لاپەڕەی ئەو مێژووە هەر ئەمێنێتەوە.

مایەوە سەر ئەوە کە یەکێ بڵێ: ئەم هۆنراوانە وەکوو ئەگونجێ کە بە دووسەد ساڵ پاش هیجرەت وترابن، ئەگونجێ بە هەزار ساڵیش هەر پاش هیجرەت وترابن. بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نییە کە دانی پیا بنێ: ئەم هۆنراوانە هی چ چەرخێکن؟!. ئەم قسەیە ئەکرێ و ئەم ڕەخنەیە ئەگیررێ.

ئێمەش ئەڵێین: بەڵێ قسەکە وایە، بەڵام مێژوو ئەمەمان بۆ دەرئەخا لەو ڕۆژەوە کە ئایینی ئیسلام کەوتۆتە کوردەوارییەوە تا ئەم ڕۆژە، ڕۆژێک

نەبووە کە ئەو ئایینەی لێ دەرچووبێ و کەوتبێتە سەر ئایینێکی‌تر؛ واتە لە بەرەبەیانی ئایینی ئیسلامەوە، ئەو بنجەی لە کوردەواریدا دایکوتاوە تا ئیمڕۆژ ماوەتەوە و هیچ ڕۆژێک لێی دوور نەکەوتۆتەوە، بەڵکوو ڕۆژبەڕۆژ بەهێزتر بووە!. دیسان هەموو مێژوونووس و کەسێکی‌تریش هەر دان بەوەدا ئەنێن: کە ئاشنایەتی کورد لەگەڵ ئایینی ئیسلاما چەندە کۆک بووە و چەندە بە سۆز هەڵیان‌گرتووە. لەگەڵ ئەوەشا هەتا هاتووە هەر زیاتر هۆگری بوون.

نەتەوەیەک کە ئەوەندە پابەند بێ بە ئایینێکەوە، هیچ ڕۆژێک لە ڕۆژان ناوێرێ ئەوە بە دڵیا بێت کە پێچەوانەی ئەو ئایینە شتێک دابنێ و شتێک بڵێت، چونکە ئەگەر بە پێچەوانەی ئەوە شتێکی وت خۆی بە کافر ئەزانێ!. کافری و بیروباوەڕی کوردیش گەلێ لێک دوورن.

ئەمە و دیسان: ئەگەر لەم ماوە دوور و درێژەی سەردەمی ئیسلامیدا تا ئەم سەرەتای سەدەی بیستەمە، شتێکی پێچەوانە بوترایە بێ‌گومان ئیمڕۆ ئەکەوتە بەرچاوی یەکێک، وەیا یەکێک ئەیبیست کە شتێک پێچەوانەی ئایین وتراوە. خۆ ئەم هۆنراوانەش دیارە ئاخ و داخیانە بۆ ئەو سەردەمەی کە ڕەوشتی زەردەشتی بە بێکەس ماوەتەوە. ئەم جۆرە لاوانەوەیە بۆ سەردەمێکی ئیسلامیی هەر نەبووە و نابێت!. وەختێ کە ئیسلام بنجی داکوتا، ئەڵهاکردنی بیر و باوەڕی پێشوو بە بێدینی ئەزانرێ؛ کوردیش ئاشکرایە گورۆی دین بووە. کەواتە، هۆنراوەکە هی سەردەمێکە کە هێشتا ئایینی تازە بنجی دانەکوتاوە، ئەو سەردەمەش وەکوو لێکمان دایەوە لە بەینی «١٧-٢٠٠»ی پاش هیجرییەوە بووە. جا لەو ماوەیەدا هی چ ڕۆژێکیەتی، دوور نییە ئەمەی تۆزێ تاریک بێ.

هەرچەندە بەو بەڵگەیە کە ئایینی تازە ڕۆژبەڕۆژ زیاتر بنجی دائەکوتا و مەردمی لە ئایینی پێشوو دوورتر ئەخستەوە، ئەوە زیاتر ئەچێتە دڵەوە کە وتنەکەی نزیکتر بێ لە «١٧»ی هجری و زیاتر بەلای ئەوا بڕوا تا بەلای «٢٠٠»ـەکەدا...

بە پێی ئەم لێکدانەوەیە بۆ ئێمە ساغ بووەوە: کە ئەم هۆنراوانە لە بەینی «١٢٠٠ ـ ١٣٧٠» ساڵ لەمەوپێشتر وتراون، وە بۆ ئەوە کە گومانی تێدا نەمێنێ، کەمترەکەش ئەگرین بە دەستەوە!.

ئەمە و دیسان: ئێمە ئەبینین لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمی هیجریدا ئایینی ئیسلام بە جۆرێک لەناو کورددا بڵاو بووبووەوە و بنجی داکوتابوو، کە گەلێ پیاوانی زانای دەروێشی تێدا هەڵکەوت، نەتەوەیەک لەو سەردەمەدا بگاتە ئەو پایە دینییە، تازە زۆر دوورە بێنێ ئاوڕ بداتەوە لە ئایینێک کە ئیسلام پێچەوانەی خۆی دائەنێ!...

کەواتە، بۆ باسی ئەدەبێکی کوردی و بەڵگەیەکی کۆنی کوردی سەردەمی ئیسلامیی، ئەم هۆنراوانەمان بۆ بوو بە بەڵگەیەکی بەهێز و بە هەموو ئاشکراییەکەوە ئەڵێین: ئەم پارچەیە دانانەکەی کەمتر نییە لە «١٢٠٠» ساڵ لەمەو پێشتر!!...

# وردبوونەوەیەک لە بابە تاهیر و چوارخشتەکییەکانی!

١٠١٠ - ٩٣٥

وەکوو بۆمان دەرکەوت ئەو ڕۆژانە کە بەسەر وڵاتی ڕۆژاوای سەردەمی سەرکەوتنی ئیسلامیدا هات، ڕۆژانێک بوو کە هەموو جۆرە بەڵگەیەکی وڵات بەهۆی سەرکەوتنی ئیسلام و ئەو زمانەی کە ئیسلام قسەی پێی ئەکرد، تیا چووا!. لەوانە بوو لەو هەوارە هەر شوێنئاگردانێک مابووەوە!. بە تایبەتی ئەو وڵاتەی کە ناو ئەبرێ بە وڵاتی کوردەواری و کوردوستان، وەکوو شوێنەکانیتری ژێر فەرمانی ئیسلامەتی، ئیسلام دەستی کێشابوو بەسەریا، ئەدەب و ئەدەبیاتی هەموو لایان خەریک بوو بەهۆی زمانی سەرکەوتووەوە ڕوو لە ئاوابوون بووا!..

پەیدابوونی بنەماڵەی عەباسی لە بەغدادا تا ڕادەیەک دەستێکی درێژی هەبوو بۆ زۆر کزبوونی ئەو ئەدەب و ئەدەبیاتەا!. هەر لەو سەردەمەدا هەڵگرانی بنەماڵەی غەزنەوی و سەلجووقی لە وڵاتی ئێرانی ئەو سەردەمەدا، پشتیوانێکی گەورە بوون بۆ زیندووبوونەوەی زمانی ئەدەبیی ئەو وڵاتانە. لە سەردەمی ئەمانا وردەوردە ئەدیب و هۆنەرانی شوێنانی ژێر فەرمانی ئەمان، دەستیان دایەوە بە زیندوو کردنەوە و بووژاندنەوەی ئەو ئەدەبەیان کە تا ئەو سەردەمانە هەر خەریک بوو کز و سیس ئەبووا!..

زمانی فارسی و کوردی سەرچاوەکەیان یەکە و لە ڕیشەیەکەوە

هاتوون. ئەڵێین لە ڕیشەیەکەوە هاتوون، چونکە لە پاش بەرزبوونەوەی ئەو ڕیشـەیە، زمانی فارسـی لە زمانـی کوردییەوە بوو بـە لقێک و لەو لقـەوە بەرز بـووە و هۆنـەر و ئەدیبەکانی زمان بە هەمـوو جۆر کەوتنە کۆششـی بەرزکردنەوەی ئەو زمانەیان، کە تا ئەو سـەردەمانە لەوانە بوو بە تەواوی نەمێنێ و بپووکێتەوە!. هەر لەم کاتەدا ئەم زمانی فارسییەش بـە هۆی فەرمانەوە هێزێکی گرت، لە وڵاتی خۆی و دراوسـێی خۆیدا بـڵاو بووەوە. تا لە سـەدەکانی نۆیەم و دەیـەم و یانزەهەمی میلادیدا بە پوختی و جوانی پەرەی سـەند و لە هەموو لایەکەوە ئەدیب و هۆنەری بەرزبەرزی لێ پەیدا بوو.

لـە بەینـی دوو لاپەڕەی ئـەم مێژووانـەدا لە وڵاتی «هەمـەدان» و دەوروبـەری هەمەدان، هۆنەرێکی ڕەنـد بە ناوی «بابەتاهیر»ەوە پەیدا بوو، ئەویش وەکوو ئەو هۆنەرانە کە هەبوون، دەستی کرد بە هۆنراو وتن و بە سرووودی هۆنراو دانان.

کـەس ئـەوەی نەوتووە و نایڵێ کـە بابەتاهیر لـە ڕەگەزێکی جیا لە ئارییە، بەڵکوو ئەگەر قسەیەک لە ناوا هەبووبێ هەر ئەوەیە کە ئەڵێن: بابەتاهیـر بە زمانی فارسـی ڕێـگای هۆنراوی گرتـووە و دەنگی لەبارەی چوارخشتەکیدا بەو زمانە بەرز بووەتەوە. لەگەڵ ئەوەشا بێجگە لە شێوەی چوارخشتەکییەکانی، بابەتاهیر پیاوێکی لوڕی و لوڕستانی بووە. کەچی ئەوانـەی چوارخشـتەکییەکانیان خوێندۆتەوە و بەرچـاویان کەوتووە، وایان بـۆ دەرکەوتووە کە بابەتاهیر پیاوێکی فارسـیی بـووە!. هەرچەندە تا ئێسـتەش ئەم ناوە ـ واتە ناوی فارسـیبوونی ئاشـکرای ـ لە کتێب و لە باسـی هۆنراو و ئەدەبدا نەبیسـتراوە و نەبینـراوە، بەڵکوو ئەوپەڕی هەر

ئـەوە وتـراوە: «بابەتاهیری هەمەدانی» وەیا «بابەتاهیـری عوریان»!. نە «عوریان» گوزارەی فارسـیبوونیە، نە «هەمەدان»!. هەمەدان ئاشکرایە ـبا نەشـگەڕێتەوە بۆ پێش ئـەو مێژووەـ هەموو دەم شـوێنی لوڕەکان بـووە و ئەوانی تیا دانیشـتوون. لوڕیش هەموو کـەس بەبێ گیروگرفت دانی پیا ئەنێ کە کوردە. کەوا بوو، بابەتاهیر جارێ بەپێی مەڵبەندەکەی کورد بوو. ئەمێنێتەوە سەر شێوەی چوارخشتەکییەکانی!...

سـەردەمی بابەتاهیـر و پێـش ئـەو و پاش ئـەو، ئـەوە بینـراوە: کە هۆنەرێکـی فـارس وەیا هۆنەرێکی کورد بە زمانی فارسـی هۆنراو بڵێت و ئـەدەب دابنێ، بـەڵام نەبینراوە کە هۆنەرێکی فـارس بێنێ بە زمانی کـوردی هۆنـراو دابنـێ!. بابەتاهیر کە بە شـێوەی لوڕی چوارخشـتەکی هەیـە، ئەمە ئەوە پیشـان ئـەدا: کە خۆی لە لوڕەکان و کـورد بووە، ئەو پیشـان نادا کە فارسـێک بووە و هۆنراوی بە کـوردی داناوە!. بۆچ ئەمە پیشان نادا؟. چونکە:

وەکوو لـە لایەن سـەرکەوتنی زمانێکـەوە زاناکان باس ئەکەن، ئەو زمانە کە سـەر ئەکەوێ و مەردمی‌تر شـوێنی ئەکەون، چەند هۆیـەکی هەیە:

یەکـەم: هۆی ئایینییـە، ئەو زمانە کـە بوو بە هۆی هەڵگیرسـاندنی ئایینێـک ـبا ئایینەکە هەر ئایینێک بێت ـ سـەر ئەکەوێ و لەبەر ئەو هێزە سافە گیانییە، مەردم شوێنی ئەکەون و وەری‌ئەگرن.

دووەم: هۆی فەرمانە؛ زمانێک کە لە بارەی سیاسـەتەوە دەسـەڵاتی پەیـدا کـرد و بە هێز بوو، ئـەو زمانە ئەکەوێتە برەو و خەڵک شـوێنی ئەکەون.

سێیەم: هۆی کاروباری ئابووری و شت لێوەرگرتنە، زمانی کە بەهۆی بنەڕەتی ئابوورییەوە بنجی داکوتا، بێجگە لە کوڕی خۆیشی دێنێ فێری ئەبێ و ئەویش خۆی لە ناویانا ئەچەسپێنێ، وەکوو لەم سەردەمانەی دواییەدا زیاتر ئەم جۆرەیان پەیدا بووە!..

زمانی کوردی لەو سەردەمەدا نە زمانی ئایین بووە، نە زمانی دەستەی خاوەن فەرمان، هەتا کوڕی بێجگە لە زمانەکە بێنێ شوێنی کەوێ و فێری ببێ، بە فێربوونێکی وا بتوانێ هۆنراو و ئەدەبی پێ دابنێ، وە نە زمانی ئابووری ئەو سەردەمەش بووە.

کەوابوو، ئەگەر ئێمە بەڵگەیەکی ئەدەبی ئەو ڕۆژەمان بەرچاو کەوت کە لە شێوەیەکی کوردیدا وترابوو، لەبەر ئەو شتانە کە باسمان کرد، خاوەنی ئەو بەڵگەیە کوردە و بێجگە لە کورد هیچیتر نییە. یەکێکی وەکوو بابەتاهیر لەوانەیە!..

مایەوە سەر ئەوە کە بڵێین: چی ساغی ئەکاتەوە بۆ ئێمە کە چوارخشتەکییەکانی بابەتاهیر بە شێوەی کوردی وتراون؟. لەگەڵ ئەوەشا دەنگ هەر وا بڵاو بووە کە شێوەی هۆنراوی بابەتاهیر شێوەیەکی فارسییە!!..

دوو شت ئەمە بۆ ئێمە دەرئەخا: یەکەم، لەبەر ئەوە تا ئێستە لێکۆڵینەوەیەک بە جۆرێکی زانیاری لە زمانی کوردیدا بەرانبەر بەو نەبووە، ئەو دەنگە هەروا ڕوەیشتووە کە چوارخشتەکییەکانی بابەتاهیر شێوەی فارسییە!. وە زمان و قەڵەمی چاپیش هەر بەدەست ئەو شێوەیەوە بووە و ئەویان بەو شێوەیە داناوە!... دووەم ئەو وشە زۆرانە کە لە چوارخشتەکییەکانا هەن و هەمووی وشەی لوڕی کوردییە، ئەمەمان

بۆ ساغ ئەکاتەوە: کە ئەم چوارخشتەکییانە بەڵگەیەکی کوردی هەزار ساڵێک لەمەوبەرن!..

ئەوەشمان بۆ دەرکەوت: کە بابەتاهیر نەیهێناوە بە دەسانقەس ئەم وشانە بخاتە چوارخشتەکییەکانیەوە، چونکە وەکوو وتمان، ئەم وشانە کە وشەی کوردی خاوەن وشەکەن ـکە کوردەـ نە زمانی ئایینی بووە، نە زمانی سیاسی و ئابووری ئەو سەردەمە، تا بابەتاهیر وا لێ بکا بێنێ فێری ببێ و بیخاتە ناو هۆنراویەوە و ئەدەبی پێ دابنێ. وەکوو ئەوەشمان بۆ دەرکەوت: کە هیچ هۆنەرێکی فارسیی ئەو سەردەمە دوای ئەو سەردەمەش نەیهێناوە بە زمانی کوردی هۆنراو دابنێ، وەیا زمانی کوردی بە تەواوی بخاتە ناو هۆنراویەوە، وەکوو ئەمە لەگەڵ زمانی عەرەبیدا کراوە بە هۆی سەرکەوتنی ئایینەوە؛ واتە: تیەڵکێشی زمانی عەرەبی لە زمانی فارسیدا!..

**

جا بێینە سەر ئەوە لە هەندێ لەو چوارخشتەکییانە بکۆڵینەوە:

بابەتاهیر بێجگە لە هەڵبەسە و چامە، هەندێ دووبەیت وەیا چوارخشتەکی هەیە کە تا ئێستا بە ناوی «رباعيات بابەتاهیر»ەوە چەند جارێک بە هۆی چەند چاپخانەیەکەوە لە چاپ دراون، لە هەر یەک لەم چاپانەدا بە جۆرێک چاپ کراون، زیاد و کەمی لە هەموویانا پێوە نراوە. ئاخر چاپێ کە دەرچووبێ لە لایەن «مؤسسۀ مطبوعات امیر کبیر» لە فەروەردینی «١٣٣٤»ی شەمسیدا لە تاران دەرچووە. لێرەشا هەندێ چوارخشتەکی هەیە کە ئەڵێ: ئەمە جێی گومانە کە هی

بابەتاهیر بێ!..

لـە ڕاسـتیدا لە هەمـوو چاپەکانا گەلـێ چوارخشـتەکی وا هەیە کە دوویان یەک ناگرنەوە. زیاتر ئەم جیاییەش لەو چوارخشـتەکییانەدان کـە زۆرتـر لە وشـەکانی کوردیـن!. ئەوانەی کـە هەموو وشـەکانی وەیا زۆرتریان بە شـێوەی زمانی فارسـین، ئەوانە بە هـی بابەتاهیر دانراون. بە پێچەوانەی ئەوە، ئەوانەیان کە زۆرتر لە وشـەکانی بە شـێوەی لوڕی کوردییە، ئەوانەیان بە شوێنی گومان داناون!..

هۆی ئەم جیابوونەوە و گومانپەیداکردنەش ئەوەیە: ئەو کەسانە کە ئەم سـروودانەی بابەتاهیریان لە چاپ داوە، لە باوەڕی ئەوانا ئەوانەی کە فارسـیی تەواون، ئەوانەیان کردووە بە هی ئەو، ئەوانەی کە تێکڵاون لە دوو شـێوەی فارسـی و کوردی، ئەوانەیان بە شـوێنی گومان داناوە!.. وەنەبێ ئەم ئیشـەش کە کردوویانە وەیا ئـەم جیاکردنەوەیە کە جیایان کردۆتـەوە، لـە ڕووی دراسـەیەکی زانیارییەوە بووبـێ، بەڵکوو خامەی چاپخانەیەکـی بازرگانیـی فارسـیی هەر ئەوەنـدەی لەدەسـت هاتووە کـە شـتی وا بکا!. لەگـەڵ ئەوەدا لەبەر ئـەو وردکردنەوەیە کە لە پێشـا باسـمان کرد، ئێمە تەنها ئەو چوارخشـتەکییانە بە هی بابەتاهیر ئەزانین کە ئەوان وتوویانە شـوێنی گومانە کە هی ئەو بن!.. ئەوانەی کە ئەوان بە تەواوی بە هی ئەوی دائەنێن، ئێمە ئەوانە بە جێی گومان دائەنین!. وەیا ئەتوانین بڵێین: ئەوانە هەر هی ئەو نین!. چونکە چەشـەی ڕسـتە و دراسـەی سـەردەم و بوونی بابەتاهیر بە لوڕی و دانانی سـروودی بە کوردی، ئەمانە هەموو دەریئەخەن کە دوو بەیتەکانیتر هی ئەو نین..

بابەتاهیر هۆنەرێکی دەروێشیَ ڕەندی بێپەروا بووە، ئەو ڕێچکەیە

کـە گرتوویەتـی، ڕێچکەیەکـی سـادەی بێ‌گـرێ بووە، ویسـتوویەتی دەوروبەرەکەی خۆی بە هەموو جۆر لە بیروباوەڕی خۆی تێ‌بگەیەنێ، نەیویسـتووە ڕێگایەکـی وا بگرێ ناوی خۆی بەوە بـەرز کاتەوە کە گۆیا هۆنراوەکانـی گـران و بە گـران ئەچنە دڵـەوە، تا بێنێ وشـەی قەڵەوی فارسـی بـەکار بێنێ!. تەنانەت زۆر کـەس دوو بەیتەکانـی بابەتاهیر بە «تەرانە» ناو ئەبەن. تەرانە بۆ سـروودێکە کە زۆر ئاسـان و بێ‌گرێ بێ. لەبەر ئەمە سـروودی بابەتاهیر بە گوزارشـتی ئێسـتە ئەبێ سروودێکی گەلیی بێ، سروودێکیش کە بۆ گەل بێ، ئەبێ وابێ: کە ئەو ناوچەیە بەبـێ گیروگرفتی تێی بـگا؛ ناوچەی بابەتاهیریـش ناوچەیەکی کوردی بووە، ئەبێ سروودەکانی بەو شێوەیە بێ، هەر شتێ لەو شێوەیە دەرچوو هی ئەو نابێ!!...

ئـەم دووبەرەکـی و ڕێ نەکەوتنە و ئەم هـی ئەو نەبوون بە هی ئەو کراوەش لەبەر دوو شتە:

یەکـەم، ئـەو گشـت بڵاوکـەرەوە و بنکانـە ـ ناشـر و مؤسسـە ـ کە سـروودەکانی بابەتاهیـریان لەچـاپ داوە، بڵاوکـەردوە و بنکەیەکـی فارسـی‌زمان بـوون؛ کە چاپیـان کردووە، لـە ڕووی بازرگانییـەوە بووە، نەوەک لە ڕووی دراسەیەکی زانیارییەوە. لە دوو بەیتێکا هەر وشەیەکی هـەر شـێوەیەکی کوردی تـووش بـوون و نەیانزانیـوە، خێرا وشـەیەکی فارسـییان خستۆتە شـوێنی و بەم جۆرە دیمەنی دووبەیتەکانیان تێک داوە!...

دووەم، لـە ڕاوێـژی هۆنـەرا گەلـێ جـاری وا ئەبـێ: یەکێک دێنێ چامەیـەک دائەنێ، وەیا چامەیـەک خاوەنەکەی دیار نییە، لەبەر ئەوە

کـە کابرا خـۆی هیچ ناوێکـی نییـە، وەیا خاوەنێک بـۆ چامەکە نییە، چامەکـە ئەکا بە هـی هۆنەرێکـی بەناوبانگ بۆ ئەوە مەردم باوەشـی بـۆ بگرنـەوە!. ئەو چامەیە ئیتر بە هی هۆنەرە بەناوبانگەکە ئەناسـرێ و لە ڕاستیشـدا هی ئەو نییە. بەڵام ئەوانەی ئاشـنای دراسـەی زانیاری و لێکۆڵینـەوەی ڕێچکەی ئەو کەسـە وەیا ئەو زمانـەن، جیای ئەکەنەوە و تێـی ئەگەن کە ئەو هۆنراوانە هی ئەو هۆنەرە نین و بە مەبەسـتێک خراونەتە ناو هۆنراوەکانی ئەوەوە!. زۆرتر لە دوو بەیتەکانی بابەتاهیریـش بەو جۆرەن و کراون بە ماڵی ئەوا!. لەگەڵ ئەوەشا وا نییە و هی ئەو نین.

«مُجتَبَـی مینوی» مامۆسـتای دانشـگا، لە کتێبخانەی ئەسـتەمووڵ هەنـدێ لە دوو بەیتەکانی بابەتاهیری بە دەسـتنووس دەسـت کەوتووە و تا کاتی دەسـتکەوتنی ئەو، دەسـتی هیـچ بڵاوکەرەوەیەکی بازرگانیی نەگەیشـتووەتێ. ئەم دوو بەیتانە بە تەواوی لەسەر شێوەی لوڕی کوردی ڕوەیشتوون. ئەم دوو بەیتانە ئەوە بۆ ئێمە دەرئەخەن: کە زمانی هۆنراوی بابەتاهیـر هەر بەو جۆرە بووە و ئەوانەی کە وەکوو ئەوە نین، هەموو بە ناوی ئەوەوە دانراون و هی ئەو نین!..[1]

❀❀

ئەمجـا چەنـد دانەیەک لـە دوو بەیتەکانی بابەتاهیـر، لەوانەی کە لـە چاپەکانا بە شـوێنی گومانیان داناون و جیایـی کەوتۆتە بەینیانەوە، تەنانەت بۆ چاپیشی:

---

١. ئاگاداری: «مُجتبی مینوی» دوکتۆر «ذبیح الله صفا»، لە بەرگی دووەمی «تاریخ ادبیات در ایران». لاپەڕە «٣٨٤»ەکەیدا.

(١)

**اگـر دل دلبـر و دلبـر کدومه**
**وگر دلبر دل و دل را چه نومه؟**
**دل و دلبـر و هـم آویتـه وینم**
**نذونم دل کـه و دلبر کدومه؟!**

(چاپی مؤسسه)

## گوزارە:

جارێ ئەم چوارخشـتەکییە لە یەکیەتی بوونەوە ـوەحدەتی وجوود ـ قسـە ئـەکا و ناوەرۆکەکـەی دەروێشـییە. ئەمجا ئەڵێ: بـە جۆرێ دڵی لەگەڵ دڵبەریا ـکە دۆسـتەـ تێکڵاو بووە، بووە بە یەک و نازانێ کامیان کامەیە!. ئەڵێ: ئەگەر دڵ دڵبەرە، دڵبەر کامەیە؟!. ئەگەر دڵبەر دڵەکەیە دڵ ناوی چییـە؟!. دڵ و دڵبـەر پێکەوە تێکڵاو ئەبینم، نازانم دڵ کامەیە و دڵبەر کامەیە؟!.

## وشەکان:

«دل، دلبر، کدومه، چه نومه، آویته، وینم، نذونم».

دڵ و دڵبـەر لـە وتنیـانا شـێوەی کوردی و فارسـی تیایا هاوبەشـن، ئەوەنـدە هەیـە لـە شـێوەی کوردیـدا «ل»کـەی قەڵـەوە. «چەنوومە» شێوەیەکی لوڕییە، فارسی ئەڵێ: «چه نامه، یا چه نام است، یا چه نام دارد». «ئاوێتە» شێوەیەکی کوردی ئەردەڵانە، فارسی ئەڵێ: «ئامیختە». «وینـم» ئەردەڵان ئەڵێ: «ئەوینم». وینم لە ئەوینمەوە هاتووە. فارسـی ئەڵـێ: «بینـم». «واو»ی گۆڕیوەتەوە بە «ب». «نذونـم» لە «نازانم»ەوە

هاتووە فارسـی ئەڵێ: «ندانم». «کدوومە» شێوەی لوڕییە، فارسی ئەڵێ: «کدام است».

(٢)

**خوشا آنان کە هر شامان تە وینن**
**سـخن واتە کرن، واتە نشـینن**
**گرم دسـترس نبی آیـم تە وینم**
**بشـم آنـون بوینم کە تـە وینن**

(چاپی شرکتی نسبی)

**گوزارە:**

خۆشی بۆ ئەو کەسانەیە کە هەر ئێوارەیەک تۆ ئەبینن، قسە لەگەڵ تـۆ ئەکەن و لەگەڵ تۆ دائەنیشـن. ئەگەر دەسـتم بەوە نـەگا کە بێم تۆ ببینم، ئەچم ئەوانە ئەبینم کە تۆ ئەبینن.

**وشەکان:**

«خوشـا، شامان، تە، وینن، واتە، نشـینن، گرَم، دسترس، نبی، آیم، وینم، بشم، بوینم، تە وینن».

«خوشـا» کوردی و فارسـی هەردوو لا ئەیڵێن. «شـام» شـێوەی لوڕ و کولیایـی ئەیڵێ. «تە» تۆ، شـێوەی بادینانە. «وینن» ئەوینن شـێوەی ئەردەڵانە. «واتە» وەتۆ، شێوەی لوڕی. «نشینن» لوڕی. «گەرەم» شێوەی لوڕی. «دەسترەس» شێوەی ئەردەڵان. «نەبێ» شێوەی موکری. «ئایەم» فارسـی و شـێوەی لوڕی. «وینـم» ئەردەڵان. «بشـەم» بچم، بـڕۆم، بە

شـێوەی یەکێ لە هۆزەکانی لوڕ. «بوینم» شـێوەی ئەردەڵان. «تە وینن» تۆ ئەوینن، ئەردەڵان ئەیڵێ.

(٣)

**دمـی بوره بوین حالـم ته دلبر**
**دلـم تنگه شـبی با مو بســر بر**
**ته گول بَر سَر زَنی ای نوگل مو**
**بجای گل زَنَم مو دست بر سر!**

(چاپی مؤسسه)

**گوزارە:**

دەمێک وەرە ببینە حاڵم تۆ ئەی دڵبەر، دڵم تەنگە شەوێ لەگەڵ من بەسـەر بەرە، تۆ گوڵ ئەدەی لە سـەرت ئەی تازە گوڵی من، لە شوێنی گوڵ من دەست ئەدەم بە سەرما!..

**وشەکان:**

«دمی، بوره، بوین، تنگه، مو، دست، سَر»

«دەمێ» شـێوەی موکری. «بووره» کورتکراوەی «بەوە ڕای ئەیره» بە شـێوەی لوڕی، واتە: وەرە بۆ ئێرە، فارسـی ئەڵێ: «بیا». «بوین» شێوەی ئەردەڵان. هەروەها ئەڵێ: «بوینە، ببینە»، ئەمەیان بە موکری. «تەنگە» کوردی و فارسـی هەردوو ئەیڵێن. «مۆ» من، هەندێ لە شـێوەی پێشکۆ. «دەست» وە «سەر» کوردی و فارسی هەردوو لا ئەیڵێن.

(٤)

**الهـی وا کیاشـم، وا کیـا شَـم**
**مو که بی دست و پایَم وا کیا شم**
**همـه از در برونـنـد وا تـو آیم**
**تو گر از دَر برونی وا کیا شَـم؟!**

(چاپی مؤسسه)

## گوزارە:

خوایە! بۆ کوێ بچم و لەگەل کێ بچم؟ من کە بێ دەسـت و پێم بۆ کـوێ بچم؟! هەموو لـە دەرەوەن بۆ لای تۆ دێم، تۆ ئەگەر لە دەرەوە بی بۆ کوێ بچم؟!.

## وشەکان:

«وا کیاشم = وا، کی، شَم، دَر، وا، تو، گر، آیم»

«واکـێ» وەکـێ بە شـێوەی لوڕی. «شـەم» هەندێ لە شـێوەی لوڕ. هەرچەنـدە ڕاسـتکردنەوەی ئەم ڕسـتەیە لە شـێوەی زمانی فارسیشـدا ئەبێ بەم جۆرە کە:

«وا ـ با. کی ـ. شەم ـ کورتکراوەی «شَوَم» بێ؛ واتە باْ کێ بم ـ لەگەڵ کـێ بم؟. بـەڵام نزیکیی لە شـێوەی کوردییەوە زیاترە تا فارسـی. «دەر» هـەردوو شـێوەکە ئەیڵێـن. «وا» وە، بە شـێوەی ئەردەڵان. «تـو» هەردوو زمانی کوردی و فارسی. «گەر» شێوەی لوڕی. «ئایەم» لوڕی و فارسی.

**

(٥)

نمیدانــم کــه رازم وا کــه واژم
غم ســوز و گــدازم را کــه واژم
چــه واژم؟! هــەر کــه
ذونــه بنگــره فــاش
دگــر راز و نیازم وا کــه واژم؟!

(چاپی مؤسسه)

**گوزاره:**

نازانـم ڕازی دڵـی خۆم بە کـێ بڵێم؟ خەمی سـۆز و تواندنەوەی دڵ لەبـەر گەرمای عیشـق بە کـێ بڵێم؟. چی بڵێـم، هەرکەسـە پێی بزانێ ئاشکرای ئەکا، کەواتە ئیتر ڕاز و نیازم بە کێ بڵێم؟!.

**وشەکان:**

«راز ـ واژم ـ هرکه ـ ذونه ـ بنگره».

«ڕاز» کوردی و فارسـی ئەیڵێن. «واژم» واچەم ـ بیڵێم. لە ئەیژم ـەوە هاتووە. «هرکه» هەرکەس شـێوەی ئەردەڵان. «ذونه» بزانێ، لە زانینەوە هاتووە، فارسـییەکەی: «دانـد». «بنگره» لە بکەرەوە هاتووە و شـێوەی لوڕییە.

(٦)

مسلســل زلف بر رو ریته دیری
گل و ســنبل بهــم آمیته دیری

**پریشان چون کری آن تار زلفان**

**بهــر تاری دلــی آویتــه دیری!**

(چاپی مؤسسه و شرکتی سهامی)

**گوزاره:**

بـەو زنجیره زوڵفەت لەسـەر ڕوومـەت بە ڕژاوەیی هەتـە، گوڵ و سـونبول پێکەوە بە تێکڵاوی هەتە. ئەگەر ئەو هەودای زوڵفەکانت بڵاو و پەرێشـان بکەیتەوە، لە هەر هەودایەکیـان دڵێکی تێکڵاوە و ئەمەت هەیە!..

**وشەکان:**

«زلف، ریته، دیری، آمیته، کری»

«زوڵـف» کوردی و فارسـی ئەیڵێن. «ڕیته» ڕژان بە شـێوەی لوڕی، فارسـی ئەڵێ: «ریختن». «دیری» هەتە بە شـێوەی لوڕی. «ئامێته» بە شێوەی موکری. «کری» بکەی. فارسی ئەڵێ: «کُنی».

(٧)

**ز دســت عشــق هر شــو حالــم این بی**

**ســرم بــر خشــت و بالینــم زمیــن بی**

**خوشــم این بی که مو ته دوســت دیرم**

**هر آن کت دوست دارد حالش این بی!**

(چاپی شرکتی سهامی)

**گوزارە:**

لە دەستی عەشقەوە هەموو شەو حالّم ئەمە بوو: سەرم لەسەر خشت و ڕایەخم وەیا سەرینم زەوی بوو. خۆشیم ئەمە بوو کە من، تۆ دۆستمیت؛ واتە دۆستێکی وەکوو تۆم هەیە. هەرکەسێ دۆستی هەیە حالّی ئەمەیە!

**وشەکان:**

«شو، بی، خشت، بالین، مو، تە، دیرم».

«شەو» بە هەموو شێوەکانی کوردی بێجگە لە بادینان، ئەو ئەلّێ: «شەڤ»، ئەویش هەندی شێوە. «بی» بە شێوەی لوڕی. «خشت» کوردی و فارسی ئەیلّێن. «بالین» شێوەی پشتکۆ بە سەرین ئەلّێ. «مو» من. «تە» تۆ، بادینان. «دیرم» هەمە، بە شێوەی لوڕی.

**

(٨)

**دلم میل گل و باغ تو دیره**
**همی در سینه‌ام جای تو دیره**
**بشم آلاله جاران لاله چینم**
**دیم آلاله هم داغ تو دیره!**

(چاپی شرکتی سهامی)

**گوزارە:**

دلّم ئارەزووی گوڵ و باخی تۆی هەیە، هەروەها وەیا هەمیشە لە

سینەما جێگای تۆی هەیـە، بچم بۆ جاڕی گوڵاڵە سـوورە گوڵاڵە بچنم، چاوم پێی کەوت و دیم گوڵاڵەش دیسان داخی تۆی هەیە!!..

**وشەکان:**

«دیرە، بشم، جار، چینم، دیم».

«دیرە» هەیەتی بە شـێوەی لوڕی. «بشەم» بچم، بە شێوەی یەکێ لە هۆزەکانی لوڕ و حەقەکانی گوێ سـیروان. «جار» شوێنێ کە نەکێڵرابێ و گوڵ و شـتەی لێ سـەوز بووبێ، بە شـێوەی ئەردەڵان «جاڕ» ئەڵێن. «دیم» بە شێوەی ئەردەڵان و موکری: چاوم پێی کەوت.

(٩)

**گرم رونـی ورم خونی تە زونی**
**ورم آخـر بسـوزونی تـە زونی**
**ورم بر سـر نهی الوند و میمند**
**نمـی وازم خدا زونـی تە زونی**

(چاپی مؤسسە)

**گوزارە:**

ئەگەر سەیرم کەی و ئەگەر بانگم کەی تۆ ئەیزانی، ئەگەر ئاخریشی بمسـووتێنی تۆ ئەیزانی. ئەگەر لەسـەر سـەرم دابنێی کێـوی ئەڵوەند و شوێنی مەیمەند، بەلامەوە گران نییە، خوا ئەیزانێ و تۆ ئەیزانی!!...

**وشەکان:**

«رونی، خونی، زونی، بسوزونی، نمی وازم».

«ڕوونـی» لە چاوگەی «ڕوانین»ـی کوردییەوە هاتووە و لە شـێوەی ئەردەڵانـە. «خوونی» لە خوێندنـەوە هاتووە؛ واتـە: ناوم بخوێنیتەوە و بیهێنێتـە ناوەوە. «زوونی» لە چاوگەی «زانین»ـەوە هاتووە کە شـێوەی ئـەردەڵان و موکرییـە. «بسـووزوونی» لـە «بمسـووزێنی» شـێوەی ئەردەڵانـەوە هاتووە. «نمی وازم». «واز» بـە مانا «بار»ە. «بار» لە زمانی پەهلەوی کۆندا بە گوزارەی ڕوولێنانی گرانە، واتە «تەکلیفی شاق». ئەم شێوەیە ئێستە نە بەو جۆرە؛ واتە بۆ «داهاتوو ـ مضارع»، وە نە بۆ بێجگە لەو جۆرە ناوترێ و بەکار ناهێنرێ.

**

(١٠)

**زنـم از بهر یاری گیـج و ویجی**
**شـوانم آوه از چشـمان بریجی**
**هر کـه راز دلش واجـه بمردم**
**یـا از دیوانگی بو یـا ز گیجی!**

(چاپی مؤسسە)

**گوزارە:**

لـێ ئـەدەم بۆ یارێـک گێژ و وێژی، شـەوانم ئاوە لە چـاوان بڕژێ.
هەرکەس نیاز و ڕازی دڵی بڵێ بە مەردم، یا لە دێوانەییە، یا لە گێژی!!.

**وشەکان:**

«یار، گیج، ویج، شو، آو، ریج، راز، واجە، مردم، دیوانگی، گیجی».

«یار» کوردی و فارسی هەردوو ئەیلێن. «گیج» شێوەی ئەردەلانی ئەڵێ: «گێج»، موکری ئەڵێ: «گێژ». «ویج» شێوەی ئەردەلانە، ئەوەندە هەیە ئەو ئەڵێ: «وێج»، موکری ئەڵێ: «وێژ». «شەو» شێوەی سۆرانی هەموو ئەیلێن. «آو» هەموو شێوەی سۆران ئەیلێ. «ڕیج» شێوەی حەقەکانی لوڕ ئەیلێن. شێوەکانی‌تری کوردی ئەڵێن: «بڕێژێ»، ئەو ئەڵێ: «بڕیجی». «ڕاز» کوردی و فارسی ئەیلێن. «واجە» شێوەی هەورامی ئەڵێ: «واچە». «مەردم» شێوەی ئەردەلان وەکوو فارس ئەیلێ. «دیوانەگی» شێوەی لوڕ و کولیایی ئەیلێن، فارسیش هەر ئەیلێ. شێوەی ئەردەلان و موکری ئەڵێن: «دێوانەیی». «گیجی» ئەردەلان ئەڵێ: «گێجی»، موکری ئەڵێ: «گێژی».

❀❀

(١١)

پنج روزی هنی خرم کهان بی
زمین خندان بَرمان آسمان بی
پنج روئی هَنی هاز یدو سامان
نه جینان نام و نه ژآنان نشان بی

(لە دەستنووسی «مجتبی مینوی» لە «تأریخ ادبیات در ایران» ی «دکتور ذبیح الله صفا» ل ٣٨٤)

**گوزارە:**

پێنج ڕۆژێک سەیر کە! جیهان خۆش و لە شادیدا بوو، زەوی لە پێکەنینا بوو و لە ڕوویشمانا ئاسمان بوو، وەیا زەوی لە پێکەنینا بە ڕوومانا ئاسمان بوو. پێنج ڕۆژێک بوو ئاگادارەوە بە نیشتمان و خۆشی، وەیا وڵات و ماڵ و ملک. نە لەمانەوە ناوێک وە نە لەوانەوە نیشانێک بوو!!...

**وشەکان:**

«پنج، هنی، کهان، بی، خندان، برمان، ئاسمان، روئی، ها، زید، سامان، جینان، ژآنان؛ نشان».

«پەنج» شێوەی ئەردەڵان و لوڕ ئەیڵێ، فارسیش هەر بەو جۆرە ئەیڵێ. «هەنی» لە کوردیی کۆن و شێوەی لوڕدا پێنج گوزارەی هەیە: «بوو، ئێستە، بڕوانە، ئیتر، کوتوپڕ». «کهان» ئەگونجێ کورتکراوەی «کیهان» بێ، کە ئەم کەیهانە لە کوردیی کۆندا بە مانا دنیا و عالەمە. «بی» شێوەی لوڕییە؛ واتە «بوو». «خندان» وەکوو فارسی ئەیڵێ شێوەی لوڕیش ئەیڵێ. «برمان» لە «بەروومان»ـە، کە شێوەی موکرییە. «ئاسمان» هەموو شێوەکانی کوردی ئەیڵێن. «ڕوئی» شێوەی هەورامی و حەقەکانی لای سیروان ئەیڵێن. «ها» لە کوردیدا بە چەند گوزارەیەک هاتووە: «ها» بگرە. «ها» ئەمەیە. «ها» هەیە. «ها» پیتێکە بۆ ئاگادارکردنەوە. «ها» وا نییە. «زێد» شێوەی هەندێ لە هەورامان و وڵاتی مایدەشت بە وڵات و نیشتمان ئەڵێن. «سامان» شێوەی ئەردەڵان بە دارایی دنیایی ئەڵێ.

لەپاش دەستکاریکردنی کوردی کۆن پیتی «ژ» گەلێ جار کراوە بە «ج» لە لایەن بێجگە لە ئارییەکانەوە وەکوو «لاژورد» بووە «لاجورد»، وە لەلایەن ئارییەکانیشەوە کراوە بە «ز» وەکوو «ڕۆژ» بووە بە «روز». جا لەسەر ئەم ڕەوشتە «جینان»، «ژینان» بووە و لەگەڵ «ژ آنان» بەر کوردیی کۆن ئەکەون. «نشان» شێوەی ئەردەڵان و لوڕە.

❀❀

(١٢)

**مـن آن پیرم که خوانندم قلندر**
**نه خانم بی، نه مانم بی، نه لنگر**
**رو همـه رو ورایـم گـرد گیتی**
**شو درایه و او سـنگی نهم سر!**

(لە چاپی «مجتبی مینوی» دوکتور «ذبیح»، بەڵام لە چاپی مؤسسە و سەهامیدا جۆرێکی‌ترە).

**گوزارە:**

مـن ئەو پیرەم کە بـە قەلەندەر ئەمخوێننەوە و ناوم ئەبەن، نە ماڵ و خانووم هەبوو، نە شـتومەکی ناوماڵم هەبـوو، نە لەنگەرێک؛ واتە نە شـتێک کە پاڵی پێوە بدەم و خۆمی پێ بحەسـێنمەوە!. ڕۆژ دەردێم بە دەوری گێتیـدا؛ واتە ئەگەڕێم بە دەوریا، شـەو هات لەسـەر بەردێک سەر دائەنێم؛ سەر ئەخەمە سەر بەردێک و ئەخەوم!..

**وشەکان:**

«پیر، قلندر، خان، بی، مان، لنگر، رو، همه، ورایم، گرد، گیتی، شو، سر».

«پیر» بە شێخی تەریقەت و پیاوی بە ساڵاچوودا ئەڵێن، لێرەدا گوزارەی یەکەم مەبەستە و هەموو شێوەکانی کورد ئەیلێن. «قەلەندەر» شێوەی ئەردەڵان ئەیڵێ و مەبەستی پیاوی دەروێش و گوێ بە هیچ نەدەرە. «خان» خانە، شێوی موکری ئەڵێ: «خانوو». «بی» بوو، بە شێوەی لوڕ. «مان» شێوەی لوڕ و کولیایی بۆ شتومەکی ناو ماڵ ئەیلێن، فارسیش هەر ئەیلێ. «لەنگەر» شێوەی ئەردەڵان و موکری هەردوو ئەیلێن. «ڕو» ڕۆ - ڕۆژ شێوەی هەورامی ئەیلێ. «همە» شێوەی موکری ئەڵێ: «هەموو»، فارسیش ئەڵێ: «همە». ئەوی لە هۆنراوەکەدایە بە گیراوی «میم»ـەکەیە. «ورایم» شێوەی لوڕی ئەیلێ. «گِرد» شێوەی لوڕ ئەیلێ، فارسیش ئەیلێ. ئەمانە کە ئەیژین بەم جۆرە بۆ گەڕانە بە دەوری شتێکا، وە بە ژێری «گ، کە ئەخوێنرێتەوە، خۆ ئەگەر بە «زەنە»ی «گ» بوترێ ئەوە لە شێوەی موکری و ئەردەڵاندا بە گوزارەی «خڕ»ە، ئەو وەختە گوزارەکە وای لێ دێتەوە: «ڕۆژ، هەموو ڕۆژ لەناو گێتییەکدام کە خڕە!».

گێتی لە کوردی کۆندا بەم جیهانە ئەڵێن، «شەو» شێوەی سۆران هەموو ئەیلێ. «سەر» شێوەکانی سۆران و زمانی فارس ئەیلێن.

❀❀

(١٣)

از آن اسـبيده بـازم همدانـی
بتنهائـی کـرم نچيروانـی
همه بمن وديرند چرغ و شاهين
بنـام مـن کرنـد نچيروانـی

(لـه چاپـی «تأريـخ ادبيـات ايـران» دوکتـۆر «ذبيـح» کـه لـه دەستنووسەکەی «مجتبی مينوی»ـی وەرگرتووە).

**گوزارە:**

لـەو سـپییەبازەم و هەمەدانیـم؛ واتە لـەو بازە سـپییەم و خەڵکی هەمەدانم، وەیا بازەکە هەمەدانییە، بە تەنهایی ئەکەم نێچیرەوانی، واتە بە تەنهایی ڕاو ئەکەم، هەموو بە منەوە هەیانە پاڵەوان و شاهێن؛ واتە لە منەوەیە و لە منەوە فێر بوون، بە ناوی منەوە ئەکەن نێچیرەوانی؛ واتە بە ناوی منـەوە نێچیرەوانی ئەکەن. وەیا لە نیوە هۆنراوەی یەکەما ئەگونجێ بڵێ: من ئەو بازە سپییە هەمەدانییەم. «از» لە شێوەی بادینانیدا بە مانا «من»ـە لە شێوەی سۆراندا. وەکوو چۆن لە شێوەی «تاڵش»یشدا هەر بە مانا «من»ـە. شێوەی تاڵشی یەکێکە لەو جۆگەلانە کە لە سەرچاوەی «ماد»ی بووەتەوە.

**وشەکان:**

«از، اسبید، باز، تنهائی، کرم، نچیروانی، من، وديرند، چرغ، شاهين، کرند».

«ئەز» لەسـەر گوزارەی دووەم بادینانییە. «ئەسـبید» شێوەی موکری

ئەڵێ: «سپی». «باز» کورد و فارس وەکوو یەک ئەیڵێن. «تەنهائی» شێوەی موکری ئەیڵێ، ئەردەڵان و لوڕ ئەڵێن: «تەنیایی». «کرەم» شێوەی لوڕە. «نچیروانی» شێوەی ئەردەڵان و لوڕ ئەیڵێن، موکری ئەڵێ: «نێچیرەوانی». «من» شێوەی لوڕ وەکوو فارس بە سەری «میم»ـەکە ئەیڵێ، ئەردەڵان و موکری بە زەنەی «میم»ـەکە. «وەدیرەند» شێوەی لوڕە. «چەرغ» کە «باڵەوان»ـە لوڕ و فارس ئەیڵێن، ئەردەڵان ئەڵێ: «چەرخ»، لە شێوەی لوڕیشدا هەر ئەوترێ. «شاهین» کورد و فارس ئەیڵێن. «کرەند» شێوەی لوڕە.

❀❀

لەپاش سەیرکردنی ئەم چوارخشتەکییانەی بابەتاهیر بەم جۆرە ـ ئەمانە نموونەیەک بوون لەوانەی ئەوـ، بۆمان دەرکەوت: کە زۆرێکی زۆر لەو وشانەی کە ئەو هۆنراوەکانی پێ دروست کردوون، کوردین؛ یا کوردی ئێستە یا کوردیی کۆن. بەو بۆنەوە وە لەبەر ئەو لێکۆڵینەوەیە کە کرا، گومانێک لەوەدا نەمایەوە: کە هۆنراوەکانی بابەتاهیر هۆنراوەیەکی کوردین و بەڵگەیەکی ئەدەب و زمانی کوردی نزیکەی هەزار ساڵێک پێش ئەم ڕۆژەن.

هەروەها ئەم لێکۆڵینەوەیە دەری ئەخا: کە زمان و ئەدەبی کوردی وەکوو لەم هۆنراوانەی بابەتاهیردا دەستکاری کراوە، لە گەڵێ بەڵگەی کۆنیتریشا دەستکاری هەر کراوە و لەوانەیە کەم شت بۆ ئێمە مابێتەوە هی ئەو سەردەمانە...

❀❀❀

## «لێکۆڵینەوە» وە «ڕەخنە»!

ڕەخنەی زمانیی ـ لوغەوی لە کوردیدا ئەڵێ: «ڕەخنەی تێ بووە» واتە: کونی تێ بووە. «ڕەخنەی لێ ئەگرێ» واتە: عەیبی لێ ئەگرێ. «ڕەخنەبازە» واتە: زۆر عەیب‌گیرە.

لێکۆڵینەوەی زمانیش هەر لە کوردیدا بە مانا چوونە بنج و بناوانی شتەوەیە. وەکوو ئەڵێ: «بۆ ئەوەندە لێی ئەکۆڵێتەوە؟» واتە: بۆچ ئەوەندە لەسەر شت ئەڕۆی. ئەو کەسەی کە لە شتەکە ئەکۆڵێتەوە مەبەستی ئەوەیە: کە لەو شتە تێ‌نەگەیشتووە و ئەیەوێ بگاتە شوێنێک کە لە بیروباوەڕی خۆیا ڕاستییەکەی بۆ دەرکەوێ و هیچ خەوشێکی تێدا نەمێنێتەوە.

ئەمجا «نەقد ـ نَقد». نەقد، لە زمانی عەرەبیدا بە گەلێ گوزارە هاتووە؛ نەقد بە مانا پارەیە، بە مانا تەماشاکردنی پارەیە بۆ جیاکردنەوەی چاکەکەی لە خراپەکەی، بە مانا سەیرکردنی قسەیە بۆ جیاکردنەوەی ڕاستی لە ناڕاستی و عەیبی دەربخرێ، وە گەلێ مەبەستی‌تریش. پاش ئەوە لە ڕەوشتی شوێنا ـاِصطِلاح‌ـ هێنراوە، کراوە بە ناو بۆ ئەو زانیارییە کە قسەی چاک و خراپی پێ لێک ئەکرێتەوە؛ واتە ڕاستی و ناڕاستی پێ جیا ئەکرێتەوە و ئەو شوێنانەی کە هەڵەیە بەهۆی زانیارییەوە دەرئەخرێ و عەیبەکەی ئەدۆزرێتەوە.

لە شێوەی زمانی کوردیدا «ڕەخنە» هاتووە بۆ عەیب لێ‌گرتن، بەڵام شوێن و جێگای خۆی هەیە؛ ئەڵێ: «ڕەخنەم لێ ئەگرێ، ڕەخنەی لێ

ئەگرم، دەستم کرد بە ڕەخنەگرتن لێی، ڕەخنە لە قسەم ئەگرێ»...هتد

ئەم شـوێنانە هیچیان ئەو چەمکە نادەن بە دەسـتەوە کە عەیب و ڕەخنەکە بۆ دەرکەوتنی ڕاستی و چۆنیەتی شتەکە بێ، بەڵکوو تەنها هەر بۆ تەشـەر لێدانە، نەوەک بۆ دەرکەوتنی ڕاسـتیی. بـەڵام «لێکۆڵینەوە» بـە تـەواوی چەمکەکەی بـۆ دەرکەوتنی ڕاسـتیی و کرۆکی شـتەکەیە. جا ئەو شـتە کردەوە بێ، وەکوو یەکێ ئەیەوێ لـە زەوییەکدا ئاو پەیدا بـکا و زەوییەکە هەڵئەکۆڵـی؛ یەکێکی‌تر پێی ئەڵـێ: «ئەمە خەریکی چیت؟ هیچ کەڵکێک لە ئیشـەکەتا نییە!» ئەویش ئەڵێ: «بەخوا لێی ئەکۆڵمەوە، یا ئەمەتە ئەگەمە شوێنێک یا ئەمەتە هیچ!».

وەیا قسـە بێ وەکوو ئەڵێ: «بۆچ ئەوەندە لەم قسەیە ئەکۆڵیتەوە؟!» کەوابوو لە هەردوو شوێنەکەدا «لێکۆڵینەوە» لە چەشەی زمانی کوردیدا لەگـەڵ چەمکەکـەدا ئەڕوا، کە مەبەسـت گەیشـتنە بە ڕاسـتییەک و دەرکەوتنی چۆنیەتییەکە.

جـا لەبـەر ئەمانـە بەرانبەر بە وشـەی «نەقـد»ی «اصطلاحی» لە عەرەبیدا وشـەی «لێکۆڵینەوە» لە کوردیدا بە تەواوی بەرانبەریی یەک ئەکەن و وشـەی «ڕەخنە» لەو چەمکە کە مەبەستە دوور کەوتۆتەوە و نابێ بۆی بوترێ.

✾✾

ئەمجا ئەمانەوێ بە جۆرێکی تێکڕایی قسەیەک لە «لێکۆڵینەوە»وە بکەین کە چۆن وە بۆچی وە لە کەیەوە داهاتووە؟. پاش ئەوە بچینە سەر لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی.

لێکۆڵینـەوە، سـەرەتا لـە یونانـە کۆنەکانـەوە داهاتـووە، ئەمەش لە ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆیـەمی پێش میلاد لە «هومیروس»ـەوە بەهۆی «ئەلیـازە» و «ئۆزیسـە»وە[1] ئەم لێکۆڵینەوەیە کەوتۆتـە ناوەوە. ئەوەندە هەیـە ئەم جـۆرە لێکۆڵینەوەیە کە لەو سـەردەمەدا پەیدا بـوو، ناتوانرێ بوترێ ئـەو لێکۆڵینەوەیەیە کـە لەمەودوا کەوتـە قاڵبێکی ڕێکوپێک و دەقێکـی زانیارییەوە!. بەڵکوو هەر بناغەیـەک بوو بۆی؛ واتە تەنها هەر ئەوەبـوو پێی ئەوترا لێکۆڵینەوەی سـەرەتایی و هۆنـراوی تێک نەئەدا. پاش ئـەو، وردەوردە ڕەوشـتی هۆنـراو بـەرز بـووەوە تا کەوتە سـەدەی چوارەمـی پێش میلاد و سـەردەمی «ئەرەسـتوو» لەو سـەدەیەدا. لەم کاتەدا لەوانەبوو ئیتر پێی ئەوترا: لێکۆڵینەوە!.

بـەم جۆرە مایەوە هەر لـە نیمچە زیادیدا بوو تا لە سـەدەی یانزەی پاش میـلاد لە «٤٧١»ی هیجری لـە «عَبدالقاهر»ی گورگانییەوە بەهۆی «أسـرار البلاغـة» و «دلائـل الإعجاز»ەکەیـەوە کەوتـە ناو عـەرەب و زانیارییـە عەرەبییەکانیشـەوە، بەڵام لەناو ئەمانیشـا ئـەم دیمەنەی کە ئێستە هەیەتی هەر نەیبوو!..

پاش ئەم سەردەمانەش کەوتە ناو ئەورووپاوە و لێرەدا سێ گێجی تری بەسـەرا هات: یەکەم، لە پاش سـەدەکانی ناوەڕاست تا دوایی سەدەی هەژدەهەم. دووەم، سـەدەی نۆزدەهەم. سـێیەم، ئەم سەدەی بیستەمە کە کارەساتی کۆمەڵایەتی بە تەواوی لێکۆڵینەوەی پێ گەیاند و پوختەی

١. «ئەلیازە» و «ئۆزیسـە» شەڕوشـۆڕێکی یونانییە. بە «٢٤» سـروودی هۆنراوە کارەسـاتی شـەڕی بەینی «ترواده» و «اغریق»ـەکان ئەگێڕێتەوە. ئەم داسـتانە لە دانراوی هومیروسە کە لە گەورەتر هۆنەرەکانی کۆنی یونانە.

کرد.

ئەمــە پلەی لێکۆڵینەوە بە تێکڕایی بەچــاو داهاتنیەوە و بەرانبەر بە نەتەوەکان؛ ئەمێنێتەوە ســەر لێکۆڵینــەوە بەرانبەر بە کورد و بە ئەدەبی کوردی.

لەناو کــورددا ئەتوانرێ بوترێ: لە ســەدەی پانزەهەمــەوە لێکۆڵینەوە داهاتــووە؛ لەو گێجەوە کە بەڵگەی ئەدەبی کــوردی بەپێی پلەکانی، بە ڕێکوپێکــی هاتۆتە خوارەوە. بەڵام ئــەم لێکۆڵینەوەیە کە داهاتووە وەکوو پێش سەردەمی ناوەڕاستی لێکۆڵینەوە لە یوناندا ـکە سەردەمی ئەرەستوو بوو-وەیا وەکوو پێش ســەردەمی «عبدالقاهِر» لە ناو عەرەبەکانا وەنەبێ بە شێوەیەکی پوخت بووبێ، بەڵکوو ئەتوانین بڵێین: بە جۆرێکی زانیاری ناوی لێکۆڵینــەوە نەبووە؛ واتە: لە ناو قاڵبێکی ڕێکا، بەڵام ئەوەندە هەیە بــە بەرهەما ـاِنتاج- لەمەودوا بۆمــان دەرئەکەوێ کە خودی لێکۆڵینەوە بە تەرحێکی لاڕێگە هەبووە.

بە وێنە: لەو سەدەی پانزەهەمەدا گەلێ هۆنەر هەبووە لەناو کورددا و هۆنــراویان داناوە، کەچــی کوتوپــڕ یەکێکیان ناوی بــەرز بووەتەوە و هۆنراوەکانی لە دڵی هەموو کەسێکا جێی خۆیانیان کردۆتەوە. لەوانەش یەکێکی وەکوو «مەلای جزیری» ئەم بەڵگەیەمان پیشــان ئەدا؛ ســەیر ئەکەیــن: هۆنراوەکانی ئەو، لەچاو هۆنــراوی هۆنەرەکانیترا ئاوازەیەکیان پەیدا کردووە و چوونەتە گۆشــەی هەموو دڵێکەوە!. ئەمەش لەبەر ئەوە بــوو: ئــەو توانیویە ئــەوی کە هۆنراو داوای ئەکا لە وشــە و لــە بیر و لە ئەندێشــە و لە ڕێخت، هەمووی تیایانا بەکار بێنێ و شتێک نەیەڵێتەوە بــۆ یەکێ کە ڕەخنــەی لێ بگرێ. وەیا بە واتەیەکیتر لەگەڵ چەشــەی

هەموو کەسێکا گونجاون و کاریگەرییەکیان هەبووە لە دڵی ئەوانەدا و بەو بۆنەوە وەریان گرتووە.

وەیا لە سەدەی هەژدەهەمدا یەکێکی وەکوو «نالی» ئەوە بوو لەگەڵ ئەوەش کە جۆری لێکۆڵینەوە قالبێکی ڕێکوپێکی نەگرتبوو، ئەو لە بازاڕی هۆنراودا گۆی هونەری دەرکرد و هەموو کەس باوەشی بۆ هۆنراوەکانی ئەگرتەوە. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ: کە بناغەی لێکۆڵینەوە بە جۆرێکی سەرەتایی و دوور لە بیرکردنەوەی زانیاری لە چەشەی کورددا هەبووە، جا با نەکەوتبێتە شێوازێکی زانیاریشەوە!..

ئەمجا کە دێینە سەر لێکۆڵینەوە؛ ئەو لێکۆڵینەوە زانیارییە کە مەبەستە، وەنەبێ هەر وا شتێکی سووک و ئاسان بێ!. بەڵکوو ئەو کەسە کە لە پارچەیەک ئەکۆڵێتەوە، ئەبێ لە پێشا لە پارچەکە چاک تێ بگا، پاشا گوزارەیەکی پوختی لێ بداتەوە، ئەمجا بتوانێ «شی» بکاتەوە و لێی ورد ببێتەوە. ئەگەر ئەو پارچەیە، ئەوانەی لە شت ئەکۆڵنەوە، قسەیان لێوە کردبوو، قسەکانیان بێنێ و پاش ئەوە بیروباوەڕی خۆی بەرانبەر بە قسەکانی ئەوان و بەرانبەر بە ناتەواوییەک ـ ئەگەر لە پارچەکەدا هەبوو ـ دەرببڕێ!!...

# وردبوونەوەی لێکۆڵینەوە لە ئەدەبی کوردی

نیازمان بە ئەدەب، هۆنراو و پەخشانە؛ پێش هەموو شتێک پێویستە ئەوەمان بۆ دەرکەوێ کە ئەدەبەکە هەیە؟. ئەمجا بتوانین لێی بکۆڵینەوە و لێی ورد ببینەوە!. چونکە ئەگەر ئەدەبەکە نەبێ لێکۆڵینەوەکە نابێت. هەروەها مەبەستی ئێمەش لێرەدا ئەدەبی کوردییە، چونکە ئەدەبی نەتەوەکانی تر هەریەکە بە ئەندازەی خۆیان خاوەنەکانیان قسەیان لێیانەوە کردووە، وە لەسەر ئەو بڕوایە: کە ئەدەب شان بەشانی ئادەمیزاد هاتۆتە خوارەوە، وە نەتەوەی کوردیش لەناو ئەو چەنبەرەدایە، ئەمیش وەکوو نەتەوەکانی تر لە بەرەبەیانی مێژوویەوە ئەدەبی هەبووە، وە وەکوو تێکڕای ئەدەبی نەتەوەکانی تر پەردەی تاریکیی هاتووە بەسەریا!. نەتەوەکانی تر بەتایبەتی یونان و ڕۆمان، لە سەدەکانی نۆیەمی پێش میلاد بەم لاوە، وردەوردە دەستیان کرد بە دۆزینەوە و لێکۆڵینەوەی ئەدەب، پاش ئەو مێژووە، قسە لەم زانیارییەوە بەناو نەتەوەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوادا بڵاو بووەوە.

بەرەبەرە هەر بەرەیەک «دەق ـ نَصّ»ی ئەدەبی خۆی بۆ نەتەوەکەی خۆی بەجێ هێشت؛ ئەمجا ئەو نەتەوەیە کەوتە لێکۆڵینەوەی ئەو پارچانەی کە پێشینەکانی بۆی بەجێ هێشتبوون.

نەتەوەی کورد، ڕاستە لە ڕۆژەکانی پێشینیا پەردەی ئەدەبەکەی تاریکە، بەڵام وەکوو لە پێشەوە بۆمان دەرکەوت، لە سەرەتای نزیکەی «١٢٠٠»ساڵی پێش ئەم ڕۆژە، پارچەی ئەدەبیی بەجێ هێشتووە. لەپاش

ئـەو مێژووە، ئەبێ پلە بە پلـە بێتە خوارەوە تا ئەگاتە ئەم سـەردەمەی ئێمە. لەگەڵ ئەوەدا، وەکوو سـەیر ئەکەین: لە هەندێ سەردەمیا ڕیزی پلەکان تێک چوون و بەڵکوو ون بوون.

ئەمەش لەبەر ئەوەیە: ئەو ڕۆژانە کە بەسـەر کورددا هاتوون، گەلێ شت کاری تێ‌کردوون بۆ تێکچوونی ڕێکوپێکیی ئەو پلانە...

زاڵبوونی ئەدەب و زمانی عەرەبی بەهۆی ئایینەوە بەسەر ڕۆژهەڵاتدا، یەکێکە لـەو هۆیانە کە پلەکانی تێک داوە. نەبوونی سـەربەخۆییەکی سیاسـی بۆ کـورد، بۆ پاراسـتنی ئەدەبەکـەی، یەکێکی‌ترە لـەو هۆیانە. لەگەڵ بوونی ئەم دوو کۆسپە زلەشدا، وەنەبێ ئەدەبی کوردی لە هەموو ڕیزی ئەم سـەردەمانەدا بە تەواوی ون بووبێ! ون نەبووە، بەڵکوو هەر ئەوەندەیە پلەکانی تێک چووە؛ چونکە ئەبینین کە لە سەدەی پانزدەهەم بـەملاوە، گەلێ بەڵگەمان لە بەردەسـتدایە بـۆ ڕوونکردنەوەی ئەدەبی کـوردی. ئەوەندە هەیە: ئەو ئەدەبەی کە لەو ڕۆژەوە بە دەسـتمانەوەیە، ئەبێ بزانین چ جۆرە ئەدەبێکە و چ جۆرە گێجێکی بینیوە؟.. کلاسـیک تا چ ڕادەیـەک کاری تێ‌کردووە؟ هۆی ئەو کارتێکردنە چی بووە؟. هەموو ئەم سـەردەمانە، ئەدەبی کوردی هەر یەک پـەردەی هەبووە؟ یا بەپێی ئەم چەرخانە گۆڕانی بەسەرا هاتووە؟ پەیدابوونی چاپ، توانی کار بکاتە سەر گۆڕانی ئەدەبی کوردی، یان نەء؟..

هەروەها لـە خوێندن و لێکۆڵینەوەی ئەدەبـی کوردیدا، ئەبێ ئەوە بزانین: کە پەردەکانی وەکوو: «کلاسیک[1]،

---

١. «کلاسـیک»: ڕەوشـتی پێشـینان. جۆری نووسـینی نووسـەرانی پێشـوو یا تازە، کە ببێ بە سەرمەشق بۆ دەستەیەکی‌تر.

ڕومانتیـک[١]، دراماتیـک[٢]، سـەریالی[٣]» لـە سـەردەمەکانی هۆنراوی کوردیدا، ئەمانە بەسەر ئەو سەردەمانەدا هاتوون یان نەء؟

دیارە، ئەمانـە بـە هەمـوو چەشـنەکانیانەوە، وردبوونـەوە و لێکۆڵینەوەیەکی دوورودرێژیان ئەوێ؛ چونکە تۆ، کە شتێک ئەگری بە دەستەوە و لێی ئەکۆڵیتەوە، ئەبێ لە بارەی «شێوە، ئوسلووب، دارشتن و ڕێخت ـ سەبک، مەبەست و نیاز ـ غایة، زنجیرەی بیر ـ تەسەلسولی فیکـری» بەپێی چەرخ، ئەم وردبوونەوەیە تیـایا بەجێ بێنی. کە ئەمانە هەمـوو کـران، ئەو وەختە بـۆت دەرئەکەوێ: ئەو پارچــە هۆنراوە کە تۆ ئەمانەت تیایا بەراورد کرد، بە تەواویی سەردەمی هۆنەرەکە و خۆیـەتی ـ نەفسیەتی خۆی و چۆنیەتی ڕۆزگارەکەی، هەموو بەوەدا دەرئەکەوێ.

دیسـان: کاتـێ کـە ئەمانـە کـران، لـەپاش شـارەزابوون لـە چەند پارچەیـەک لە هۆنـراوی ئەو هۆنـەرە، خێرا ئیتر ئەتوانـی ئەگەر پارچە هۆنـراوی یەکێکی‌تر کرابوو بە هی ئـەو، وەیا ئەگەر هەڵەیەک لە پارچە هۆنراوێکیـا هەبـوو، بۆت دەرئەکەوێ: کە ئەو پارچەیـە هی ئەو نییە و ئەو هەڵەیە ڕاست ئەکرێتەوە.

ئینجا ئێستە ئێمە دێنین لە بەردەمی ڕووناکیی ئەم شتانە ـکە باسمان

---

١. «ڕومان ـ ڕومانتیک»: داستان، ئەفسانە، داستانی ئەفسانەیی.

٢. «درام ـ دراماتیـک»: بەشـێکە لـە ئـەدەب، کـە کارەسـات لـە بەرچـاوی سـەیرکەر وەیـا گوێگر بە جۆرێکی بەدیمەن و بە نموو پیشـان ئەدا. هەروەها نمایش و داسـتانێکە کە بە سەرگوزەشتەوە نزیک بێت.

٣. «سەریال»: زنجیرە، یەک‌لەشوێن‌یەک، بەش‌بەش، داستانێ کە بەش‌بەش بڵاو بکرێتەوە، باسی چەشنی کۆمەڵایەتی هەر تازە.

کرد- بەپێی پلە، ئەو پلەیە کە لە بەردەستمانایە، باسی پارچە ئەدەبی کوردی ئەکەین؛ باسی ئەو سەردەمانەی ئەکەین کە پارچەکە لەو کات و چاخەدا ئەو شتەی هەڵگرتووە کە خاوەنەکەی مەبەستی بووە، ئیتر ناهێنین ئەوە بێژین: ئەو پارچەیە لەم وەختەدا چ بیروباوەڕێک هەڵئەگرێ؛ ئەوە لە سەردەمی دانانی پارچەکەدا چەشنی بیروباوەڕ و گوزارەی ئێستەی بووە؛ واتە: هۆنەرەکە ئەم گوزارەیەی مەبەست بووە!. بۆیە ئەمە نایژین، چونکە ئەگەر ئەمەی مەبەست بووبێ «پلە - تَدَرُّج» لە ئەدەبا نابێ!!...

هۆنراوێک کە سەردەمێ لەمەوپێش هۆنەرێک بە نیازێ دایناب‌ێ و ئێستە تۆ بەپێی بیروباوەڕی ئێستە گوزارەی لێ بدەیتەوە، وەیا باوەڕی ئەم سەردەمەی بەسەرا بسەپێنی!، ئەمە زۆر زۆر دوور ئەکەوێتەوە لە ڕاستی و لە لەبۆدانراوەکە -واقع-، بەڵکوو وشکی و وەستانێک ئەخاتە بازاڕی ئەدەبەوە و لە گۆڕان دووری ئەخاتەوە!.. چونکە ئەگەر ئەو هۆنراوەیە، ئەو پارچەیەی ئەو سەردەمە ببڕێ بەسەر گوزارە و چەمکی ئێستادا، ئیتر لە کوێ گێج و سەردەم لە ئەدەبدا پەیدا ئەبی؟!...

دیسان وەکوو چەمک سەردەم دروستی ئەکا، وشەش پێویستی ئەو سەردەمە دروستی ئەکا. گەلێ وشەی وا هەیە کە پێویستی سەردەم وەیا شوێنێک دروستی کردووە، ئەو پێویستییە لە سەردەم و شوێنێکی‌ترا نامێنێ. وەیا گەلێ چەمک بۆ هەندێ وشە لە شوێن و کاتێکا پەیدا ئەبێ، کەچی ئەو چەمکە لە شوێن و کاتەکەی‌ترا نەبووە بۆ ئەو وشەیە!.

تۆ ئەگەر بێنی چەشنی چەمکی دوایی بسەپێنی بەسەریا، ئەوە

ناتوانــی گوزارە لە ئــەدەب بدەیتەوە؛ بــەو گوزارەیە کــە بێژیــت گۆڕانی بەسەرا هاتووە!!...

بەڵێ! ئەوترێ: ئەم هۆنراوە، ئەم پارچەیە، ئەم گوزارەیەش هەڵئەگرێ؛ وە ئەمەش ڕاســتە کە هەڵیئەگرێ، چونکە ئەو گوزارەیە کە ئەو کەســە بۆی دروســت ئــەکا، بەپێی بیــروباوەڕی خۆی بۆی دروســت کردووە و لێــی داوەتەوە، نەوەک بیروباوەڕی هۆنــەر، وەیا خاوەن پارچەکە، بەڵام ناتوانێ بڵێ: ئەبوایە هۆنەرەکە ئەمەی مەبەست بوایە، چونکە ئەگەر وا بڵێ، پلەکە نامێنێ!!...

هەروەها ئەبێ ئەوەش بزانین: لە کاتێکا کە ئەڵێین ڕاســتی ـواقِع ـ، ئــەم ڕاســتییەش دوو جــۆرە: ڕاســتییەک هەیە ئــەو بیرەیە کــە هۆنەر وەیا خاوەنــی پارچەکــە بە دڵیــا دێت و ئەیخاتــە قاڵبی وشــەکانەوە، وە لــە بیــروباوەڕی خۆیا ئــەو گوزارەیــە ـکە دانــەوەی تاپۆکــەی دەرەوەیە («اِنعِکاس»ــی «شَبَحی» خارجییەکە)ـ پڕ بە پڕی وشەکانە. ئەم جۆرە شتە بەچاو ئەوەوە ڕاستییە ـواقِعةـ.

ڕاســتییەکیتریش هەیە ئەوەیە: کە ئەو بیری هۆنەرە ئایا بە تەواوی و لە ڕاستیدا لەگەڵ تاپۆکەی دەرەوەدا یەک ئەگرێتەوە یان نەء؟ ئەگەر یەکــی گرتەوە، ئەوەیە کە پێی ئەڵێــن: تاپۆ زەینییەکەی لەگەڵ تاپۆکەی دەرەوەدا ڕێ کەوتووە و یەکیان گرتۆتەوە!..

جا مەبەســت بە پلە و بــەوە کە ئەڵێین: ئەو پارچــە کە ئەو هۆنەرە وەختی خۆی وتوویەتی، نابێ گوزارەی ئێســتای بەســەرا سەرەونخوون بکــرێ، لەبەر ئەوەیە: کە ئەو لە وەختی خۆیا ئەم گوزارەی ئێســتایەی مەبەست نەبووە، بەڵکوو گوزارەیەکی مەبەست بووە کە بە نیازی خۆی

بەرانبەری وشەکان بووە و وشە و گوزارە پڕبەپڕی یەک دەرهاتوون؛ ئێستە کە تۆ گوزارەیەکی‌تری لێ ئەدەیتەوە، بەچاو ئەوەوە کە ئەدەب و بیری ئەدەبی هەموو شت هەڵئەگرێ ڕاستە، بەڵام بە چاو گوزارەی خاوەنەکەیەوە ڕاست نییە؛ چونکە ئاشکرایە کە ئەو، ئەو گوزارەیە مەبەست نەبووە؛ ئاشکراییەکەش لەبەر ئەوەیە: کە دوو سەردەم وەیا دوو بیر لە یەک کات و سەردەما دوو شت بۆ یەک وشە ئەدۆزنەوە و دایئەنێن.

ئەوەندە هەیە، ئەو دەنگەش بڵاوە کە ئەوترێ: شتی وا هەیە دوو کەس گوزارەی لێ ئەدەنەوە و گوزارەکانیشیان وەکوو یەک وانە و بەمە ئەڵێن: «جووتیی زەین». کە ئەمە هەبوو، ئیتر چۆن ئەو قسەیە ئەوترێ کە دوو کەس دوو شت بۆ یەک وشە ئەدۆزنەوە و دایئەنێن؟!..

بەڵێ! ئەو دەنگە هەیە کە: جووتیی زەین لە میانەی دوو کەسدا هەیە، بەڵام ئەمە کە لێ‌بکۆڵینەوە ئەو جووتییە کە بە هەموو جۆر پەردەی دەرەوە ـ انعكاس خارجی ـ بدا بە دەستەوە و هیچ جیایی نەبێ لە بەینیانا، ئەمە نییە!. چونکە بیری پەردەی دەرەوە بۆ هەریەک لەمانە، بیرای‌بیرای ڕێ ناکەوێ کە یەک بگرن و بە تەواوی وەکوو یەک وابن. ئەمەش لەبەر ئەوەیە: کە هەریەک لەمانە بۆ ئەنگاوتنی نیشانەکە تیرێکی بەدەستەوەیە، ئاشکرایە کە جیایە لە تیری ئەوی‌کەیان!. بەڵکوو تەنها ئەوەیە ئەگونجێ نزیکی یەک بن، نزیکیی لە یەک جووتیی تەواو ناگەیەنێ.

هەروەها ئەو مەبەست‌نەبوونەی خاوەن پارچەکەیە بۆ ئەم گوزارەی ئێستەی تۆ لە پارچەکە، کە ئەبێتە هۆی گۆڕان لە ئەدەبدا!. ئەو پەردەی

دەرەوە کە لە سەردەمی ئەو هۆنەرەدا هەبووە و ئەو کردوویە بە گوزارەی وشـەکانی، ئەو پەردەیە ئێسـتە گۆڕاوە بە شتێکی‌تر و شتێکی‌تر شوێنی گرتۆتـەوە. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە هۆنەر وەیا گوزارە لێدەرەوەی پاش ئەو، بیـکا بە گوزارەی وشـەی خـۆی، وەیا گوزارەی وشـەی خاوەن‌پارچەی پێشوو.

ئـەم ڕەوشـتە وەکوو لـە هۆنەرێکـی پێش هۆنـەری دواییدا سـەیر ئەکرێ، بۆ دوو هۆنەری هاوچەرخیش بەرانبەر بەیەک شت هەر سەیر ئەکـرێ. پـەردەی وەرگرتنی یەکێکیان بۆ یەک دیمەن وەیا یەک شـت، جیایـە لە پـەردەی ئەوی‌تریان بۆ خودی دیمەن و شـت!. وە تەنانەت لـەم ڕووەوە بـۆ یەک کـەس بەرانبەر بـە یەک دیمەن کە بـە دوو جار هەسـتی خۆی بەرانبەر بـەو دیمەنە دەرببڕێ، دیسـان با دیمەن یەک بێ، بەڵام هەستەکان جیان...

❀❀

پاش ڕوونکردنەوەی ئەو شتانە کە باسمان کردن، وەکوو سەیر ئەکەین: ئەو ئەدەبەی کە لەپاش سەدەی پانزەهەم بەڵگەکانی ماونەتەوە بۆ ئێمە، وەکوو خودی ئەدەبەکە بۆمان ڕوون ئەکاتەوە، دیمەنی سروشتی و گێتی خواناسـی و دەروێشـی ـ اِلهِیّات و تَصَوُّف ـ وەسپمان لە سەرەتا پیشان ئـەدەن، هەر لەو سـەردەمانەدا جۆری کلاسـیک بە تـەواوی تێکڵاوی بووە؛ هۆی ئەمەش ئەوە بوو: هۆنەرانی کورد ئەوی لەبەر دەسـتیانا و لە بەرچاویانەوە هەبووە، زیاتر دوو شـت بووە: یەکێ دیمەنی سروشـتیی وڵات، یەکـێ ئەدەبـی بێگانە ـ کە ئـەو ئەدەبە لەو گێجانەدا ـ دیسـان

گیانی کلاسیک تیایا چەسپابوو، بێجگە لە باسی کۆشک ـ هەر جۆرە کۆشکێک بووبێت ـ شتێکی‌تر نەبوو تا ئەمان ببینن. ئەمان ئەوەندە خۆیان بە باسی کۆشکەوە خەریک نەئەکرد، چونکە کۆشکیان نەبوو!.. خواناسی و دەروێشیش تایبەتی نەبوو بە نەتەوەی خاوەن‌کۆشک وەیا بێ‌کۆشکەوە، ئەوەیان ئەبینی و ئەمانیش ـ واتە هۆنەرانی کورد ـ لەسەر ئەو ڕێچکەیە و لەبەر ئەو ڕووناکییە ئەڕۆیشتن، هۆنراو و ئەدەبەکەی ئەمانیش ئەکەوتە باری خواناسی و دەروێشییەوە!...

وەکوو ئەمە هەیە، ئەبێ ئەوەش بزانرێ: کە ئەم خواناسی و دەروێشییە لە بێجگە لە خۆیانەوە وەریان بگرتایە، وەیا هەر لە خۆیانەوە بووبێ، وە وایان زانیبێ کە دەسەڵاتی هیچ شتێکی‌تریان نییە، ئەو گیانی کلاسیکەی تێدا پەیدا ئەکرد!. چونکە لە هەموویا دوور ئەکەوتنەوە لە چۆنیەتییەکی چۆنیەتی و ئەکەوتنە بیربازیی لە گێتییەکی پشت ئەم گێتییەوە، وەیا بڵێین: بە تەواوی ئەکەوتنە ناو گێتییەکی ڕەمزییەوە!...

دیمەنی سروشتیی وڵاتیش وەکوو بەرچاوی یەکێکیان ئەکەوت، هەر بەو جۆرە بەرچاوی هەموویان ئەکەوت، وە هەموویان بە باڵایا ئەیانوت!. لە وەسپی جوانیشدا چەشنی سەمەرە ڕووی ئەدا..

بەڵێ! لەسەر ئەو باوەڕە: کە کلاسیک ڕەوشتی پێشینان و جۆری نووسینی پێشوو یا تازە، کە ببێ بە سەرمەشق بۆ هی‌تر، ئەو سەردەمانە کە ئێمە لێیانەوە ئەدوێین ئەو گیانە لە پارچەکانیانا هەبوو، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە لە باری بیر و ئەندێشەوە نزمییان بەسەرا هاتووە و لەم ڕووەشەوە هەر چاویان لە یەک کردووە، وەیا لە شێوەی داڕشتن و مەبەست و زنجیرەی بیرەوە وەکوو یەک وا بوون، وەیا بە تایبەتی پارچە

ئەدەب و هۆنراوی هۆنەرێک خاڵی بووە لەم شێوە و ڕێخت و زنجیرەی بیــرە! بەڵکوو بە پێچەوانەی ئەمە، لەو پارچە ئەدەبەدا ئەمانەی هەموو تێدا هەبووە. لــەم ڕووەوە ئەدەبەکەی ئەم ـ ئەدەبە کوردییەکە ـ وەنەبێ چەپی لە ئەدەبە بێگانەکە گەڕابێتەوە، بەڵکوو گەلێ جار بەرزیی لەما زۆرتر ئەبینرێ.

**

وەکــوو شــەو و ڕۆژ ئەگــۆڕرێ، ئەدەبیش بەو جۆرە گۆڕانی بەســەرا دێت، چونکە ئەدەب بەســتراوە بــە ڕۆزگارەکەوە، واتــە: لە بەروبوومی ڕۆژگارەکەیــە، کە ئەو گۆڕا ئەبێ، ئەمیش بگــۆڕرێ. کە ئەڵێین ڕۆزگار، مەبەســت ئەو کارەســاتانەیە کە لە ڕۆژەکەدایە، چونکە ئەو ســەردەمە درێژانە کە کلاسیکی دروست ئەکرد، لە ئەدەبا وا دیار بوو هۆی گێجەکە لەو ماوانــەدا هەر وەکوو خۆی مابووەوە، بۆیە کلاسـیک و پەیڕەویش هــەر بەو جــۆرە مابــووەوە!.. کە ســەردەمەکە بەســەرچوو، ســەردەمی کلاسیکیش لەگەڵ ئەو پێچرایەوە!...

بــەم بەڵگەیــەدا ئەزانین: کە ئەدەبــی کوردی شانبەشــانی گۆڕانی سەردەمەکە، ئەمیش گۆڕاوە؛ لە کلاسیکەوە بۆ ڕومانتیک، بۆ دراماتیک، بۆ سەریالی!. جا ئێمە بەڵگە ئەدەبییەکەمان بەدەستەوە هەبێ یا نەبێ، ئــەم بەڵگە مەنتقییە تێمــان ئەگەیەنێ: کە گۆڕان لــە ئەدەبی کوردیدا هەبووە، ئیتر بێجگە لەوە کە بەڵگەشــمان بەدەســتەوە هەیە و بەڵگەکە بە تەواوی کارەساتەکەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە..

بەوێنە، لەبەر گۆڕانی کارەســاتی ســەردەم و لەبەر هاتنە پێشەوەی هەنــدێ کاروباری وا کــە بە تەواوی جیــا بوو لە کاروباری پێشــوو. ئەم

جیاییە کردیە کارێ کە بە ئاشکرا وەسپی ئەدەبی کوردیش بگۆڕرێ و لە چەمکی پێشووەوە بکەوێتە چەمکێکی‌تر. وەکوو ئەم هۆنراوانەی «مەلا حەمدوون»[1] ئەمەمان بۆ ڕوون ئەکەنەوە لە کاتێکا کە ئەڵێ و ئەڵێین:

**ئـــەم ڕۆژە چ ڕۆژێکـــە کـــە عالـــەم شـــڵەژاوە؟**
**هەرکـــەس بـــە جەخـــارێ جگـــەری قیمە کـــراوە!**
**دنیـــا پـــڕی ئاشـــووبە خەلایـــق بـــە عوموومـــی**
**ئاسایشـــی لـــێ مەنعـــە ئەڵێـــی هێرشـــی ئـــاوە!**
**کامەی کـــە ئەڵێی خۆشـــییەتی دوورە لە میحنەت**
**ڕیشـــەی دڵـــی ئـــاڵاوە بـــە ســـەد دەرد و بـــەڵاوە!**
**گیرۆدەیـــە ئـــەم عالەمـــە هەرکـــەس بـــە ســـیاقێ**
**کەوتوونەتـــە زنجیرەیـــی ئەنواعـــی بـــەڵاوە!**
**وەک تەرزە ئەبارێ بە هەموو دەم ئەســـەف و غەم**
**هـــەوری غـــەزەب و قەهری خـــوا تونـــد و بەتاوە!**
**نیک و بـــەدی ئـــەم زومرەیی ئیســـلامە بە جارێ**
**کەوتوونـــە کەشـــاکەش بـــە قوماندەی ئومـــەڕاوە**
**ئـــەم زاڵمی ســـەففاکی «ســـەفەر بەرلگـــە» ئەمڕۆ**
**فەرمانـــی بـــە خوێنڕشـــتنی ئـــەم عالەمـــە داوە**

---

١. مەلا حەمدوون: پیاوێکی بێ چاو و خەڵکی سولەیمانی بووە، لە «١٨٦١» هاتۆتە دنیاوە و لە «١٩١٨» مردووە. ئەم هۆنراوانەی باسی جەنگی گەورەی پێشوو ئەکا؛ جەنگی ١٩١٤ ـ ١٩١٨.

ژاندرمــە ئەســوورێتەوە وەک واشــەیی برســی
بــۆ لاشــەیی میللــەت بــە فڕوفێڵــی غــەزاوە!
فەوتــاوە لەبــەر ســوغرە کــەر و ئێســتر و یابــوو
حوشتر ســەقەت و شەل بووە، گا پشــتی شکاوە!
کــەر شــەوقی زەڕینــی نییــە حەتتــا لــە بەهارا
ترســی هەیــە نــەک بیخەنە ژێــر باری قــەزاوە!
هەر شــەش جیهەتی گرتووە ئاشووب و موسیبەت
مێشــوولە مەجالــی نییــە دەرچــێ لە حــەواوە!
تەییــارە بــە ئەســبابی شــەڕ و فیتنــەوە دایــم
جەولانــی ئەڵێی هەورە بەســەر مەرکەبــی باوە!
باڵۆنــی هەڵــۆ شــێوە، لەگــەڵ دێتە تەحــەڕڕوک
عالــەم لــە نەزەریا بــە مەســەل پۆڕی خــوراوە!
ئــەم جووتــە بــەڵا زادەیــی باڵندەیــە ئەمــڕۆ
ســەییارەیی فەوقــن بــە ئەلکتریکــی چــراوە
عالــەم لــە شــریخە و شــەرەری بمبمــی بۆمبــا
حەیــران و سەراســیمە و عەقڵــی خەرەفــاوە
بەرقــی غەزەبــی دانــە و نارنجــەک و تۆربیــد
ئاگــر ئەپژێنــێ لــە زەمیــن و لــە ســەماوە!

شـــەو، ڕۆژە لەبـــەر بەرقـــی قلیـــج و ڕم و ســـوننی
لەمعەی قەسەتۆرەش بە مەســـەل بەرقی هەتاوە!
دەشـــت و جەبـــەل و بەحر و جزیـــرە و هەموو دنیا
شەق‌شـــەق بووە مەجمۆعی بـــەدەم تۆپی قەزاوە!
وشک و تەڕی ئەم سەتحی کورەی ئەرزە بە جارێ
گوڵگـــوون بـــووە، ڕەنگینە بە خوێنی شـــوهەداوە!
تـــا حوکمـــی تەماشـــایی تەســـەوور لـــە هەمـــو لا
هەر لاشـــەیی جنراو و ســـەر و دەســـتی شـــکاوە!
ڕووسی غەم و ئنگلیزی خەفەت هەردوو بە جارێ
هاتوونەتـــە ســـەر موئمینی عوشـــرەت بە ســـوپاوە
هەر لەحزەیی سەدلەک، چ لە موئمین، چ لە موشریک
واســـڵ بـــە دوو جیمن، بـــە عەتـــا و بـــە خەتاوە!
وا پـــۆڕی ســـەفینە و بەلەم و کەشـــتی و ئوســـتۆل
ئامادەیـــی حەربـــن، لـــە هەمـــوو لا تەنـــراوە
گیـــراوە بـــە هێـــزی چـــەک و تەییـــارە و ســـارۆخ
مەعمـــوورە و وێرانـــە هەچـــی نـــاوی بـــراوە
لـــەو ڕۆژەوە دنیـــا هەیـــە تا ئـــەم دەمە بێ شـــک
مەغلووبەیـــی بـــەم غایەتـــە نەبـــووە و نەکـــراوە!

**بــۆ گرتــن و بــۆ کوشــتنی ئــەم عالەمە یەکســەر**
**ئــەم عەرســەیی ئافاقە ئەڵێــی حەلقەیــی داوە!**
**ئــەم دینە لە پێشــا وەکــوو ســەرچاوەیی زەمزەم**
**بێ غەش بوو، ئەمێســتاکە ئەڵێــی عەینی قوڕاوە!**
**بنچینەیــی دەرکەوتــووە بنیــادی شــەرێعەت**
**یەکســەر هەرەســی بــردووە ئاســاری نەمــاوە**
**پــڕ گــەردی غەمە نــاوی ســەعاتی دڵــی عالەم**
**ڕەققــاس و جــەڕ و زەنبەلەک و چەرخی شــکاوە!**
**یاڕەببــی لەبــەر حورمــەت و ئیکرامــی «مُحَمَّد»**
**ڕەحمــێ بکــە بــەم باقیــی ئیســلامە کــە مــاوە**
**کــەم، زۆرە ئەگــەر نەســرەتی حــەق ڕاهنمــا بێ**
**بێ نەســرەتی حەق لەشــکری «دارا» سەرە واوە!**
**«حەمدی» دڵی یەخســیری فەرەنگی غەمە ئەمڕۆ**
**بەربوونی بە بەربوونی گەرووی «بەسرە» و «فاو»ە!**

سەیر ئەکەین: ئەم هۆنراوانە جۆرە چەمکێک ئەدەن بەدەستەوە کە ئەو چەمکە سەردەمەکە دروستی کردووە، پەردەی وشەکانیش تێمان ئەگەیەنن: کە وەسپی ئەدەبی کوردی بە تەواوی چووەتە جەرگی چەمکەکانەوە. ڕۆژەکان و کارەساتی ڕۆژەکان چۆن چەمکەکانی هێنایە ناوەوە، بەو جۆرە وشەی ئەو چەمکانەشی هێنایە ناوەوە. وەسپی

ئەدەبیی کە لە پشــووترا بە جۆرێکی وەکوو کلاسیک ئەکرا، لەبەر ئەوە کە شــتی ناو ڕۆژەکان گۆڕا ـکە کارەســاتەکەیە ـ وەســپەکەش بەو جۆرە گۆڕا و بەرگی کلاسیکی کرد بە «کاژ» و فڕێی دا!!.

**

هەروەهــا لــەم ســەردەمانەی دواییــەدا، کەوتنــە ناوەوەی چــاپ ئەوەندەی‌تر پشتی گۆڕانی ئەدەبی کوردی بەهێزتر کرد، چونکە لە کاتێکا ـبەچاو کوردەوە ـ نووســین کە هەر برێتی بوو لە نووســینی دەستنووس، ئەمــە لەوانە نەبوو بتوانێ هەموو خوێندەوارێک بگرێتەوە، نەخوازەلا نووســینی کوردی!. چونکە خاوەن قەڵەمەکە، نە هانەهانەیەکی ئەدرا بۆ نووســینەوەی ئەو شــتە کوردییە، نە ئافەرینێکی بەرئەکەوت تیایا!. ئەو کاتەی [خۆی] کە بە نووســینەوەی شــتێکی کوردییەوە خەریک ئەکرد و هیچیشــی تیا دەســت نەئەکەوت، خەریکی ئەکرد بە شــتێکەوە کە لەو ڕۆژەدا باوی هەبوو و ئەم ناوێکی پێ دەست ئەکەوت!. دیارە ئەم لایەنە ئەبێتە هۆی زۆر نەجووڵانی ئەدەبی کوردی لە ئاقاری خۆی!...

بەڵام کە چاپ داهات، ئەو خاوەن خامەی پێشووە پێی خۆش بوایە یا ناخۆش بۆ ئەو جۆرە نووســینە، چاپەکە ئەو نووسینەی بڵاو ئەکردەوە، لە بڵاوبوونەوەی هەموو جۆرە نووسینێک گەلێ بیروباوەڕ بڵاو ئەبووەوە، گەلێ دەســتەی وا پەیدا ئەبوو کە باوەشــیان ئەگرتەوە بۆ شتی تازە، لەم شــتە تازانەش ئاسۆی هەست و بیر ئەکشــایەوە و هەموو جۆرە شتێکی ئەکەوتە بازاڕەوە؛ وەکوو ســەردەمەکەی پێشــوو نەبوو، یەک شت تەنها یەک کەس چاوی پێ بکەوێ، بەڵکوو یەک شــت وەیا هەزار شت بە

هــەزاران کەس چاوی پێ ئەکەوت!. هەر شــتە داواکاری خۆی هەبوو، لەبــەر ئــەوە کە ڕەوڕەوە بۆ پێشــەوە ئەچــوو، داواکاری کلاســیک هەتا ئەهــات لەبەر بیــروباوەڕی نوێ ڕوو لە کزی بوو، هی ڕومانتیک و بگرە ســەریالیش بەگوڕ ســنگی بۆ پێشــەوە ئەنا و لاپەڕەی پێشــووی وەکوو تۆمار ئەپێچایەوە و پەردەیەکی‌تر دەرئەکەوت.

❀❀

جا ئێســتە لەبەر ڕووناکیی ئەو شــتانە کە باســمان کــردن، ئەتوانین بەپێــی چەرخەکان دەق ـنَص ـــە ئەدەبییەکان بهێنینــەوە و بزانین تا چ ڕادەیــەک ئــەو ناســاندنانە کە کران باڵ ئەکێشــن بەســەریانا؟.. لەم شوێنەدا بۆ ئەم جۆرە شتانە چەند پرسیارێک ئەکرێ:

(١) ـ ئــایا پارچەیەک ئەکرێ بە هی یەکێــک؟ وەیا ئەوترێ هی ئەو کەســەیە؟ ئــەم بە هی ئەو کردنــە ـواتە لەم پارچەدا ـ ڕاســتە یان نەء؟. ئەگەر ڕاست نەبوو، دیارە بە هەڵە کراوە بە هی ئەو، وە ئەو هەڵەبوونەی لەبەر چییە؟

(٢) ـ ئایا ئەم پارچەیە خاوێنە و هیچ دەستکاری نەکراوە؟

(٣) ـ مێــژووی دەق ـنَص ـ کامەیــە؟ دیارە مێژووی دانانی، نەوەک بڵاوکردنەوەی.

ئــەم پرســیارانەش بۆیە ئەکرێ، چونکە ئێمە قســە لــە ئەدەب و لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبــەوە ئەکەین، ئەدەب و لێکۆڵینەوەی ئەدەب، خۆی لە عاســتی خۆیدا شــتێکی سەربەخۆیە و کەســیەتی و بوونیەتییەکی سەربەخۆی هەیە، لەبەر ئەم بوونیەتییە سەربەخۆییە، بوو بە شتێکی

«هاماوی ـ کُلّی». هاماویش نازانرێ مەگەر بە هۆی پاژەکانیەوە ـ جُزئیّات ـ نەبێ. پاژیش نازانرێ و دەرناکەوێ مەگەر لەپاش زانینی هاماوەکە نەبێ!!...

بەڵێ! پارچەیەک ئەوترێ: ئەمە هی فلانە ئەدیب وە یا هۆنەرە، بۆ ئەوەکە تۆ بزانی ئەمە هی ئەو کەسەیە، ئەبێ بە تەواوی ئاگادار بی بەسەر زۆرتر ئەو شتانەدا کە ئەو وتوونی. کە ئەم ئاگادارییەت پەیدا کرد بەهۆی شتەکانیەوە، ڕەوشت و نەفسیەت و بیروباوەڕی بەرانبەر بە ژیان و پلەی خوێندەواری و هێزی دەسەڵاتی لە گوزارشت دانەوەی شت و توانینی لە دانانی وشەدا بۆ چەمکەکانی دەرەوە ـ «مَفاهیم»ی خارجی ـ، ئەم ڕەوشتانەی هەموو دێتە دست. وەکوو بڵێی: تەرازوویەکی پێوانەی ئەو کەسەت لە بەردەستا ئەبێ!..

ئەمجا ئەم پارچەیە کە کراوە بە هی ئەو و خراوەتە پاڵی، ئەگەر لەو ئەندازە نەفسییانەی تێدا هەبوو، ئەوا بەبێ شک ئەزانرێ هی ئەوە، بەڵکوو بە هی ئەو بوونی، گومانی تێدا نابێ، چونکە ئەم جۆرە ئەندازانە بەم ڕێکییە لە دوو کەسا ڕێ ناکەوێ. ئەگەر خۆ لەو ئەندازانەشی تێدا نەبوو، ئەوا دیارە هی ئەو نییە و بە هەڵە کراوە بە هی ئەوا!. هۆی پەیدابوونی ئەم هەڵەیەش گەلێ شتە:

یەکێ زمانی ئەو خاوەن پارچەیە؛ واتە دانانی وشە لەو شوێنانەدا کە ئەو دائەنێ بۆ ڕاکێشانی گوزارە، ڕەوشتی نووسینی لە نووسینەکانی تریا دەرئەکەوێ کە چۆن باسی خوازە، گۆشە و لێکچوون ئەکا؟؛ لەسەر چ ڕەوشتێک سیفەت بۆ مەوسووف دروست ئەکا؟؛ کام لە هونەرە قسەییە ئاشکراییەکان لە نووسینەکانیا زۆرترە؟.

یەکێ لێکچوونی ڕواڵەتیی ئەو دوو پارچەیە، نووسەری نەشارەزای باری ئەدەبی، بۆ نووسینەوەی پارچە ئەدەبییەکان، نەشارەزاییەکەی کابرای وا لێکردووە کە ئەو پارچە بێگانەیە بخاتە ناو پارچەکانی ئەو کەسەوە!.

یەکێ تازەپیاکەوتووی هۆنەرێک، ئەیەوێ پارچەیەکی هەیە و پارچەکەی مەردم باوەشی بۆ بگرنەوە، ئەگەر بە ناوی خۆیەوە بڵاوی کاتەوە کەس نایەوێ، دێنێ ئەیکا بە هی یەکێکی بەناوبانگ، بەناوی ئەو کەسە بەناوبانگەوە ناو ئەستێنێ و کەچی لە ڕاستیشدا هی ئەو نییە!.

یەکێ پەرتبوونی ئەو پارچەیە بۆ ناو شێوەیەک کە ئەو شێوەیە جیاوازییەکی ڕواڵەتی هەیە لەگەڵ شێوەی پارچەکەدا، وە لە شێوەی وڵاتی پارچە تێکەوتووەکەدا تەنها ناوی یەکێک لە شێوەکەی جگە لە شێوەی خۆیان، ناوبانگی سەندووە؛ ئەمان لەبەر ئەوە کە بە تەواوی شارەزایی ئەدەبییان بەسەر شێوەکەی‌ترا نییە، هەر پارچەیەک لەو شێوەیە کەوتە لای ئەوان، ئەوان بە هی ئەو ناوبانگ دەرکردووەی ئەزانن کە لەلای ئەوان ناوبانگی دەرکردووە!..

کە پیاو بە تەواوی چووە بنج و بناوانی ئەم شتانەوە، ئیتر ئەزانێ ئەو پارچەیە دەستکاری کراوە یان نەکراوە.

هەروەها بۆ ڕاستی و ناڕاستی پارچەیەکی ئەدەبی، دەستنووسی خاوەنەکەی لە هەموو شت ڕاسترە؛ وە مێژووی ئەم پارچەیەش، خودی دەستنووس و نووسینەوەی خاوەنەکەیەتی، نەوەک کاتی بڵاوبوونەوەی بەسەر مەردمدا... ئەمجا شیکردنەوەی هەندێ لە پارچە ئەدەبییە کوردییەکان.

❋❋❋

# مەلای جزیری

## ١٤٠٧ ـ ١٤٨١

لە سـەدەی پانزەهەمی میلادیدا هۆنەرێکی وەکوو شـێخ ئەحمەدی جزیری ئەڵێ:

**دیسـا ژ نو بێ‌حالـە دل، سـاقی وەرین جامـا زوجاج**
**موشتاقی خەمرا ئالە دل، لێ خۆش ل رۆحی بت میزاج**

**گوزارە:**

دیسـان سـەرلەنوێ بێ ئاگا و بێ حاڵە دڵ، مەیگێڕ! بێنە جامێکی شووشـە ـپیاڵـەـ بە ئارەزووی مەی و شـەرابێکی ئاڵـە دڵ، بۆ ئەوە لەو مەیەوە میزاج و سروشتی گیان ـ ڕۆح کەیفخۆش ببێ.

**سـاقی کو مەهوەش بتـن، کاکول ژ شـێڤا رەش بتن[1]**
**قەرقـەف بلا ئاتەش بتن، ئـەم دێ بوی دل کین عیلاج**

**گوزارە:**

مەیگێڕێکـی وا کـە ڕوومەتی وەکوو مانگ بێ، کاکۆڵی لە شـەوی تاریکا ڕەش بێ؛ واتە وەکوو شەوی ڕەش بێ. شەراب لێ گەڕێ با ئاگر بێ؛ واتە شەرابێکی وا کە لە ڕەنگ و سووتێنەری و کاریگەریدا وەکوو ئاگر بێ، ئێمە لەمەودوا بەو، دڵی خۆمان چار بکەین؛ واتە بەو شـەرابە چاری پەژارەی دڵی خۆمان بکەین!.

---

١. «ساقی کو دیم مەهوەش بتن» (نوسخە).

**دا ئەم بوی دل حەی بکین، پێ سینە داغ و کەی بکین**
**سەد مەنزلان پێ تەی بکین، ئەودێ د سەیرێ بت رەواج**[١]

**گوزارە:**

تا ئێمە بەو شەرابە دڵ زیندوو بکەینەوە، بەو شەرابە سینگ داغ بکەین؛ واتە سینەی خۆمانی پێ داغ بکەین، هەر بەهۆی ئەو شەرابەوە سەد قۆناغ ببڕین و بڕۆین، بۆ ئەوە لەمەودوا شەورەوی -ڕەویشتن بەشەو- باوی ببێ و بتوانین ئەو شوێنانە ببڕین.

**بێ نار و نووری مەحبەتێ، بێ نەقش و سونعا قودرەتێ**[٢]
**ناچین مەقامێ وەسلەتێ «نُورٌ لَنا واللَّيْل داج!»**

**گوزارە:**

بەبێ ئاگر و نووری مەحەببەت و خۆشویستن، بەبێ نەخش و نیگار و دەستکردی دەسەڵاتی خوایی، ناچین و ناگەینە پایەی پێگەیشتن، چونکە ئەمانە نوور و ڕووناکین و ڕێگاش شەوی تاریکە، تا ئەمانە نەبن ڕێگا ڕوون نابێتەوە.

**ئەڤ نار سیقەلا دلە، دائم لوێ قالا دلە**
**نەورۆز و سەر سالا دلە، وەقتێ کو هەلبت ئەو سیراج**[٣]

**گوزارە:**

ئەو ڕووناکی و ئاگرە زاخاوی دڵە و ژەنگی ئەو دڵە لا ئەبا، بە هەتایی

---

١. «د سەیرێ کەت» (نوسخە).

٢. «وەسفا قودرەتێ» (نوسخە).

٣. «وەقتێ هەلێتن ئەو سیراج» (نوسخە).

لەو ڕووناکی و ئاگرە دڵ قاڵ ئەبێتەوە، هەروەها نەورۆز و سەریساڵی دڵە؛ واتە: بۆی ئەبێ بە جەژن و پێی گەش ئەبێتەوە، کاتێ کە ئەو چرایە هەڵبێت و هەڵبکرێت.

**حەتا ب نوورا بادەیێ، ڕەنگین نکەی سەجادەیێ**
**دووری ژ وی شەهزادەیێ، دوڕدانەیا گەردن ژ عاج**

**گوزارە:**

تا بە نووری بادە و شەراب، ڕەنگین نەکەی بەرماڵی خواناسی و عیبادەت، تۆ هەر دووری لەو شازادەیە کە ئەڵێی دانەی دوڕە و گەردنی لە عاجە؛ واتە سپییە وەکوو عاج[1].

**دوڕدانەیا گەردن بلوور، ڕەیحان ل سەر دیم بوونە هوور**
**هەی هەی ب مەستی دێنە دۆر، خالا لنک فەرقێ ب تاج**

**گوزارە:**

ئەو خۆشەویستە تاقە دوڕێکی نایابە، گەردنی بلوورە، ڕەیحانە لەسەر ڕوومەتی ورد بووە و بڵاو بووەتەوە، چ عەجەب!. هەی‌هەی بە مەستی و سەرخۆشی دێنە دەور ئەو خاڵانە و دێنە لایانەوە ئەهل و دەستەی خاوەن تاج؛ واتە: ئەوانەی تاجیان لە سەرە کە پادشاکانن!..

**میهرا تە پڕ ئەبتەر کرین، خالان ژ بەر بسکان دەرین[2]**
**زولفا موسەلسەل عەنبەرین، چین چین ژچینێ تینە باج[3]**

---

١. عاج: ددانی فیلە.

٢. «بسکان هەلین» (نوسخە).

٣. «ژ چین تیت باج» (نوسخە).

**گوزارە:**

خۆشەویستی و مەحەببەتی تۆ زۆر کەس و زۆر تاج بەسەری بێبەش و بێ‌هیوا کردووە، ئەو خاڵانە کە لەبەر بسکەکانتەوە دەردێن ـ وەیا خاڵان لەبەر پەلکەکانتەوە دەرخە ـ زوڵفە عەنبەرینە چین چینەکەت لە وڵاتی چینەوە باج دێنێت؛ واتە: سەرانە.

**تەنها نە کوردوستان ددن، شیراز و بەندی وان ددن**
**هەریەک ل سەر چهڤان ددن، ژ ئەسپەهان تیتن خەراج!**

**گوزارە:**

تەنها نە هەر کوردوستان سەرانە ئەدەن، یا نەتەنها هەر شیراز و بەندەری وڵاتی «وان» خەراج ئەدەن، بەڵکوو ئەم شیراز و وانەش کە ئەیدەن، بە خۆشی و بە لەسەر چاوان ئەیدەن، هەروەها لە ئەسفەهانیشەوە باج و سەرانە دێت!.

**چاڤێن بەلەک، قەوسەین هەلەک، چەرخێ فەلەک، غالب مەلەک**
**«في حُبِّها عُمْري دَلَك، والحُبُّ يَجْري في عُجاج!»[1]**

**گوزارە:**

چاوەکانی ڕەش و سپی و بەڵەک و جوانن، دوو برۆکەی کەوانەیی و کوشندەن، چەرخی فەلەک و زۆرتر لە فریشتەکان لە ژێر فەرمانی خۆشەویستیی ئەودان و سەریان بۆ خۆشەویستنی ئەو دانەواندووە، عومری منیش هەر بە هۆی زۆر خۆشویستنی ئەوەوە ڕوو لە نەمانە، خۆشەویستیی دەریایەکە لە ناو تۆزدا!.. وەیا:

١. «والحُبُّ بَحْرٌ في عُجاج» (نوسخە).

ئـەو چاوڕەش و سـپییە، کـە بەڵەکە، ئـەو دوو کەوانە کوشـندەیە کـە برۆکانیەتـی، چەرخـی فەلەک کە چەرخـی کەونە، لەگـەڵ زۆرتر لـە فریشـتەکان، لە ژێـر فەرمانـی ئـەودان، وە عومری منیـش لەبەر خۆشویسـتنی ئەو ڕۆیشـت و ڕووی کردەوە نەبوونـی!. لەگەڵ ئەوەدا خۆشەویستیی بەناو تۆزدا ئەڕوا، وەیا دەریایەکە لەناو تۆزدا!..

**شاهید هەزار ڕەنگ خەملین، ڕەقس و سەماعێ کەملین[1]**

**ئیرۆ «مەلا» ئەم سەد دلین، ساقی وەرین جاما زوجاج!**

**گوزارە:**

شـاهید ـکە دۆسـت و خۆشەویسـتەـ بە هەزار ڕەنـگ خەملیوە و خۆی جوان کردووە، سـەما و گوێگرتن گەیشتۆتە ئەوپەڕی؛ ئیمڕۆ ئەی مـەلا، دڵمـان بڵاو بووەتـەوە و بووین بـە خاوەنی هـەزار دڵ، کەواتە! مەیگێڕ بێنە جامێکی شووشەیی پڕ لە شەراب!...

❀❀

ئـەم پارچەیە، هۆنراوێکـی ئەدەبی کوردییە و لە مێژووی سـەدەی پانزەهەمـدا وتـراوە. لێـرەدا قسـە لـەوەوە ناکەین کـە هونەرە قسـەییە ئاشـکراییەکانی تێـدا هەیە یا نییە؛ قسـە لەوەوە ناکەیـن کە ئەم پارچە هۆنـراوە خـۆی بوونیەتییەکی سـەربەخۆی هەیە و بوونیەتییەکەیشـی وەنەبـێ بەهـۆی هونـەرە قسـەییە ئاشـکراییەکانەوە بێ، ئـەو هونەرە قسـەییە ئاشـکراییانە کە گۆیا وا چووەتە دڵەوە، شـتێکە و تایبەتی بووە لە ڕۆژهەڵاتا بە ئەدەبی عەرەبییەوە و بە زۆر سـەپێنراوە بەسەر جگە لە

---

١. [«ڕەقس و سەما پێ کەملین» (نوسخە)].

زمانی عەرەبیدا!. بۆیە قسە لەوەوە ناکەین، چونکە ئەو هونەرانە هەر زمانێ کە ناوی خۆی بەرێ بە زمان و خاوەنی ڕیشە و چاوگەیەک بێ، ئەبێ ئەو زمانە ئەوانەی تێدا هەبێ، بەڵکوو لە نەبوونەکەی زیان بەو کەسیەتییە ئەدەبییەی ئەگەیەنێ!..

قسە لەوەوە ئەکەین: کە ئەم هۆنراوانە کلاسیکن یا ڕومانتیک؟ ئایا لەباری شێوە و داڕشتن و نیاز و هۆنینەوەی بیرەوە، شوێنی خۆیانیان گرتووە یان نەء؟..

ئەم هۆنراوانە پەردەیەکی خواناسی و دەروێشی لە دیمەنی پارچەیەکی هەڵبەسەدا سەردەمێکی گەلێ لەمەوپێشی کورد بۆ ئێمە بە زمانی کوردی دەرئەبڕن.

بەڵێ! ئەگەر کلاسیک برێتی بێ لە ڕەوشتی پێشینان، وەیا جۆری نووسینی نووسەرانی پێشوو، کە ببێ بە سەرمەشق بۆ هی‌تر، کە ئەمە لە دوو پەردەدا دەرئەکەوێ: یەکێ لە بیردا، یەکێ لە داڕشتنا. بیری ئەم هۆنراوانە بیری سەردەمێکە کە خواناسی و دەروێشی لەو سەردەمەدا لەناو زۆرتر لە نەتەوەکانا هەبووە و پەیڕەوییان کردووە؛ ئەم هۆنراوانە پەیڕەوی بیروباوەڕی نەتەوەیەکی‌تری کردبێ یا هی خۆی کردبێ، بەڵێ جۆرە چۆنیەتییەکی کلاسیک پیشان ئەدا!، بەڵام لەباری داڕشتن و ڕێخت و ڕستەدا ناتوانرێ ئەم فەرمانەی بەسەرا بدرێ، چونکە وەکوو ئەبینین: کەم کەس، چ لەو سەردەمەدا و چ لەدوای ئەو سەردەمە، لەو شێوەیەدا توانیویانە وەکوو داڕشتنی ئەم هۆنراوانە پارچەیەکی ئەدەبی دروست بکەن!. بەڵکوو جۆری ئەدەبەکەی ئەم بووە بە سەرمەشقێک لەبارەی دەروێشی و خواناسییەوە، بۆ ئەدیب و هۆنەرانی دوای خۆی.

کەوابوو، لە بارەی داڕشتن و ڕێختەوە ناتوانرێ بوترێ کلاسیکە.

ئەو جۆرە شێوەیە کە مەلای جزیری لە هۆنراودا گرتوویەتی، وەیا ئەم شێوەیە کە لەم هۆنراوانەدا هەیەتی، کە «هێما» کردن بە فەلسەفەی ئیسلامی و بە بوونی دەروێشی و بە یەکیەتیی‌بوون ـ وەحدەتی وجوود ـ، وە دەربڕینی ئەمانە لە بەرگی هەڵبەسە و حەسپی خواییدا، بە جۆرێک کە لە باری هەڵبەسەکەیا گەیشتۆتە ئەوپەڕی پایەی گەزاف‌وێژی ـ موبالەغە!. ئەم چەشنە شێوەیە بە تەواوی ئەوە دەرئەخا کە پارچە هۆنراوێکی مەلا ئەگەر بکەوێتە ناو دیوانی یەکێکی‌ترەوە بە تەنها شێوەکە تۆ ئەتوانی وەکوو موویەک لە ماست دەربێنی، بەو جۆرە ئەو پارچە هۆنراوەیە لەو دیوانە دەربێنیت.

ئەمجا «داڕشتن»: داڕشتن و ڕێختی ڕستە لەم هۆنراوانەدا پایەیەکی بەرزی هەیە تیایانا؛ هەموو دەمێ پێشخستنی مەوسووف و بەشوێنیا هاتنی چەند وەسفێک، وە هێمای گەل بە گەل و تاک بە تاک، وە هۆنینەوەی وشە بە جۆرێک کە دڵی گوێگر و خوێنەر ڕاکێشێ، ـ ئەمەیە کە پێی ئەڵێن ڕێخت و داڕشتن ـ ئەمانە هەموو هەیە لەوانەدا.

«نیاز»: نیاز لەم هۆنراوانەدا دەربڕینی جۆش و خورۆشێکی خواناسییە لە بەرگی هەڵبەسەدا، ئەو مەبەستە دروست بووە، وە بەڵکوو مەبەستی هەرە زل، سەلماندنی نووختەیەکی بناغەییە لە باوەڕی ئەوا، کە ئەو نووختەیەش تا مرۆڤ بەهۆی چەوساندنەوەیەکی نەفسییەوە ژەنگ لە دڵی خۆی پاک نەکاتەوە، ناگا بەو گوڵستانی خواناسییە!. ئەمەی بە تەواوی تێدا هەیە.

ئەمە بێجگە لەوە کە لە هۆنراوەکانا وا دەرئەکەوێ مەلا دەسەلاتی

بەسەر گەلێ شوێنانا هەبووە، چ لە کوردوستان وە چ لە دەرەوەی کوردوستاندا، ئەو دەسەلاتەی خۆی دەربڕیوە و بە دەربڕینەکەی گەیشتووە بە ئامانج.

«زنجیرەی بیر»: زنجیرەی بیر لەم هۆنراوانەدا لە مەبەستەکانی‌تر زیاتر دەرئەکەوێ؛ ئەو بیرەی کە لە سەرەتای دەستپێکردن بە پارچەوە باسی ئەکا، چ لە ناوەڕاست و چ لە دواییدا بە ئەندازەی موویەک لێی لا نادا!. بەڵکوو لە سەرەتاوە وردەوردە ئەچێتە پارێزەوە، مەیێکی ئاڵی ئەوێ بۆ دڵێ بێ‌حاڵ!. بادەگێڕێکی ئەوێ کە لەناو دەریای جوانیدا نقوم بووبێ، بۆ ئەوە ئەو دڵەی بە تەواوی بە دیمەنی بادەگێڕ و شەرابی ئەرخەوانی سەرخۆشی ئەو بازاڕە ببێ!. ئەمجا لەوێوە سەرکەوێ بۆ بینینی دیداری خواناسی ڕاستپەرست؛ ئەو خواناسانە کە هیچ ئامانجێکی‌تریان نییە، تەنها بینینی نووری خوایی نەبێ؛ تەنانەت ئەیانەوێ بگەنە فریشتەش!. بەڵکوو ئەیانەوێ لەوێش و لەوانیش تێپەڕن!..

وەکوو سەیر ئەکەین، ئەم زنجیرەی بیرە سەرەتا وەکوو لە شتێکی بچووکەوە سەر هەڵدا و پاشان دنیایەک بگرێتەوە، بەو جۆرە هەتا دێت بڵاوتر ئەبێتەوە!. کەوابوو، ئەو زنجیرە بیرەی لەم هۆنراوانەدا ئەبینرێ، هەر ئەوەیە کە بەڕاستی پێی ئەڵێن: «"تَسَلْسُل"ی فیکری»!..

**

- لێرەدا ئەم هۆنراوانە چەند نوختەیەک بۆ ئێمە دەرئەخەن:

۱ـ نەفسیەت و چەشەی مەلا خۆی، کە پیاوێک بووە لە سۆفییان

و دەروێشـان و لەو کەسـانە کە بە تەواوی ئاشـنای خواناسیی بوون لە کورددا.

٢- مێژوویەکـی کۆمەڵایەتی ئەو سـەردەمە ئەگێڕنـەوە کە ڕەمەکی مەردمەکـە لەبەر هەر شـتێک بـووە، زۆرتر بیروباوەڕیان هاتۆتە سـەر هەسـتێکی ئایینی، بۆیە وا ئەو هەسـتە لە ئاوێنەیەکی وەکوو ئاوێنەی دڵی مەلادا دەرکەوتووە.

٣- وەکـوو زمانـی هۆنەرێکی وەکوو مـەلا زمانی کـوردی بووە، ئەو شـوێنەش کە مەلای تێدا بووە، شـوێنێکی کورد بووە و بە کوردوسـتان ناوی دەرکـردووە و لەسـەر زاری کـوردەکان بـووە. بەڵگەیەکی ئەدەبیی پێنجسەد ساڵی پێش ئیمڕۆ، دانی بە وڵاتی کوردوستانا ناوە.

٤- ڕەوشتی نەورۆز و بە سەریساڵ زانینی نەورۆز، لەو ڕۆژەوە لەناو کـوردەکانا هەبـووە و بە ڕەوشـتێکی نەتەوایەتییان زانیـوە، بە جۆرێـک لەناویانا باو بووە، کە هۆنەرێکی پێشەنگی دەروێشی و خواناسی وەکوو مـەلای جزیری بە هەمـوو سەربەسـتییەکەوە، بەبێ ئەوە شـتێکیتر بەدڵیا بێت، وەیا سەر لە بەرهەڵستێک بکاتەوە، لە دەستووری جەژنێکا ناوی بردووە!..

ناونانـی نەورۆز لە دەسـتووری مـەلادا بە جەژن، ئەوەمان پیشـان ئەدا: کە بە هیچ جۆر پێچەوانەیەکی ئایینیی تێدا نییە، ئەگینا پیاوێکی خوایـی وەکـوو مـەلا نەیئەوێرا توخنـی بکـەوێ!.. ئەم نـەورۆزە و بە سەریسـاڵ زانینی نەورۆز، لەو ڕۆژەدا لە هەمـوو ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوای کوردوستاندا باوی هەبووە و ڕەوشتێکی نەتەوەیـی بووە بۆ هەموویان.

***

# سەیدەی هەورامی[1]

لە سەدەی شانزەهەمدا لە وڵاتی کوردەواری لە هەورامان ـکە هەندێ کەسی بێگانە ئەم شوێنەیان بە گۆران ناو بردووە!ـ هۆنەرێکی دیمەنپەرست پەیدا بووە کە «سەیدە»ی ناو بووە. سەیدە یەکێک بووە لەو هۆنەرانە کە لەو چەرخەدا و لەو شوێنەدا پەیدا بووە.

بیر و باوەڕ و جۆری هۆنراوی سەیدە لەو «دەقە ـ نَصّ»ـانەدا کە لە شوێنی بەجێ ماوە، ئاوێنەیەکە بۆ بیروباوەڕی هۆنەرانی سەردەمی خۆی لە شوێنی خۆیا، وەکوو چۆن مێژوویەکە بۆ چۆنیەتی ڕابواردنی

---

١. سەیدە لە «١٥٢٠»دا ناوبانگی دەرکردووە. [تێبینی: کاک «موحەممەد ئەمین کاردۆخی» وە کاک «عەبدوڵڵا حەبیبی» کە کۆکردنەوە و شیکردنەوەیان بۆ ژیان و هۆنراوەکانی ئەم زانا و شاعیرە مەزنە کردووە، لە پێشەکی دیوانی «سەیدی»ـدا دەڵێن: «سەیدی» ناوی «مەلا موحەممەد سلێمان»، کوڕی حاجی سەیید مەحموودە و ساڵی ١١٩٩ی کۆچی مانگی، لە دێی «خانەگا»ی سەر بە شاری پاوە ـ هەورامان، لەدایک بووە... وە ساڵی ١٢٦٥ک.م کۆچی دوایی کردووە... نازناوی «صەیدی»ـیە بە «صاد» نەک بە «سین»... وە لە «صَید»ی عەرەبییەوە هاتووە، بە مانا «ڕاوکراو ـ نەچیر». جا چونکە پیتی «ص» لە ڕێنووسی کوردیدا نییە، پیتی «س»ـی لەجیاتی دەنووسین، لەبەر ئەوە ماناکە ناگۆڕێ و وشەیەکیتر دروست ناکات. وە سەیدی خۆیشی لەم هۆنراوەیا وتوویەتی:

**عەرزە داشت بەندەی دڵمەند و ڕەنجوور**

**«صَیْد»ی دامی عیشق، بە «صەیدی» مەشهوور**

(وەرگیراوە لە پێشەکی «دیوانی صەیدی ـ موحەمەد ئەمین کاردۆخی» چاپی ١٣٩٢ی هەتاوی، بە پێداچوونەوە و هەڵەگری «موحەممەد ڕەشید ئەمینی ـ پاوە». وە «دیوانو سەیدی هەورامی ـ گلێر کەردەی و لەیەکەوەدای کاک عەبدوڵڵا حەبیبی» چاپی ١٣٩٨ی هەتاوی. کە هەردوو چاپەکە لەلایەن دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی کوردستانەوە، لەچاپ دراون)].

ئەو سەردەمە ـلە هەندێ لە پارچەکانیاـ، لەگەڵ چۆنیەتی هۆنراو بە چ جۆرە ڕێختێک هەر لەو ماوەیەدا.

ڕەنگبێ ئێستە گەلێکمان نەزانین کە ڕابوردووەکانی ئێمە چۆن خواردوویانە بۆ ئەوە بژین؛ ئەو خواردنە کە ئەگەر ئەو نەبێ ژیانەکە نابێ!.. ئەو خواردنەش «نان»ـە!.. ئایا ئەم نانە وەکوو ئێستە مەکینە، گەنمەکەی دووریوەتەوە و هەر مەکینەی هەڵم کردوویە بە ئارد؟. یا بە جۆرێکی تر بووە؟!.. بە جۆرێکی سادەی وا کە هەموو ماڵێک بەبێ ئەوە ئەرکی بکەوێتە شوێنێکی‌تر، کردوویە.

وا دیارە بە جۆرێکی زۆر سادە بووە، چونکە سەیدە باسی ئەو سادەییە ئەکا؛ باسی ئەوە ئەکا کە لەو سەردەمەدا لە هەموو گوندێک چەند «دەسار»ێک وەیا بگرە لە هەموو ماڵی گوندێکا، دەسارێک بووە و بەو دەسارە ئەو گەنمە کە بەهۆی شان و قۆڵ [و] کوتانی پیاوەکانیانەوە بە جووت و دروێنە پێک هاتووە، ژنەکانیشیان بەو جۆرە کردوویانە بە ئارد!. سەیدە ئەو دیمەنە لەم هۆنراوانەی خوارەوەدا ئەگێڕێتەوە و ئەڵێ:

**هارە سەختەنی، هارە سەختەنی**
**تۆ سەنگ گران ساحێب بەختەنی**[1]
**ئانە قیبلەمەن بە لەنجەولارە**[2]
**تەشریفش وەلای تۆ ئاوەرد، هارە!**[3]

---

١. [«تۆ خۆ کەم قیمەت، سەنگی سەختەنی» (نوسخە)].

٢. [«ئارۆ قیبلەو من» (نوسخە)].

٣. [«تەشریفش وەلای تۆ ئامان» (نوسخە)].

دوو لێمۆی وەشبۆش تەرحی شەمامە
جمەجمشانە نە یەخەی جامە
هارەی هەراسان هەردەی هەردەگێڵ
خاس خول دە نە وێت چون دێوانەی وێڵ![1]
دەخیلەن دەسەت! بە دەسی یارەن
پەنجەش ڕێش نەبۆ، هارە هاوارەن[2]
دانەش مەسانی چون ستەمکاران
مەکەریش وە گەرد تووتیای شاران!
کەس چون تۆ ئازیر جە لای یار نەبی
هارە جەی وەشی سا چی هار مەبی؟!
وە بەین و بەقاش هیچ مەبە خەڕە
جەفاش سەد بارەن، وەفاش یەک زەڕە
کاتێوەت زانا هۆرێزا بە قەس
چون بێبەینەتان جە تۆش کێشا دەس!
شی بە ماوای وێش تەشریف بەردەوە
تۆش ئاسی[3] وەلای داخ و دەردەوە

١. [«کەم دەور دە نە وێت» (نوسخە)].
٢. «دەخیلەن دەست» (نوسخە)..
٣. «تۆش مانی» (نوسخە).

**تلیــای نە ڕووی زام ئێش پــڕ خەتەر[١]**
**مات مەبی خامۆش جە «سەیدی» بەتەر!**

لێـرەدا بابەت هەیە و دیمـەن هەیە؛ بابەتەکە برێتییـە: لە هاڕینی دانـەی دانەوێڵەیەک کە بە دەسـاڕێک کە لەو سـەردەمەدا ئەمە باو بـوو، لە هەمـوو ماڵێکـەوە نازداران بە «سـوێنە»ی[٢] پڕ لـە دانەوە لە پێش چێشـتەنگاوەوە ڕوویان کردۆتە پەنا سـێبەری لادیواری بەرماڵان، لە شـوێنێکی گەسکدراوا چارۆکەیەکیان ڕاخسـتووە، دەساڕیان لەسەر داناوە و کەوتۆونەتە هاڕینی ئەو دانەوێڵەیە!.

دیمەنەکـەش هۆنینـەوە و ڕێکخسـتنی گوزارەکانـە لـە بەرگی ئەم وشـانەدا کە بێجگە لە ڕێکەوتنی گوزارە و وشە داڕشتن و ڕێختێک لە جەرگی وشەکانا هەیە.

❀❀

«هارە» دەساڕە، دەساڕ لە بەردە، بەخت ئەبێ بۆ گیاندار بێ، کەچی ئـەو داویــە بە بێ‌گیانێک کە بەردێکی ڕەق و تەقـە!. بۆچی ئەم بەردە بەختی هەیە؟ چونکە دۆسـت چووە بۆ لای و لە لایەوە دانیشتووە؛ ئەو دۆستە کە ئەم ئەڵێ: ئەوە قیبلەمە و بەو لەنجەولارەوە و بەو دوو لیمۆی بۆنخۆشـی وەک شـەمامە ـکە مەمکیەتیـ، بـە جموجووڵ لە یەخەی کراسـەوە هـات بۆ لام!.. ئەو بەردە هەسـت بکا بـەو بەختە یا نەیکا لە باوەڕی ئەوا بەختدارە، چونکە ئەگەر وەکوو ئەم بێبەخت بوایە، دڵخواز

١. [«ئەوسا چەنی زام بێدەوای خەتەر» (نوسخە)].

٢. [سوێنە: کەشکەساو، دۆڵە، ئینجانە، شتێکی وەکوو تەشت بۆ کاروباری ناو ماڵ].

نەئەچوو بۆ لای!..

ئەمجا کە ئەو بەختە بەو جۆرە رووی کردە ئەو بەردە، ئەم ئامۆژگاریی ئەکا و پێی ئەڵێ:

هەل لە دەست بەر نەدەی؛ بەری نەدەی هارەی ماندووی ترساوی لە شاخ و داخ سووڕاوە!.. چاک بسووڕێوە، نەبیت بەو دێوانەیە کە وێل و سەرگەردانە و نازانێ بۆچی ئەسووڕێتەوە؟!.. تۆ نەبیت بەو، چونکە تۆ یارت لەلایە، ئەبێ بزانی بۆچی ئەسووڕێتەوە و لەبەرچی ئەسووڕیتەوە؟. سووڕانەوەت بە فەرمانی یارە!..

دەخیلتم دەسکی هارەکە! ئەو دەستەی کە بە تۆوەیە و ئەتسووڕێنێتەوە، دەستی یارە؛ ئیشێکی وا نەکەی پەنجەکانی بریندار بکەی!.. زوو بێ بە دەستیەوە و بە سووکی بۆی بسووڕێوە!.. ئەمجا وەسپی هارەکە و ئیشی هارەکە ئەکا و ئەڵێ:

دانەی لێ ئەستێنی وەکوو ئەو کەسانەی کە ستەمکارن!. کە لێشت سەند، ئەیکەی بە تۆز و تووتیای[1] شاران؛ واتە وردورد ئەیهاڕی؛ وا ئەیهاڕی کە «با» ئەیبا و هەر تۆزێکی ئەکەوێتە شوێنێک!. کردەوەی تۆ ئەی هارە!. لەگەڵ دانە و گەنمدا وەکوو کردەوەی ستەمکارانە لەگەڵ ستەمباراندا!. هارە! هیچ کەس وەکوو تۆ خاوەن بەخت نەبوو کە بەو جۆرە لەلای یار خۆشەویست بێ و یار لەلایەوە دانیشێ!. هارە! لەم خۆشییە ئیتر بۆچی هار نابی؟!..

پاش ئەمانە پێی ئەڵێ: ئەی هارە! بە مانەوەی ئەو یارە و ڕێکەوتنی لەگەڵتا، وریا بە دەستخەڕۆ نەبی، چونکە دەرد و مەینەتی سەدبارە،

---

١. «تووتیا»: تۆزی گیایەکە کە ئەیکێشنە چاو، وە زۆر وردە.

واتـە: زۆرە؛ بـەڵام وەفای هەر تۆزێکە!. واتـە: مانەوەی لە لات کەمە و نەمانەوەی زۆر زۆرە؛ هەر ئەوەندەت زانی هەستا بە دەستقەسی وەکوو بێبەینـەتان لە تۆیش دەسـتی کێشـایەوە و بەرەڵای کـردی!؛ چووەوە بۆ شـوێنی خۆی و تەشـریفی بردەوە، تۆیشـی هێشـتەوە بەلای داخ و دەردەوە و پەکی خستی؛ تلایتەوە لە ڕووی، واتە: بە ڕووی ئێشی برینی پڕ ناسۆرەوە، بە ماتی بێدەنگ ئەبی لە «سەیدی» خراپترا!..

❋❋

لێرەدا مەبەسـتی ئەم هۆنەرە ئەوە بووە: کە قسـە لەگەڵ یەکێکی‌ترا بـکا، ئـەو یەکەی کە ئـەو قسـەی لەگەڵ کـردووە دەسـاڕێک بووە و نیازەکەی خۆی پێ وتووە؛ کە یار دێتە لات و بەو هاتنەی دەسـتخەڕۆ مەبـە، لەوانەیە وەکوو چۆن گەلێ کەسـی بەجێ هێشـتووە، بەو جۆرە تۆیش بەجێ بێڵێ!..

جـا ئایا ئەو هارە و یارە، هارە و یارێکی ڕاسـتەقینەیە؟ یا مەبەسـتی ئـەم گێتییەیە کە گەلـێ نەونەمامان و ڕوومەت‌گـوڵان دێنە ناویـەوە و ئەویش چەند ڕۆژێک ڕوویان تێ ئەکا و لە پاشا پشتیان تێ هەڵئەکا؟!، ئەیانـکا بە گەرووی خۆیا و ئەیانمرێنێ!. هەر مەبەسـتێک هەبێ نیاز هەیە لێرەدا.

ئـەو بیرە کە لە سـەرەتاوە بناغـەی داناوە، تا دوایـی پارچەکە وەکوو ئەڵقەی زنجیر پێکەوە بەستراوە.

جـۆری ڕێخـت و داڕشـتنی هەیە، وەکوو ئـەوە لە بەینی وشـەکانا چـی لەگەڵ چیـدا بگونجێ، دایناوە. چ وەسـپێک بۆ چـی ئەبێ ئەو

وەسـپەی داوە بـەوە؛ گەڕانی لە کاتـی گەڕانا داناوە، ماتیـی و زەبوونی لـە کاتـی لانەوازیـدا داناوە، دیمەنی لەبەینی سـتەمکار و سـتەمباردا دروسـت کردووە، کە هەریەکەیان چی ئەکەن. زیاتر لەمانەش شێوەی ئەدەبێکی کوردی ئەو چەرخانەش بە هۆی ئەم پارچە هۆنراوەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە، کە لە چەشەی ئەو ڕۆژەمان تێئەگەیەنێ و هەست بە جۆرە بیروباوەڕێکـی ئەدەبیـی ئەکەین کە گێجێکـی ڕومانتیکی فیکریی ئەو ڕۆژەمان ئەخاتەوە بیر و ئەو دەنگانەمان پیشان ئەدا!.

ئەندێشـە لێـرەدا ئەندێشـەیەکی ورد و قووڵە؛ توانیویــە ڕەگەزێکی هــەرە بەهێـز بخاتــە پارچەکەوە، چونکـە ئەگەر بەهۆی ئەندێشـەکەوە نەبێ، ناتوانێ ئەو وەسـپانە کە بۆ گیانلەبەرە، ئەو بیدا بە بێگیانێک و ئەو شـتانە کە گیانلەبەرێک بەرانبەر بە گیانلەبەرێک ئەینوێنێ، ئەم لێرەدا لە بێگیانێکا دروستی بکا!. بەتایبەتی لێکچوون بە جۆرێ دروست ببێ کە بەشـێکی گرنگـی لە هونەرە قسـەییە ئاشـکراییەکان بکەوێتە ناو پارچەکەیـەوە. لـە دروسـتکردنی ئەمانە سـۆزەکە ببێ بە سـۆزێکی توێنەرەوە، هەم خۆی وە هەم گوێگری پێ سەرخۆش بکا!!...

❋❃❋

# ئەحمەدی خانی!

## ١٦٥٠ ـ ١٧٠٦

لـە سـەدەی حەڤدەهەمدا ئەدەبی کـوردی لە لایەن بیـروباوەڕەوە پەردەیەکی تری بەسـەرا کشـا؛ لە لایەکـەوە چیرۆک بە هۆنـراوە کەوتە ناویـەوە، لە لایەکی ترەوە بە شەقڵێکی نەتەوایەتی، گەلێ لە داستانەکانی شـەقڵ کرد. بەربەرەکانێـی بەینی ئێران و عوسـمانییەکان دەسـتێکی بـەرزی هەبوو لە پەیدابوونی ئەم شـەقڵەدا، کە شـەقڵی نەتەوایەتییە؛ چونکـە بەرەنگاربوونی ئەو دووە بە یەک، بـە درێژایی گەلێ ماوە، وە چەوسانەوەی کورد بەهۆی ئەوانەوە و بەهۆی ئەو وڵاتەیەوە کە کەوتبووە ناو مەیدانی شەڕی ئەوانەوە، ئاسۆی هۆشی کوردی لێک کشاندبووەوە!. وێنەی ئەم ئاسۆیـە کەوتبووە دڵی گەلێ لە ئەدیبەکانەوە. یەکێکی وەکوو «ئەحمـەدی خانـی» یەکێک بـوو لەو ئەدیبانـە کە ئەو بیـروباوەڕەی وەرگرتبوو. لە ڕاستیشـدا هەر ئەمە بوو کە بوو بە هۆی داهاتنی پەردەی چیرۆکـی بـە هۆنـراو لـەو سـەردەمانەی دوای سـەردەمەکانی هـەرە سەرەتاییدا!...

ئەمـە لەلایەن پەیدابوونـی بیرەکەوە، لەلایەن ڕێخت و دارشـتنی هۆنراوی ئەو سەردەمەشەوە هەر ئەتوانین هۆنراوەکانی ئەحمەدی خانی بگرین بە دەسـتەوە، بۆ ئەوە دیمەنی ئەدەبی ئەو سـەردەمەی کورد لە ئاوێنەی ئەو هۆنراوانەدا تاپۆکەی بە تەواوی دەرکەوێ.

جا بۆ وێنە، ئەمە پارچەیەکە لە داستانە نایابەکەی «مەم و زین»ـی،

لە کاتێکا کە سەرەتای داستان ئەکاتەوە و ئەڵێ:

[١]ساقی بکە جام ئاسمانی
ڕاحا وەکوو ڕۆحێ جاویدانی
[٢]دا ئەم بکرین دەماغێ جان تەڕ
یەک لەحزە ب ڕاحێ ڕۆح پەروەر
[٣]ساقی تو بڕێژە جامێ مینا
ئاڤا کو دکەت «ضَمیر»ێ بینا
[٤]شاداب بگێڕە قەلبێ مەحزوون
مەدهۆش بگێڕە عەقلێ مەجنوون
[٥]ساقی بکە کاسەیا موجەوهەر
وێ شیرەیێ «مَعْصَر»ا «مُعَطَّر»![١]
[٦]یاقووتێ «مُذاب» و لەعلێ سەییال
وێ دوڕێ خوشاب و خەمرێ «طَلّال»!
[٧]دوڕدانەیێ خوە بڕێژە ناڤێ
یەعنی عەرەقا وەکی گولاڤێ

❀❀

[٨] ئەو ڕەنگ بکەت د نەفسێ تەئسیر
حاسل ببتن د قەلبێ تەشویر!

---

١. [«مُطَهَّر» (نوسخە)].

(٩)یەعنـــی بکەڤیتـــە جانێ شـــەوقەک
حەتتـــا بگەهێتـــە قەلبـــێ زەوقـــەک

❀❀

(١٠) مورغـــی دلـــێ مـــوردە بێتـــە پەرواز
بـــێ پـــەردە ببـــت تەرانـــە پـــەرداز!
(١١)دەم شـــبهەتێ بلبـــلان بنالـــت
گـــەه شـــبهەتێ عەنـــادلان بکالـــت!
(١٢)ئاهان کو ڤەرێ بکەت ســـەحەرگاه
هەمـــوارە دگـــەل نەســـیمێ هەمـــراه

❀❀

(١٣)ســـاقی بدە من شـــەرابێ گولگوون
بـــێ دەنگـــێ دەف و ســـەدایێ قانوون

❀❀

(١٤)تەشویش بچت ژ قەلبێ مەحزوون(١)
دیســـان ببـــم ئـــەز ژ نـــوو دیگەرگوون!

❀❀

(١٥)تەشـــبیهێ نەیـــێ بکـــەم تەرەننوم
تووتی ســـفەت ئـــەز بکـــەم تەکەللوم!

---

١. [«بچن» (نوسخە)].

(١٦)دا کەشـف ببـن ژ مـن کەرامـات
مەشـهوود ببـن ل مـن مەقامـات

**

(١٧)مانەنـدێ ڕووبابـێ بـێ کەمانچـە
دەنـگ بـێ ژ دەفا مـە، بـێ تەپانچە

(١٨) زوهـرە ببهێـت نەوایێ عوششـاق
ڕەققـاس ببـت ل ئەوجێ «نطّـاق»[1]

(١٩) سـازێ دلی کـول ب زیر و بەم بت
سـازندەیێ عیشـقێ زین و مـەم بت!

(٢٠) شـەرحا غەمـێ دل بکەم فەسـانە
زینـێ و مەمـێ بکـەم بەهانـە!

(٢١) نەغمـێ وە ژ پەردەیـێ درینـم
زینـی و مەمـێ ژ نـو ڤەژینـم

**

(٢٢) دەرمـان بکەم ئەز ئـەوان دەوا کم
وان بێمـەدەدان ژ نووڤـە ڕاکـم

(٢٣) دەردێ دلـێ مەمـێ جگـەر ڕێش
زینـا ژ درونـێ دل جەفاکێـش

**

١. [«نەه تاق» (نوسخە)].

(۲٤) مەشهوور بکەم ب تەرز و ئوسلووب
مومتــاز ببــن موحیبــب و مەحبــووب

**

(۲٥) دلبــەر ل مەمــێ بکــن گرینــێ
عاشــق بکەنــن ب دەردێ زینــێ!

**

(۲٦) خەلقێ کو ژ ســینە و دلی ســاف[1]
پاکیــزە سرشــت و ئەهلــێ ئینســاف
(۲۷) «بِالجُملــە» بکن ژ بۆ مە تەحســین
بێــژن کــو ب قەنجــی هاتــە تەدویــن

**

(۲۸) ئــەڤ نامە گــەر خراپە گــەر قەنج
کێشــایە دگــەل وی مە دووســەد رەنج
(۲۹) نەوباوەیــە «طفل» نەورەســیدە[2]
هەرچەنــدی نەهــن قــەوی گوزیــدە

**

۱. [«ژ دل ساف» (نوسخە)].

۲. [«نەوبارەیە» (نوسخە)].

(٣٠) نـــەو روســـتێ حەدیقەیـــێ فوئادە
«مَعصومـــە، عَفیفـــە»، خانـــەزادە!
(٣١) نەوبـــارە ئەگەر شـــیرین ئەگەر تال
مەتبووعـــە ژ رەنگـــێ نەوعـــێ ئەتفـــال
(٣٢) مـــن هێڤـــی هەیـــە ژ ئەهلێ حالان
تەقبیـــح نەکـــن ئەڤـــان تفـــالان
(٣٣) ئـــەڤ میـــوە ئەگـــەر نـــە ئابـــدارە
کرمانجییـــە ئـــەو قـــەدر ل کارە
(٣٤) ئـــەڤ تیفلـــە ئەگـــەر نـــە نازەنینە
نەوبـــارە ب مـــن قـــەوی شـــرینە
(٣٥) ئـــەڤ میـــوە ئەگـــەر نە پـــر لەزیزە
ئـــەڤ تیفلـــە ب مـــن قـــەوی عەزیزە!

**

(٣٦) ئەلفـــاز و مەعانـــی و عیبـــارات
ئینشـــا و مەبانـــی و ئیشـــارات
(٣٧) مەوزووع و مەقاســـید و حیکایەت
مەرمـــووز و مەناقیـــب و دیرایـــەت
(٣٨) ئوسلووب و سیفات و مەعنی و لەفز
ئەســـلا نەکـــرن مەیـــەک ژوان قـــەرز

(۳۹) «بالجملـــه» نەتایجـــێ د فیکـــرن
دووشـــیزە و نەوعـــەرووس و بیکـــرن!
(٤٠) یارەب! مەدە دەستێ خەلقێ ناساز
ڤـــێ شـــاهیدێ دلروبایـــێ تەننـــاز
(٤١) ئومێـــد ئـــەوە ژ ئەهلـــێ عیرفـــان
ئـــەو دێ نەگـــرن ل مـــن چ حەرفان[1]
(٤٢) تەشـــنیع نەكـــن وەكـــی غەیووران
ئیســـلاح بكـــن ل مـــن قوســـووران
(٤٣) ئەســـحابێ «كَمال»ێ پەردە پۆشن
ئەربابـــێ «غَـــرَض» دیـــر خرۆشـــن[2]

❀❀

(٤٤) «إمضا» بكرن ب حوســـنێ ئەلتاف
«إصغا» بكن ئەو ب ســـەمعێ ئینســـاف
(٤٥) ئەســـحابێ غـــەرەز كو گـــوهـ بدێرن
عەیبـــان ب كـــەرەم ل مـــن ڤەشـــێرن

❀❀

(٤٦) سەهوو و غەلەتان نەكن تەعەجوب
تەئویـــل بكـــن ژ بـــۆ تەعەســـسوب

١. [«چوو حەرفان» (نوسخە)].

٢. [«د پر خرۆشن» (نوسخە)].

**گوزارەی هۆنراوەکان یەکە یەکە بە شێوەی سۆرانی:**

(١) ـ مەیگێڕ! بکەرە جامی شینی بە ڕەنگی ئاسمانەوە، شەرابێ وەکوو گیانی هەمیشەیی؛ واتە: وەکوو ڕۆحێکی تیانەچوو بێت!.

(٢) ـ تا ئێمە دەماخی گیان تەڕ بکەین، کاتێک ـ تۆزێک بە شەرابی گیانپەروەرا!..

(٣) ـ مەیگێڕ! تۆ بڕێژەرە بادەی شووشەییەوە، واتە: شەراب؛ چونکە ئاوەدان ئەکاتەوە دەروونی بینا؛ واتە: دەروونی بینا ئاوەدانتر ئەکاتەوە.

(٤) ـ تێراو بکە دڵی بە خەم و خەفەت؛ واتە: پڕ لە خەم و خەفەت. بێهۆش بکە دڵی شێت؛ واتە: دڵێ کە دێوانە بووە!.

(٥) ـ مەیگێڕ! بکەرە پەرداخ و کاسەی گەوهەرینەوە، ئەو شیرەی ـ شیلەی کە گوشراوە و بۆنخۆشە.

(٦) ـ ئەو شیلەیە کە یاقووتی تەواوە و لەعلی ڕەوانە، کە دوڕی تێراو و ئاودار و شەرابی لەزیز و خۆش و جوانە!..

(٧) ـ دانەی دوڕی خۆت بڕێژەرە ناوی؛ واتە: شەرابێک کە وەکوو گوڵاو وایە!.

(٨) ـ ئەو ڕەنگە؛ واتە: ڕەنگی مەیەکە، کار بکا لە نەفس، پەیدا ببێ لە دڵا شەرم و خەجاڵەتی؛ واتە: دڵ بتوێنێتەوە!..

(٩) ـ واتە: بکەوێتە گیان شەوق و ڕووناکییەک، بۆ ئەوە بگاتە دڵ زەوق و خۆشییەک.

(١٠) ـ «مەل»ـێ کە دڵی مردووە، بێتە فڕین، بەبێ پەردە بکەوێتە گۆرانیوتن و ئاوازخوێندن.

(١١) ـ دەم وەکوو بولبولەکان بکەوێتە ناڵەکردن، هەندێ جار وەکوو عەندەلیبان بکەوێتە گاڵە و هەراکردن!. ـعەندەلیب تیرەیەکە لە بولبول ـ.

(١٢) ـ لە بەیانیانا ئاه و ناڵە بەرێ بکا و هەڵڕێژێ، هەموو دەم لەگەڵ بای نەسیمدا ببێ بە هاوڕاز.

(١٣) ـ مەیگێڕ! بدە بە من شەرابی گوڵڕەنگ، بەبێ دەنگی دەف و بەبێ دەنگی قانوون ـقانوون ئەوزارێکی ساز و ئاوازە ـ.

(١٤) ـ پەژارە بڕوا لە دڵی خەمبار، دیسان ببمەوە سەرلەنوێ بە شتێکی‌تر!.

(١٥) ـ وەکوو نەی دەست بکەمەوە بە نەواخوانی، وەکوو تووتی من بکەومەوە قسەکردن.

(١٦) ـ بۆ ئەوە هەموو کەشف و کەڕامەتێک بۆ من دەرکەوێ، دەربکەوێ بۆ من هەموو شوێن و جێگایەک.

(١٧) ـ وەکوو «ڕوباب» بەبێ کەمانچە، دەنگ دەربێت لە دەمی ئێمە بەبێ لێدانی پەنجە!. ـڕوباب ئەوزارێکی ساز و ئاوازە ـ.

(١٨) ئەستیرەی «زوهرە» ببیسێت نەوا و دەنگی حەسپن، کە ئەو دەنگەی بیست بکەوێتە سەماکردن و لەو بەرزییەوە بکەوێتە قسەکردن؛ واتە: زوهرە.

(١٩) ـ سازی دڵی هەموو بە زیر و بەم بێت، سازدەری عەشق «زین» و «مەم» بێت!. ـ«زیر»: دەنگی نزم و ناسک. «بەم»: دەنگی بەرز و زل ـ.

(٢٠) ـ شەرحی خەمی دڵ بکەم بە ئەفسانە و هەڵیڕێژم، زین و

مەم بۆ ئەو شەرح و قسەیە بکەم بە بیانوو!..

(٢١) ـ دەنگێکی وا لە ژێر پەردەوە دەرێنم، کە زین و مەمی سەرلەنوێ پێ بهەژێنم!..

(٢٢) ـ من دەرمان بکەم و ئەوانی پێ تیمار بکەم، ئەو بێیارمەتیدەرانە سەرلەنوێ بیانهێنمەوە ناوەوە.

(٢٣) ـ دەردی دڵی مەمی جگەربریندار، زین کە لە دەروونی دڵیەوە جەفای ئەکێشا.

(٢٤) ـ ئاشکرا و بەناوبانگ بکەم بە شێوە و ئوسلووب، بۆ ئەوە ئیمتیاز پەیدا کەن و جیا ببنەوە خۆشویست و خۆشویستراو ـ مُحِبّ و مَحْبوب ـ.

(٢٥) ـ دڵبەران لەبەر دڵی مەم بکەونە گریان، حەسپەکان بە دەردی زین پێ بکەنن!..

(٢٦) ـ مەردم کە لە سینە و لە دڵی سافەوە، ئەو مەردمە پاک سروشت و ئەهلی ئینسافە.

(٢٧) ـ بە هەموانەوە بۆ ئێمە بکەن ئافەرین، بڵێن: بە جوانی و شیرینی دەستی دایە کۆکردنەو و هۆنینەوەی شت.

(٢٨) ـ ئەم نامەیە ئەگەر خراپە، ئەگەر جوان و چاکە، من لەگەڵ ئەوا دووسەد ڕەنجم کێشاوە.

(٢٩) ـ نۆبەرەیە و منداڵە و تازە پێگەیشتووە، هەرچەندە بەهێز و پەسەندیدە نییە.

(٣٠) ـ تازەپێگەیشتووی باخی دڵە، بێ گوناحە، داوێنپاک و پارێزگار و خانەزاد و لە ماڵدا بووە!.

(٣١) ـ نۆبەرەیە، ئەگەر شیرینە ئەگەر تاڵە، دڵچەسپە لە ڕەنگ و ترۆمی منداڵ؛ واتە: بە ڕەنگ و نەوعی مناڵ.

(٣٢) ـ من هیوادارم لەو کەسانە کە ئەهلی حاڵن و حاڵ ئەزانن، کە بەلایانەوە خراپ نەبێ ئەو شتە ورد و هەرزانانە. («أطْفال» جەمعی «طِفْل»ـە لە عەرەبیدا، وە بە مەعنا شتی ورد و هەرزانە).

(٣٣) ـ ئەو میوەیە ئەگەر ئاوداریش نییە، هەر هی کرمانجە و بە ئەندازەیەک هەر بەکارە.

(٣٤) ـ ئەو مناڵە ئەگەر نازەنینیش نییە، نۆبەرەیە و لەلای من بەهێز و جوانە!.

(٣٥) ـ ئەو میوەیە هەرچەندە زۆر بەتام نییە، ئەو مناڵە لەلای من بەهێز و خۆشەویستە!.

(٣٦) ـ وشەکانی و گوزارەکانی و ڕستەکانی، نووسینەکانی و دارِشتنەکانی و «هێما»کانی.

(٣٧) ـ باسەکان و مەبەستەکان و چیرۆکەکان، هێما و سەرگوزەشتە و ئەو شتانە کە زانینەکانیان ئەگا بە پیاو و ئەیانزانێ.

(٣٨) ـ شێوەکانی و وەسپەکانی و گوزارە و وشەی، بە هیچ جۆر ئێمە هیچمان قەرز نەکردووە.

(٣٩) ـ ئەمانە هەموو بەروبوومی بیرن، کچی عازەب و تازەبووک و «دوت»ـی جوانن!.

(٤٠) ـ خوایە! مەیدەرە دەست مەردمی خراپ و نائەهل، ئەم شتە جوانە دڵڕفێنە بە بێگار («طَنّاز ـ السّاخر: ئەوەیە کە یەکێکی‌تر بە بێگار و سوخرە ئەگرێ).

(٤١) ـ هیـوا ئەوەیـە لە دانا و زانایان، کە لە مـن نەگرن حەرفێک، واتە: ڕەخنەیەک.

(٤٢) ـبـە خراپ نەیەتـە بەرچاویان وەکوو خاوەن غیـرەتان، واتە: وەکـوو چۆن خاوەن غیرەت ئەگەر خراپەیەکـی بەرچاو کەوت، چاوی لێ ئەپۆشێ، کەموکووڕییەکم کە هەیە چاکی بکەن.

(٤٣) ـ ئەوانـەی خـاوەن کەمـاڵ و شـتی تەواون، پەردە ئەپۆشـن، واتە: شـت دائەپۆشـن، ئەوانەی خاوەن کینەن زۆر پڕخورۆشن و شت ئەخەنە ڕوو.

(٤٤) ـ بـە چاکە و پیاوەتی خۆیان مۆری بکەن، گوێی لێ بگرن بە گوێ‌لێگرتنێکی بە ئینسافانە.

(٤٥) ـ خـاوەن کینـەکان گوێی خۆیان ڕاگرن، بـە پیاوەتی خۆیان عەیبەکان لە من بشارنەوە.

(٤٦) ـ سـەهوو بـە هەڵەچـوون ـواتە: هی من ـ نەکـەن بە مایەی سەرسـامی، ئەو شـتەیان کـە بەرچاو ئەکـەوێ، بەرپـەرچـی بدەنەوە، ئەمەش لەبەر دەمار و خزمایەتی کوردایەتی...

❀❀

ئەم پارچـە هۆنراوەیە ئەدەبی کوردی سـەدەی حەڤدەهەم پیشـان ئـەدا کە لەو سـەردەمەدا بە چ جـۆر بەم زمانە هۆنـراو وتراوە و جۆری وتنی هۆنراو لە چ پلەیەکدا بووە؟!..

ئـەم هۆنراوانە باسـی بابەتێک ئەکەن کە داسـتانێکی چیرۆکییە لە پـەردەی هۆنراودا بە شـەقڵێکی نەتەوایەتی، دیمەنیشـی تێدا هەیە، کە

ڕێکخستن و هۆنینەوەی ئەو وشانەیە لە بەرگی هۆنراودا.

بەڵێ لەم هۆنراوانەدا لە گەلێ شـوێنا هەندێ وشە بەرچاو ئەکەوێ کە دیمەنەکەی لە وشـەی کوردی ناچێ و کوردی نییە، بەڵام ئەو جۆرە وشـانە زیان بـە ناوەڕۆکـی ئەدەبەکـە ناگەیەنن، چونکە ئێمە سـەیری ڕێختی ڕسـتەکە و ئەندێشە و سۆز و زنجیرەی بیری دانەرەکە ئەکەین. تەماشـا ئەکەین هەموو ئەم شـتانە لە پارچەکەدا بە جۆرێکی ئاشـکرا شـوێنی خۆیانیان گرتـووە؛ بوونی ئەمانـە ـ بە تایبەتی بـەو کۆمەڵییە ـ ڕاسـتیی ئەدەب و بەرزییەکـی دەرئەخا، جگە لەوە کە ئەو وشـانەش بوون بە ماڵی کورد..

ئـەو ئەندێشـە و سـۆزە کە لـە سـەرەتای ئـەم پارچەیـەوە هەیە تا دواییەکـەی، تەماشـا ئەکەیـن وەکـوو ڕێکیی گوڵـی گەنم بـەو جۆرە بەشوێن یەکا هاتوون.

ئەبینیـن: سـەرەتا داوای ئـەوە ئـەکا کـە مەیگێـڕی بادە، مەیێکی یاقووتیت بداتێ بۆ ئەوە لە هەموو مەینەت و ئازارێک دوور بکەویتەوە و بکەویتە گێتییەکی‌ترەوە!..

تۆ وا ئەچێتە دڵتەوە کە ئەمە مەیێکی ئەرغەوانییە لە بادەی میناییدا کە لە دەستی مەیگێڕێکی تازەی سادەی ئینسانیدا بێ!.. وەیا دیمەنێکی وا دێتـە بەرچاوت کە کۆڕی دەروێشـان بێت، بـە زیکری یاهوو، وەکوو کۆڕی پوورەی هەنگ ئاڵابن لە پیرێکی ڕۆحیی!. ئەو پیرە بە دەستێکی نهێنی شـەرابی خواناسـییان بداتێ بۆ ئەوە لە «مایـە» دوور کەونەوە و بکەونە جەرگەی ئەو ڕۆحیی پەروەرانەوە!...

تـۆ ئەمـە دێتـە بەرچاوت، کەچـی ئەمانـە هیچیان نییـە!. بەڵکوو

ئەو مەیــە، مەیێکە کە کەڵکەڵەی نەتەوایەتییە!.. تا ئەو ســەردەمە ئەو و جگــە لەویش لە گێژاوی چەوســانەوە و پەرێشــانی و دەربەدەریدا ون بووبــوون!. داوا لە مەیگێڕی گەردوون ئەکا کە پیاڵەیە لەو مەیەیان بداتێ بۆ ئەوە لەو عالەمی بێهۆشی لە عالەمی نەتەوایەتییە بچنە دەرەوە و بکەونە کۆڕی سەرخۆشــانی میللییەتەوە، وەکوو بولبولی سەرمەســتی دیاری گوڵ بکەونە نەواخوانی. وەیا وەکوو شمشاڵی دەستی شمشاڵژەنان بکەونە ســۆز و گوداز بڵاوکردنەوە!.. لەمانەوە بکەوێتە ســەر باسکردنی ئەو عەشقە پاکە خاوێنە کە «زین» و «مەم» دنیای دەوری خۆیان پێ پڕ کردبووا!..

لەپاشــا تــۆ وا ئەچێتــە دڵتەوە: کــە ڕەز و باخ و گــوڵ و گوڵزارێکە و هەموو جۆرە دارێکی بەبەر و بێبەری تێدایە و تۆ دەست درێژ ئەکەی بــۆ نۆبەرەی دارە بەبــەرەکان!. کەچــی «خانی» وەکوو تــۆ ئەیزانی، وا ناڵێ!؛ ئەو ئەڵێ:

ئــەو باخە ئــەم نامــە گەوهەرینەیــە، وشــەکانی بــەری باخەکەن، وشــەکان و باخەکــە جگەرگۆشــەیەکی ئەون، ڕەنجێکــی زۆری لەگەڵ کێشــاوە، تا بەخێوی کردوون [و] خســتوونیە بەردەستی تۆوە.. ئەوەشت پێ ئەڵێ: ئەم میوەیە ـکە ئەم ڕستە جوانانەنـ ئەگەر بەلای تۆیشەوە بــەتام و بــۆن نەبێ، بەلای خۆیەوە ئێجگار بەنرخــە و زۆر زۆر بەتامە. هــەر لەبەر ئەمەیــە، بۆیە ئەڵێ: خوایە بیخەرە بەردەســت کەســێ کە نرخــی بزانێ، بیخەرە بەردەســت ئەو کەســانە کە نرخــی نەتەوایەتی و ئەدەبی نەتەوایەتی ئەزانن.

لەمــەوە بۆمــان دەرئەکــەوێ: یەکــەم، ئــەم هۆنراوانــە پەردەیەکــی

ڕۆمانتیـک دەرئەخەن، نەوەک کلاسـیک؛ چونکە بیر و ئەندێشـەکە بەچـاو ئەو ڕۆژە و ئەوەوە تازەیە، نـەوەک کۆن. ئەمجا تێی ئەگەین کە تا چ ئەندازەیەک ئەندێشە و سۆزی تێدا هەیە؛ ئەندێشە و سۆزێکی وا کە بە تەواوی کار ئەکەنە سەر دڵی هەموو کەس. نیازەکەی دەربڕیوە بە زنجیرەیەک کە هیچی لە هیچی نەپچڕاوە.

هـەر کاتـێ ئەم هەموو وەسـپانە لە شـتێکا هاتنە دی، ئەو شـتە بە هەموو گوزارەیەک گوزارەی ئەدەب وەرئەگرێ و ئەبێ بە پێشڕەو و جا با لە هەر زمانێکا بێت.

دیارە ئەمانە هەموو لە پارچەکانی «ئەحمەدی خانی»ـدا هاتوونەتە دی. کـەوا بوو، پارچە هۆنراوەکانـی ئەحمەدی خانی بوون بە ئەدەبێکی بەرزی زمانی کوردی سەدەی حەڤدەهەم.

# حەماغای دەربەنفەقرە[1]

کە کەوتە سەدەی هەژدەهەم ئەو ئەدەبە کوردییە کە تا ئەو سەردەمە هاتبوو لە باری شێوە و ڕێختەوە، بەپێی پلەکانی چەرخ ئەوانیش بەو پلەیەدا هاتبوونە خوارەوە.

کاتێ کە کەوتە ئەو سەدەیە، بەرگی ئەدەبی کوردی وەکوو گێجەکانی پێشوو ڕەنگێکی‌تری بەسەرا هات و لە گەلێ لاوە گۆڕا؛ وەسپ بوو بە وەسپێکی‌تر، لاوانەوە و پیاهەڵوتن بوو بە شتێکی‌تر، سۆز بە تەواوی تێکڵاو بوو لەگەڵ ئەدەبەکەدا، هونەری هۆنراو زیاتر بتەو بووەوە؛ وای لێ هات زەوێنە جۆرە شتێکی دروست ئەکرد بۆ ئەوە هۆنەر هەستی خۆی دەربڕێ.

جا وێنەیەک لە هۆنراوی ئەدەبیی ئەو ڕۆژە چامە بەرزەکەی «حەماغای دەربەنفەقرە»یە کە سۆزە کاریگەرەکەی بەرانبەر بە هاوسەری ژیانی دەرئەبڕێ و ئەڵێ:

(١) گڵکۆی تازەی لەیل، گڵکۆی تازەی لەیل!
ئارۆ شیم وە سەیر گڵکۆی تازەی لەیل
(٢) نە پایەی مەزار ئەو لەیل پڕ مەیل
جە دیدەم واران ئەسرینان چون سەیل
(٣) شیم وە سەرینش بەو دڵەی پڕ جۆش

---

١. حەماغا لە سالانی «١٧٣٢ ـ ١٧٦٥» ژیاوە.

سـەنگ مـەزارش گرتـم نـە ئاغـۆش!

(٤) واتم: ئەی دڵسـۆز قەیس پـۆس نە کۆڵ
موبارەکـت بـۆ یانـەی تەنیـای چـۆڵ

(٥) گـرەی نـار عەشـق دووری بـاڵای تـۆ
کارێ پێـم کـەردەن نەونەمـام نـۆ[1]

(٦) نـە بـە ڕۆژ ئارام، نـە شـەو خاومەن[2]
چـون چەمگلکـەران گلاراومـەن!

(٧) جەوسـاوە گەردش ئەو چەرخ چەپگەرد
مـن و تـۆ وە زۆر جـە هـەم جیـا کـەرد!

(٨) تۆ بـەردەن وە خاک سـیای تەنگ و تار
مـن مـام پـەی عـەزاب جەفـای ڕۆزگار

(٩) هەر ڕۆ چون مەجنوون خاتر جە غەم کەیل
هـەر لەیل‌لەیلمەن جە هـەردەی دوجەیل!

(١٠) شـەوان تـا وە ڕۆ شـین و ڕۆڕۆمـەن
گشـت پەژارەیـی تەنیایـی تۆمـەن!

(١١) سـتارەم شـوومەن، بەختـم لێویـان
چـون ئاهـووی تەنیـا سـەر لێم شـێویان!

١. «ئەی نەمامی نەو» [«نەونەمام نۆ»] (نوسخە)..

٢. «نە وە ڕۆژ» (نوسخە).

(١٢) یــە حاڵــی منــەن شــای وەفــاداران
هەمــڕازی تــۆ کێــن ســوب تــا ئێــواران؟!
(١٣) لەجیاتــی باهــووی قەیــس غەمگینت
کام ســەنگ ســیا شــەو جــە باڵینــت؟!
(١٤) ســا پەی چێش سـۆمای دیدەم تار نەبۆ
زیندەگــی جــە لام زەهــر مــار نەبــۆ؟!
(١٥) ئــەو دیــدەی مەخمــوور ئاهووبێزی تۆ
ئــەو زوڵــف قەتــران شــەڕەنگێزی تــۆ[1]
(١٦) وە مەودای چل‌چنــگ تۆ تاتات مەکەرد
ئێســتە پەشــێوەن چون ڕەیحانــەی هەرد!
(١٧) ئەلحاســڵ هەرچەند شــین و زاریم کەرد
نــە پــای قەبــر لەیــل بێقەراریــم کــەرد
(١٨) نــە دای جەوابــم، نــە زەڕە دەنگ کەرد
ئەمجــا بڵێســەم وە گــەردوون ویــەرد[2]
(١٩) دیســان هەم جــە نۆ واتم: ئەی دڵســۆز
حەکیــم زامــان دەردی مەجنــوون ســۆز

١. «شەوئەنگێزی تۆ» (نوسخە)..

٢. «چون گەردوون ویەرد» (نوسخە)..

(٢٠) هـام نـە سـەرینت زارزار مەناڵـم[1]
خـاک یانـەی نـۆت وە چـەم مەماڵـم![2]

(٢١) پەی چێش مەیل وێم جە لات کەم بیەن؟
مەر عەهـد و پەیمـان جە یادت شـیەن؟!

(٢٢) دیـم دەنگـیێ ئامـا نـە تـۆی خاکـەوە
نـەو یانـەی تاریـک حەسـرەت ناکـەوە

(٢٣) ئامـا نـە گۆشـم چـون ڕاز جـاران
واتـش: ئـەی مەجنـوون وێڵـی کۆسـاران

(٢٤) خـاک، وە دەسـت زۆر زنجیرم کەردەن
یـادی هەمـڕازان جـە یـادم بـەردەن!

(٢٥) هێندە خاک و سەنگ وە جەستەم بارەن
نە جاگـەی جـواب، نـە ڕای گوفتـارەن!!

❀❀

## گوزارەی هۆنراوەکان یەکەیەکە:

(١) ـ کۆمەڵـە گڵـی تازەی لەیـل ـئەمە ئیزافەی مەوسـووفە بۆ لای سـیفەت ـ ئیمرۆ چووم بۆ سەیری کۆمەڵە گڵی تازەی لەیل؛ ئەو کۆمەڵە گڵە کە لەسـەر گۆڕەکەی کۆمەڵ کراوە. دیارە تازە نێژراوە. ئەمە شـێوەی

---

١. «مەنالام» (نوسخە)..

٢. «مەمالام» (نوسخە).

سـۆزی هۆنەرانی پێشـووە، کە نیوەی یەکەمی هۆنراوی سەرەتای چامە ئەکەن بە دوو بڕگەی وەکوو یەک، بۆ ئەڵها و پیشـاندانی زیادە سۆز لە وەسپەکەدا.

(٢) ـ لـە پای مـەزار ـکـە گۆڕەکەیـەـ؛ واتە: لـەلای پای ئەو لەیلی پڕ مەیلەوە وەسـتام، لە چاوم بارانی فرمێسـک باری وەکوو لافاو؛ واتە: سەرەتا چووم لە خوار گۆڕەکەیەوە ـکە لای پێیەتی و بۆ ئەوە چاوی لێم بێـ وەستام و دەستم کرد بە گریان!.

(٣) ـ چوومە لای سـەریەوە بەو دڵەمەوە کە پڕی بوو لە گڕ و کڵپە، بەردی گۆڕەکەیم گرتە باوەش.

(٤) ـ وتم: ئەی دڵسۆزی قەیسی پێست لە کۆڵ ـکە منمـ. وەیا: ئەی دڵسۆزێکم کەوا وەکوو مەجنوون پێستت لە کۆڵ کردووە و چۆڵگەردیت کردووە بە پیشە!. پیرۆزت بێ خانووی تەنیای چۆڵ ـکە گۆڕەکەتەـ.

(٥) گڕ و کڵپەی ئاگری عەشـقی دووری باڵای تۆ، کارێکی وای پێ کردم ئەی تازە نەمامی تازە!؛ واتە: تازە بووە بە نەمامی زەوی.

(٦) ـ نە بە ڕۆژ ئارام و وەسـتانم هەیە، وە نە بە شـەو خەوم هەیە، وەکوو ئەو کەسانە کە چاویان گلی تێدایە و ژان ئەکا، گلاراومە!.

(٧) ـ لـەو وەختەوە گەڕانی ئەو چەرخی چەپگەردە، من و تۆی لە یەک جیا کردەوە.

(٨) تـۆی بردە ناو خاکی ڕەشـی تەنگ و تاریکـەوە، من مامەوە بۆ جەزرەبە و چەوسانەوەی ڕۆژگار!.

(٩) ـ هەر ڕۆژ ـواتە: هەموو ڕۆژـ وەکوو مەجنوون دڵم پڕە لە خەم،

هەر هاواری «لەیل، لەیل»ـمە لە کێو و زوورگی[1] دوجەیل! ـ دوجەیل کەوتۆتە خاکی عێراق و لە دەوروبەری سامەڕەدایە.ـ.

(١٠) شەوگەل تا بە ڕۆژ ـ واتە: هەر لە سەرێوارەوە تا بەیانی ـ گریان و شین و ڕۆڕۆ ئەکەم، ئەو گریان و ڕۆرۆیەشم هەمووی بۆ ئەوەیە: کە دڵگران و پەژارەداگرتووی تەنیایی تۆم لەو شوێنە چۆڵەدا!..

(١١) ـ ئەستێرەم شووم و بەدیومنە، بەختم شێت بووە و «فێ»ـی لێ هاتووە، وەکوو ئاهووی لە «ڕەوە»[2] دابڕاو سەرم لێ تێک چووە!..

(١٢) ـ ئەمە سەمەرەی منە ئەی شای خاوەن وەفاکان! ئایا هاودەمی تۆ کێیە هەر لە بەیانییەوە تا ئێواران؟!.

(١٣) ـ لەباتی باسکی ئەم قەیسی دڵ بەپەژارەیەت، کام بەردی ڕەش بە شەو وا لە ژێر سەرتا؟!.

(١٤) ـ سا ئیتر بۆچی بینایی و ڕووناکیی چاوم تاریک نەبێ؟. ژیان ئیتر لەلام نەبێ بە ژاری مار!!.

(١٥) ـ ئەو چاوی بە خوماری وەک ئاهووی تۆ ـ مەخموور درکەیە[3] لە چاوی جوان و نەرم.ـ «بێز» لە بنەڕەتا بە مانا لێدانە، بەڵام لێرەدا مەبەست لێکچوونە، چاوی ئاسک جوانە؛ واتە: ئەو چاوەت کە وەکوو چاوی ئاسک وایە لە جوانیدا. ئەو زوڵفی وەک قەترانی شەڕهەڵگیرسێنەری تۆ، یا: وەکوو شەوهێنەر. «قەتران» شیلەیەکی

---

١. [زوورگ: کەنەك، هەرد و هەڵەت، زرگ، زەوی کەندەڵان و پڕ کەندوکۆسپ، زەوییەکی بەردەڵان کە هەوراز و نشێوی زۆر بێ].

٢. [ڕەوە: گەلە، ڕان].

٣. [درکە: کینایە، وشەیەک کە دوو یا چەند واتای دوور و نزیک بگەیەنێت].

ڕەشی چەورە لە هەندە دارێکی وەکوو سنەوبەر وەرئەگیرێ.

(١٦) ـ بە نووکی دەست و پەنجە، تۆ هەودا هەودات ئەکردەوە؛ واتە: زوڵفەکەت، ئێستە شێواو و تێک چووە وەکوو ڕەیحانەی ئاو لێبڕاو کە لە کێودا ئەبێ. «چل» بە مانا «دەست»ـە. «چنگ نەوەک «چەنگ» بەمانا «پەنجە»یە.

(١٧) ـ بە کورتی: هەرچەندە شین و گریانم کرد، لەلای خوارووی گۆڕی لەیلەوە ئەملاوئەولام کرد.

(١٨) نە وەڵامی دامەوە، نە هیچ دەنگی کرد. ئەمجا بڵێسەی هەناسەم وەکوو گەردوون ڕۆیشت، وەیا: گەیشتە گەردوون، کە ئاسمانە.

(١٩) ـ دیسان سەرلەنوێ وتم: ئەی دڵسۆزی من، پزیشکی برینانی دەردی وەکوو مەجنوون سووتاو ـکە خۆیە!ـ

(٢٠) ئەوا وام لەسەر سەرینتەوە؛ واتە: لەسەر سەرتەوە، زۆر بە خراپی و بە سۆز ئەگریم و ئەناڵێنم، خاکی خانووی تازەت ئەماڵم بە چاوما!..

(٢١) ـ بۆچی مەیلی من لە لات کەم بووە؟ مەگەر عەهد و پەیمانت لەبیر چووەتەوە؟!. «شیەن» واتە: ڕوەیشتووە.

(٢٢) ـ سەیرم کرد دەنگێک هات لەناو خاکەکەوە! لەو خانووی تاریکی بە ئاه و حەسرەتەوە.

(٢٣) ـ هاتە گوێم وەکوو باسوخواسی جاران، وتی: ئەی مەجنوونی وێڵی کۆساران.

(٢٤) ـ خاک، بە دەستی زۆر زنجیری کردووم، یادی هاوسەرانی لەبیر بردوومەتەوە!.

(٢٥) ئەوەندە خۆڵ و بەرد بار بووە لەسەر لەشم، نە شوێنی وەڵام و نە ڕێی قسەکردنم هەیە؛ واتە: نە ئەتوانم جوابت بدەمەوە، وە نە ئەشتوانم قسەت لەگەڵ بکەم!...

❀❀

لە پاش وردبوونەوە لە هۆنراوەکان، وە لێکدانەوەی گوزارەکانیان، بۆمان دەرئەکەوێ: کە لە هۆنراوەکانا هەموو جۆرە ڕەگەزێکی ئەدەبییان تێدا هەیە، وەیا بێژین: ڕاستیی سۆز، جوانیی بیر، بەلاغەتی شێوە، ڕێکیی ڕستە، هەمووی تێدا هەیە.

ئەم پارچەیە شێوەی ئەدەبی کوردی سەردەمی سەدەی هەژدەهەم ئەگێڕێتەوە. بەڵێ! شێوە و چەشەی ئەدەبێکی لاوانەوە ئەگێڕێتەوە، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بە تەواوی هەچ ئەدەبێک لەو سەردەمەدا هەبووە، هەمووی لاوانەوە بووە؛ وەیا بڵێین: ئەدەبی کوردی هەمووی بۆ لاوانەوە بووە، ئەگەر ئەمە بێ، نرخێکی تەواو نانرێ بە ئەدەبەکدا!.

بەڵکوو مەبەست ئەوەیە: کە لەم پارچەیەدا هەموو جۆرە ڕەگەزێک هەیە و ئێمە ئەمانەوێ ڕەگەزەکانمان بۆ دەرکەوێ، کە لە دەرکەوتنی ئەوانا نرخی ئەدەبەکە دەرئەکەوێ. کاتێ ئەم شتانە لەما دەرکەوت، ئەزانرێ ئەدەبی ئەو سەردەمە چ پایەیەکی هەبووە، چونکە خاوەنی ئەم پارچەیەش یەکێک بووە لە هۆنەرانی ئەو سەردەمە، چ جۆرە بیروباوەڕێک لەوانا هەبووە، لەمیشا هەر ئەو بیروباوەڕە ئەدەبییە هەبووە.

جارێ مەبەستی هۆنەر ئەوە بووە: کە ڕازونیازێک لەگەڵ یەکێکیترا

بکا، کە ئەو یەکە ماوەیەکی درێژ هاوسەری ژیانی بووە، ئێستە لێی جیا بووەتەوە!. بە جۆرێکیش ئەیەوێ بیکا کە هەموو سۆزێک ببزوێنێ. دەرگای ئەم ڕازونیازەی کردووەتەوە و سۆز و کڵپەی دەروونی خۆی دەربڕیوە؛ ئەمانەی دەربڕیوە لە شێوەیەکدا کە بە تەواوی ئەدەبەکەی تیایا جێ کردۆتەوە و گەیاندوویەتە پایەیەک کە بووە بە هۆنەرێکی تەواو.

ئەمجا ڕێخت و دارشتنی ڕستەکەی بە جۆرێکە، کە هەر وشەیەکی لە شوێنی خۆیا داناوە و چ وشەیەک داوای چی ئەکا ئەو مافەی داوەتێ، وشەی لانەداوە لە گوزارە، بەڵکوو گەلێ جار -بێجگە لە مەزهەبی ڕەمزیش- گوزارە لە وشەکە زۆرترە!. وەکوو ئەمانە هەیە، ئەو بیرە کە لە سەرەتای باسەکەیەوە دەستی پێ ئەکا تا دوایی چامەکە بیرەکە بە ڕیز دێتە خوارەوە و لێک ناپچڕێ.

لەبارەی بابەتەوە، هەر ئەو بابەتەیە کە هەرکەسە لە خۆشەویستێکی دوور بکەوێتەوە، بکەوێتە خولیای، ئەوە کە چۆنیەتی ئەو دوورکەوتنەوەیە لە یەکێکی‌تر تێی بگەیەنێ، بەڵام دوور نییە نەتوانێ لە دیمەنێکی وادا کەسەکەی پێ تێ‌بگەیەنێ!!...

ئەو دیمەنانە کە لە «گڵکۆی تازە»، «دڵسۆزی قەیس»، «ئارامی ڕۆژ»، «خاکی تەنگ و تار»، «لەیل‌لەیل لە کێوی دوجەیل»، شوومیی ئەستێرە و شێتیی بەخت، «ئاهووبێز»، «چل چنگ»دا هەن. وەیا گوزارشتدانەوە بە «دڵسۆز، یانەی تاریک بۆ گۆڕ، دەستی زۆر بۆ خاک» و شتی‌تریش، ئەم دیمەنانە بەم جۆرە هەموو کەس ناتوانێ پیشانی بدا!..

کە ئەمانە زانران، ئەزانین سـۆز و بیر و ئەندێشە و ڕستە هەموو لەم پارچە ئەدەبییەدا کۆ بوونەتەوە، لەگەڵ ڕومانتیکی فیکرەدا و کلاسیکی ڕەوشتدا..

مایەوە سەر ئەوە: کە لە هەندێ شوێنی ئەم پارچەیەدا شتی وا هەیە، سـا یا لەبەر نووسـینەوەی بووە بە هەڵە، وەیا لەبەر تێگەیشتنی هەندێ لـە خوێنــەرەکان بووە بەو بارەدا، شـتەکە بە جۆرێکی‌تر ڕوەیشـتووە و کەوتۆتە بەرچاو، ئێمــەش ئەمانەوێ بزانین چ بەڵگەیەک هەیە بۆ ئەوە کە دروستییەکەی بدۆزینەوە؟..

دیارە لێکۆڵینەوە لەم باسە بۆ تەنها ئەوە نییە کە ئێمە هەڵە و ڕاستیی ئـەم چامەیە لێـک بکەینەوە، بەڵکوو زۆرتر بـۆ ئەوەیە کە بە هۆی ئەم دەسـتوورەوە ئەتوانیـن هەڵە و دروسـتیی هەمـوو پارچەیەکی ئەدەبیی لێک جیا بکەینەوە.

❀❀

ئەوانەی کە بەتایبەتی لەم چامەیەدا هەن:

«واتـم ئەی دڵسـۆز قەیس پۆس نە کـۆڵ» وە «نەونەمام نەو»، «ئەو زوڵـف قەتران شــەڕەنگێزی تـۆ»، «وە مەودای چل‌چنــگ»، «نە دای جوابم»، «هام نە سەرینت زارزار مەناڵم» ئەمانەن.

«دڵسۆز قەیس پۆس نە کۆڵ» هەڵئەگرێ «قەیس» بەدەلی «دڵسۆز» بـێ؛ واتــە: ئەی دڵسـۆزێ کە وەکوو قەیسـی پێسـت لەکـۆڵ وایتە، لە تەنیاییــی و لە تەرککردنی دنیاتا. وە هەڵیـش ئەگرێ «ئیزافە» بێ؛ واتە: ئەی دڵسۆزی قەیسی پێست لەکۆڵ ـکە منم- وە هەموو ڕستەکە سیفەتە

لەبۆ مەوسووفێک، کە ئەو مەوسووفە نەوتراوە و وشەی «من»ـە.

ئەمە هەردووکی هەڵئەگرێ، بەڵام کە سەیری شوێنێکی تری چامەکە ئەکەین، ڕاست ئەیبڕێ بەسەر گوزارەی دووەما. وەکوو لە هۆنراوی ژمارە «١٣»دا کە ئەڵێ:

**لەجیاتــی باهــووی قەیــس غەمگینت**
**کام ســەنگ ســیا شــەو جــە باڵینت؟**

کە لێرەدا «قەیس» مەبەستی خۆیەتی. کەوابوو، ئەم مەبەستبوونەی لێرەدا ساغی ئەکاتەوە کە لە هۆنراوی چوارەمیشدا هەر مەبەستی خۆیەتی. ئیتر «قەیس» بەدەل نەبوو، بەڵکوو ئیزافە بوو، وە هۆنراوەکە ئەبێ لە گوزارەدا «واتم ئەی دڵسۆزی قەیسی پۆس نە کۆڵ» بێ..

لە نیوەی دووەمی هۆنراوی پێنجەمدا ئەڵێ: «نەونەمام نەو» وەیا «ئەی نەمامی نەو» هەردووکی ئەگونجێ بەڵام ڕاستی ئەوەیە کە ئەبێ: «ئەی نەمامی نەو» بێ و ڕووی تێ ئەکا بە وشەی «ئەی» کە بۆ ئاگادارکردنەوەیە؛ بۆیەش ئەبێ ئەمە بێ، چونکە «نەونەمام نەو» دووپاتەیەک لە وشەی «نەو»دا هەیە، کە «نەو [- نۆ]» بە مانا تازەیە. لەم دووپاتەکردنەوەشدا هیچ زیادە گوزارەیەک نابەخشێ، شتێکیش کە گوزارەی زیادە نەبەخشێ و پێویستی هۆنراویش نەبوو، ئەو شتە ئەبێ ڕاست نەبێ...

لە هۆنراوی پانزەدا ئەڵێ: «ئەو زوڵف قەتران شەڕەنگێزی تۆ» ئەگونجێ «شەڕەنگێز» بێ ئەگونجێ «شەوەنگێز» بێ؛ واتە: کە تاریک و ڕەشە. وە «شەڕ» بێ، چونکە هەڵگیرساندن لە چەشەی کوردیدا زۆرتر بۆ شەڕە!. وە دیسان «ئەنگێز» لەگەڵ شەڕدا زۆرتر ئەوترێ،

نەوەک لەگەڵ شـەودا. کەوابوو، ئەبێ دروستییەکەی «شەڕەنگێز» بێ نەوەک «شەوەنگێز».

لـە هۆنـراوی شـانزەدا ئەڵـێ: «وە مـەودای چل چنـگ، تۆ تاتات مەکـەرد» لـە کوردیدا «چنگ» بـۆ پەنجەش ئەوترێ و بـۆ چنگاڵیش ئەوتـرێ، کـە چرنووکـی پەلـەوەرە؛ هەروەهـا بـۆ ئـەم هـی پەلـەوەرە «چەنگ»یش ئەوترێ.

کە دەست هەبوو پەنجە لەگەڵیا ڕێ ئەکەوێ، نەوەک چەنگۆڵەیەک کـە تایبەتـی باڵندەیـە!. ئەمجـا کە بـوو بە «لەوچـوون» بۆ دەسـت و مەبەسـتیش پێـی «شـانە»یە، ددانـەی شـانە ئەبێ ڕاسـت و ڕێک بـێ، نەوەک چەوتوچەوێـڵ وەکوو چەنگۆڵەی پەلـەوەر!.. کەوابوو، مەبەسـتی هۆنراوەکـە ئەوەیە: «ئـەو زوڵفەی کە بەو دەسـت و پەنجە بەشـانەبووەت، بۆی ڕێکت ئەخسـت و شـانەت ئەکرد، ئێستە وا بەو جۆرە پەشێواوە و تێک چووە!».

لە هۆنراوی هەژدەدا کە ئەڵێ: «نە دای جوابم» ئەگونجێ مەبەست ئـەوە بێ: کە تۆ وەڵامت نەدامەوە؛ واتە: نەتدا جوابم. وە وشـەی «نە» نەفیە و چووەتە سـەر کەسـی دووەم. وە ئەگونجێ ئەوە بێ کە نەفیەکە چووبێتـە سـەر کەسـی سـێیەم، واتە: ئـەو وەڵامـی نەدامـەوە. ئەمە هەردووکی ئەگونجێ؛ بەڵام مەبەسـتی ڕاستی گوزارەی دووەمە، چونکە هەر لە بن دەستیەوە ئەڵێ: «نە زەڕە دەنگ کەرد». ئەمە لێرەدا دانی نا بە کەسی سێیەمدا..

لە هۆنراوی بیسـتەمدا کە ئەڵێ: «هام نە سـەرینت زارزار مەناڵم». لە هەندێ ڕوونووسدا لەباتی «مەناڵم»، «مەناڵام» نووسراوەتەوە. لێرەدا

«مەناڵـم» دروستەکەیەتی، چونکـە «مەناڵـم» بۆ ئێستەیە و ئەویش ئێستە لە ژوور سـەریەوەیە، «مەناڵام» بـۆ ڕابووردووە!. لـە کاتێکا ئەو قسـە لە ئێستەوە ئەکا!. هەروەها «مەماڵم» و «مەماڵام» دروستەکەی «مەماڵم»ـە.

# نالّی

## ١٧٩٧ - ١٨٥٥

ناوچەی چەرخی هەژدەهەم بەرانبەر بە ئەدەبی کوردی ناوچەیەکی فراوانی بووە، لە گەڵێ لاوە ئەدەب کەوتۆتە ناوەوە، بەتایبەتی لە وڵاتی «بابان»ـدا تیشکێکی تری ڕووناکی هەبووە، زمانی کوردی لە بارەی هۆنراوەوە برەوێکی تری پەیدا کردووە. وەکوو چۆن ئەگونجێ لەو وڵاتەشا بەربەرەکانێ کردنی ژێر پەردەی بابانەکان لەگەڵ حکومەتی عوسمانیدا دەستێکی بەهێزی هەبووبێ بۆ ئەم برەوی ئەدەبی کوردییە!. ئەوەندە هەیە، وەکوو سەیری لاپەڕەی ئەدەبی ئەو ڕۆژە ئەکەین، بۆمان دەرئەکەوێ: کە کلاسیک گێجێکی بەهێزی بووە لەو ئەدەبی کوردییەدا!..

جا بۆ نموونە، یەکێ لە هۆنەرانی ئەو سەردەمە کە «نالّی»ـیە بەرهەمێکی ئەهێنینەوە بۆ ئەو چەشنە ئەدەبە وەسپییە کە لە کاتێکا ئەڵێ:

(١) تەشریفی نەوبەهارە کە عالەم دەکا نوێ
دڵ چونکە میسلی غونچەیە بۆیە دەپشکوێ

(٢) عەرعەر عەدیلی قەددیە، یەعنی بەرانبەرن
سونبول شەبیهی زوڵفییە، فەرقی نییە موێ!

(٣) لەم وەعدە خۆشە وا گوڵ و گوڵچیهرە تێکەڵن
یەکڕەنگ و «مُتَّحِد» ئەمما بە تەن جوێ

**(٤) لـەم خۆشـییە کـە هێزمـی مەتبـەخ ڕوایەوە**
**مـاوم عەجـەب لە دیـدەی سـۆفی کە نـاڕوێ!**
**(٥) تیپی شـکۆفە خەیمەی داوە لـە هەر تەرەف؟**
**یـا شـاهی نەوبەهـارە هەڵـی داوە هـوردوێ؟!**
**(٦) دنیا، کـە گوڵگوڵی بووە قوربـان؛ ئەتۆش وەرە**
**تالـب بە گوڵ بە، قەیدی چییە گـوڵ، گوڵی بوێ!**
**(٧) بولبـول کـە گەرمـی نەغمەیە ئـاور دەکاتەوە**
**غونچـە حەزینـە! جـەرگ و دڵـی بـۆ دەکا توێ**
**(٨) «ناڵـی»! زبانەکـەی تەڕ و پاراوی سۆسـەنت**
**حەیرانـی چـاوی نەرگسـە، وەک لاڵـە نـادوێ!**

✾✾

## گوزارەی هۆنراوەکان یەکەیەکە:

(١) ـ فەڕی بەهاری تازەیە کە گەردوون تازە ئەکاتەوە، دڵ لەبەر ئەوە کە وەکوو گوڵۆکە بۆیە ئەپشکوێ و لێک ئەبێتەوە.

(٢) ـ داری عەڕعەڕ هاوباڵایەتی؛ واتە: بە ئەندازەی یەکن، سونبول ـکە گوڵی گەنمەـ وەکوو زوڵفی وایە لە ڕێکیدا، بە ئەندازەی موویەک هیچ جیاییان نییە.

(٣) ـ لەم وەختە خۆشەی بەهارەدا کە گوڵ و گوڵڕوومەت تێکڵاون؛ واتە: گوڵی باخ و گوڵی ڕوویەک ـکە یارەـ یەک ڕەنگیان هەیە و بەڵکوو

هەر یەکن، بەڵام بە لەش جیان.

(٤) ـ بزانە چەند خۆشە کە دار و چیلکەی سەرتەنوور ڕوایەوە و «وەچی» دەرکردەوە، سەرم لەوە سڕ ماوە: کە چۆن چاوی سۆفی ناڕوێتەوە؟!. واتە: کە ئەم دیمەنە ئەبینێ چۆن گەش نابێتەوە و فرمێسکی خوێنین ناڕێژێ؟!...

(٥) ـ دەستەی گوڵۆکە لە هەموو لایە چادری هەڵداوە؟ یا پادشای تازە بەهارە کەوا دەواری بۆ لەشکری خۆی هەڵداوە؟!..

(٦) ـ گێتی کە لەم بەهارەدا گوڵگوڵی و ڕەنگاوڕەنگ بووە، دەسا قوربان تۆیش وەرە؛ وەرە تۆیش گوڵت بوێ، قەیدی چییە با گوڵ گوڵی بوێ؛ واتە: گوڵێکی وەکوو تۆ گوڵی باخی بەهاری بوێ.

(٧) ـ بولبوڵ کە سەرگەرمی نەوایە و ئاگر ئەکاتەوە، خونچە خەمبارە و دڵی بۆ ئەکاتەوە بۆ ئەوە بۆنی بکا؛ واتە: بۆی ئەپشکوێتەوە.

(٨) ـ «نالی» ئەو زمانە تەڕ و پاراوەت کە ئەڵێی سۆسەنە، لەگەڵ ئەوەشا سەراسیمەی چاوی گەشی نەرگسە، بۆیە لاڵ بووە و هیچ قسەی پێ ناکرێ.

❋❋

ئەمە پارچە هۆنراوێکی کوردی سەدەی هەژدەهەمە. بەڵێ لە ڕێچکەدا ڕێچکەی کلاسیکی گرتووە، بەو گوزارەیە کە بە تەواوی پابەندی عەرووز و سەروایە، ماندووبوونێکی تەواوی تێدا هەیە بۆ خۆخەریککردن بە ڕازاندنەوەی وشەوە، وە بەڵکوو لە چەشەی هەڵبەسەکەدا وا دەرئەکەوێ کە لە پێشا سەرواکان دانراون پاشان ڕێختی هۆنراوی خراوەتە پاڵ!. بەڵام ئەگەر گوزارەی کلاسیک پەیڕەوی و شوێنپێی یەکێکی‌تر هەڵگرتن بێ و ئەو شتە ببێ بە سەرمەشق بۆ

کەسانی‌تر، بەم گوزارەیە لەم هۆنراوانـەدا، وەیا لە هۆنراوەکانی یەکێکی وەکوو «نالی»ـدا کلاسـیک بەرچاو ناکەوێ، چونکـە دانانی ئەم جۆرە هۆنراوانە ـبەتایبەتی لە شـێوەی موکریدا- نالی خۆی ڕەنگی ڕشـتووە و مەردمی‌تری کورد شـوێنپێی ئەویان هەڵگرتووە، وەنەبێ ئەو کەوتبێتە شوێن یەکێکی‌کە و چاوی لە یەکێکی‌تر بڕیبێ.

خۆ ئەگەر بڵێین: خۆبەستەنەوە[یە] بە زانیاریی عەرووز و سەرواوە، ئەمە ئەگونجێ، بەڵام وەنەبێ هەموو دەمێکیش هەر شـتێک عەرووز و سـەروای تێدا هەبوو، ئەبێ کلاسـیک بێ!. لە هۆنراوی نوێدا سەروا بەبێ شـک هەیە، لەباتی عەرووزیـش ژمارەی پەنجە هەیە ـکە ئەمە وەنەبێ بەرانبەر بە هۆنراو لە عەرووز کەمتر بێ!ـ.

کەوابـوو، پەیڕەوییەک کە لە هۆنراوی «نالی»ـدا بەرچاو ئەکەوێ، ئەوەیە: کە وەکوو هۆنەرانی غەیری کوردی ئەو سـەردەمە و پێشتریش زۆر بـە سـۆز پابەندی عەرووز و سـەروا بوو، وە فرە عەزیەتی کێشـاوە بە هۆنراوەوە!. بەڵام ئەگەر بێینە سـەر باری ڕێخت و دارشـتنی ڕسـتە بـە زمانی کـوردی و هێنانـی گوزارە و خسـتنە ناو چوارچێوەی وشـەی کوردییەوە، «نالی» ئەبێ بە یەکێ لەو کەسانە کە پێشڕەو بووە لە زمانی کوردیدا، نەوەک شوێنکەوتوو، چونکە:

ئـەو بابەتێکی لە شـوێنێکی وەکـوو ئـەم هەڵبەسـەیەدا گرتووە بە دەسـتەوە کە باسـی بەهارە، دیمەنێکیشـی هەیە کە دارشتنی وشەکانە.. بەڵـێ! هەمـوو کەس ئەتوانێ باسـی بەهار بـکا و بڵێ: بەهـار جوانە و ئێلاخـی گـوڵ و گوڵزارە، ناڵـەی بولبول بەسـەر پەڕەی گوڵدا بەسـۆزە، ڕوومەتـی نازاداران و دیمەنـی گـولالان ڕووبەڕووی یەک ئەوەسـتن.

ئەمانە و شتیتریش لە باسی بەهارا ئەیژن، بەڵام هەموو کەس ناتوانێ ئەو گوزارانە بخاتە ناو دڵی ئەو وشانەوە و بەو جۆرە وەکوو زێڕی دارڕژاو دایانبڕێژێ!!.

خونچە بۆچی هەر لە بەهارانا ئەپشکوێ؟! چونکە لە جگە لە بەهارا «ئـاو» کـە ژینیەتی و «با» کە خۆراکیەتی، لێـی زەوت کراوە؛ لە بەهارا دەسـتی بەخشـندەیی سروشت درێژ ئەبێ، سـەردەمی جەور بەسەر ئەچـێ، ژیانی نوێ پەیدا ئەبێ و خونچە ئەپشـکوێ. دڵیش بەو جۆرە دەسـتی جەوری لەسـەر نامێنێ، ئەگەشـێتەوە وەکوو ئەو خونچەیە!...

گـوزارەی ڕواڵەتـی هۆنراوەکە دڵ و خونچە و بەهارە، بەڵام لە ڕاسـتیدا قسـەکردنێکە لە بوونی سـتەم و لە نەبوونیەوە!. کە سـتەم هەبوو ژین نییە، کە ژین هەبوو ستەم نییە!!...

لە سـەرەتای هەڵبەسـەکەوە تا دواییەکەی ئەو بیرە کە لە سـەرەتاوە وەرئەگیـرێ، تا دواییەکـەی بەبـێ پسـاندنەوە ئەڕوا و لێـک ناپچڕێ. چونکـە ئاشـکرایە کە گوڵی سۆسـەن زۆر گـەش و تـەڕە، زمانی خۆی چوانـدووە بـەو، «لەوچوو»ەکـە دەری ئەخا: کە مەبەسـت بە وشـەی «لاڵە» لاڵێکە کە بێ زمانە، نەوەک لالەیەکە کە گوڵ وەیا چرایە!...

ئێسـتە کە لەمانە ورد ئەبینەوە، تێئەگەیـن کە هۆنراوی «ناڵی» وەیا هۆنـراوی چەرخی «ناڵی»، بـە چ ڕێگایەکدا ڕوەیشـتوون و گێجەکانی کلاسـیک لـە چ سـووچێکەوە توانیویانـە بچنـە ناو ئـەو هۆنراوانە وەیا ئـەو چەشـنە ئەدەبانەوە؟.. لـە وردکردنـەوە و بیرلێکردنـەوەیان هەموو سووچەکان دەرئەکەون..

***

# ئەحمەدبەگی کۆماسی

## ١٧٩٣ -١٨٧٦

پەردەیەکی‌تر لە هۆنەرێکی‌تری سەدەی هەژدەهەم پەردەی هۆنراوی ئەحمەدبەگی کۆماسییە -کە گوندەکەی «بەردەسپی» ناو بووە-. ئەحمەدبەگ هۆنەرێک بووە کە خوێندن و خوێندەواری نەبەرزی ئەو سەردەمەش ئاوی چەشەکەی نەداوە، بەڵکوو هەر سروشتە ڕەوانەکەی خۆی دەرزی هۆنراوی داداوە، وەیا بڵێین: گەشەکردنی ئەدەبی کوردی لەو چەرخەدا ئەحمەدبەگیشی هەژاندووە!..

ئەمە پارچەیەکە لەو هۆنراوانەی کە گوزارەی ئەدەبی کوردی لەسەر زمانی یەکێکی نەپڕ خوێندەواری پێ ڕوون ئەبێتەوە، لەکاتێکا کە ئەڵێ:

**(١) ئازیز نە خاوم، ئازیز نە خاوم**
**بەختم بێدار بی، ئامای نە خاوم**
**(٢) دیای وە سینەی پڕ نە زووخاوم**
**وە دڵەی سۆچیای وێنەی کەواوم!**
**(٣) وێنەی ئەفلاتوون نەزمت گرت، زانای**
**ئازارش چێشەن دەوا نمانای**
**(٤) واتت: هەرکەسێ دەردش ئێ دەردەن**
**مەبۆ بەی تەورە عیلاجش کەردەن**

(٥) دوو عوننـــاب لەبان، دوو بادام چەم
دوو سـێب گۆنـا، قەترەی ئـاوی دەم!
(٦) جە پیاڵەی غەبغەب سافش بکەران
جە سـایەی گەردەن پەیپـەی بوەران
(٧) جـەو دمـا نە باغ پادشـای حەییان
پـەی سـاکنی دڵ بـۆ کـەرە بەیـان
(٨) ئیسـە! ئازیـزم شـۆخ و نـازاران
من گێڵیـام جـە لای گردیـن عەتاران
(٩) هیچکام جـەی دەوا نمەگنۆ بەدەس
ئیختیـار بـە تـۆن بـە فەریـادم ڕەس
(١٠) هەنی چێش واچوون نەزان حاڵ دەرد
من نە ڕاگەی تـۆ چەندێ جەفام بەرد!

**گوزارەی هۆنراوەکان یەکەیەکە:**

(١) ـ خۆشەویسـتەکەم لـە خەوما، خۆشەویسـتەکەم لـە خەوما!. بەختم بەئاگا بوو هاتیتە خەوم!.

(٢) تێپەڕیـت و هاتیت بە سـینەی پڕ لـە زوخاومدا!. تێپەڕیت بە دڵی سووتاوی وەک کەبابمدا!..

(٣) ـ وەکوو ئەفلاتوونی پزیشـک نەبزی دەستمت گرت و زانیت؛

ئازاری چییە، دەرمانت پیشان دا!

(٤) ـ وتت: هەرکەسێ دەردی ئەم دەردە بێ، ئەبێ بەم جۆرە چاری بکرێ:

(٥) ـ دوو لێوی عەننابی، دوو چاوی بادامی، دوو سێوی گۆنا، تنۆکی ئاوی دەم!..

(٦) ـ لەناو پیاڵەی غەبغەبدا ـ غەبغەب چاڵایی بەینی لێو و چەناگەیە؛ وەیا: ئەو پارچە گۆشتە خڕەی ژێر گەرووە ـ ساف بکرێ و تێکڵاو بکرێ، لە سای سێبەری گەردندا، لەسەریەک لەسەریەک بخورێ.

(٧) لە پاشا لە باخی پادشای زیندووان ـ کە خوایە ـ بۆ هێمنی دڵ و ئارامیی، وەرە بکە بەیان؛ واتە: بکەوەرە قسەکردن و هەڵڕشتنی دەردی دڵی خۆت!..

(٨) ئێستە خۆشەویستەکەم! شەنگ و جوانی نازدارەکان، من گەڕام لەلای هەموو عەتتار و دەرمانفرۆشەکان...

(٩) ـ هیچیەک لەم دەرمانانە ناکەونە دەست، کەواتە ئیختیار لە دەست تۆدایە و بگەرە فریام!..

(١٠) ـ ئیتر چی ئەڵێن ئەوانەی کە حاڵی دەرد نازانن؟؛ من لە ڕێگای تۆدا چەندە جەفا و ناخۆشیم کێشا!..

❀❀

ئەم هۆنراوانە سۆزێکە کە خۆشەویستێک بەرانبەر بە خۆشەویستێک دەریئەبڕێ، بەڵام ئەوە مەرج نییە کە وەکوو چۆن

ئـەم، خۆشەویسـتەکەی ئـەوێ، ئەویتریـش بەو جـۆرە ئەمی بوێ!. ئەمـە بەدیهاتنی ئاواتێکە بۆ ئەم، کە دیارە بەبەختە، بۆیـە یاری هاتۆتە خـەوی!. پاش ئـەو ڕازونیـازە کە لەگەڵی ئەکا، بە شـێوەیەکی سـادەی ئەدیبانەیەکی سادەتر دەرمانی دەرد ئەدۆزێتەوە، کە یاری ئەو دەرمانەی پیشان داوە و ئەم دەستی نەکەوتووە!. سەرەنجام ئەو دەرمانە هەر ئەبێ لە دوکانچەی ئەو یارە خۆیدا دەست کەوێ.

لێرەدا ئەم بە ئەندێشە و بە سۆز چووەتە پارێزەوە بۆی؛ ئەندێشەکەی خۆخەریککردنـە بـەوەوە کـە بەم جـۆرە شـێوەیە بێتـە مەیدانەوە و بکەوێتە باسـی پیاهەڵوتنی ئەو یارەدا، کە هـەر ئەندامێکی تۆزێکە لە دەرمانی دەردی ئەم!.. سۆزیشی تێدایە: کە ئەم، زەبوونی دەستی ئەوە؛ ئەوێـک کە پایـەی لەوەدا بێ: بتوانـێ بە تیژی بە بیـری ئەما تێپەڕێ و هەریـەک لـە ئەندامەکانی خۆی بکا بە ڕشـێنەیەکی دەرمان بۆ دڵی بیماری ئەم، ئەبێ ئەو کەسـە گەلێگەلێ لـەم بەرزتر بێ!. کەواتە ئەم ئەبێ کڕنووشی بۆ بەرێ!..

وەکـوو هێمایەکـی بۆ کـرا، دووپاتەکردنـەوەی نیوەی نیـوە هۆنراوی یەکەم، ئەمە لە شـێوەی ئەدەبی ئەو سـەردەمەی کـورددا کە گەلێ لە هۆنەرەکان ئەم جۆرە ڕێچکەیانە گرتووە، وەکوو حەماغای دەربەنفەقرە، وەلی دێوانە، مەولەوی؛ داهێنانی ئەم جۆرە ڕێچکەیە لەو سـەردەمەدا بۆ ناتەواوی نیوە هۆنراوەکە نییە؛ واتە: بۆ ئەوە نییە کە نیوە هۆنراوەکەی پێ تەواو بکا، بەڵکوو بۆ زیادە سـۆزێکە لەلایەن هۆنەرەوە بەرانبەر بە پیاهەڵوتراوەکەی، کە وەکوو بەدەم هەنسـکەوە وتبێتی وایە؛ واتە: چۆن یەکێ بەدەم هەنسکی گریانەوە ئەیەوێ قسە بکا، هەنسکەکە قسەکەی

ئەپچڕێ و دووپاتەی ئەکاتەوە، ئەمیش وایە. سۆزەکەی ئەم، ئەم جۆرە شێوەیە پێ پەیدا ئەکا. جا ئەمە لەو شتە تایبەتییانەیە کە لە ڕێچکەی ئەدیبەکانی ئەو سەردەمەی کورددا هەبووە بۆ ئەدەبەکەیان..

شتێکی تر کە شایانی باسە ئەوەیە: کە دەنگ وایە ئەحمەدبەگی کۆماسی پیاوێکی زۆر خوێندەوار نەبووە، زانیاریی عەرووز و سەرواش بەستراوە بە خوێندەوارییەوە، نەوەک هەر بە خوێندەوارییەکی ڕواڵەتییەوە، بەڵکوو بە خوێندەوارییەکی واوە کە ئەو زانیارییە ئەبێ بە دەرزخوێندنێکی تەواو بخوێنرێ. کەچی کاتێ کە سەیر ئەکەین ئەم هۆنراوانە بەپێی زانیاریی عەرووز، ئەو زانیارییەی تێدا هەیە!. سەرواکان لە شوێنی خۆیدان.. دوور نییە بە بیستن بیستبێتی دوایی دێڕی هۆنراو ئەبێ لە یەک بچن، بەڵام جۆری زانیارییەکەی نەزانیوە کە ئەم لەیەکچوونە ئەبێ چۆن بێ؟. ئەگونجێ ئەمەی زانیبێ، بەڵام لەلایەن عەرووزەکەوە هەر هیچی لێ نەزانیوە...

کەوابوو، دروستکردنی زانیاریی عەرووز لە پارچە هۆنراوێکی وەکوو ئەم پارچەیەدا بەچاو خاوەنەکەیەوە، گومانی تێدا نییە کە تەنها هەر چەشەی خۆی دروستی کردووە و هیچی تر. لەبەر ئەمە کلاسیک بەچاو زانیاریی عەرووز و سەرواوە کە لەم پارچەیەدا هەیە، بەنیسبەت ئێمەوەیە، وەیا بەچاو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەوەیە، نەوەک بەچاو خاوەنەکەیەوە... بەڵام هەست و ئەندێشە بەپێی هەست و ئەندێشەی ئەو ڕۆژە، بە تەواوی باڵی کێشاوە بەسەریا؛ چونکە ئەندێشەکە بەچاو خاوەنەکەیەوەیە، نەوەک بەچاو یەکێکی ترەوە؛ واتە: شایەنی ترازووەکە بەدەست ئەوە! یەکێکی تر بەرانبەر بەو هەستی خۆی دەرئەبڕێ،

نەوەک هی ئەو!.

هەسـت لەو سـەردەمەدا لـە هۆنـراودا ڕووبەڕووی تاقە کەسـێک بووەتـەوە، وەکـوو چۆن ئەندێشـە هـەر بەلای ئـەو شـتانەدا چووە کە هەرچەنـدە بڵاویش بن، هەر جەمسـەرەکەیان بگەنـەوە لای ئەو تاقە کەسە، ئەو هەستەکەی بەرانبەر دەربڕیوە!..

ئەمجا شێوەی داڕشـتنی وشـەکان بەرانبەر بە گوزارەکان، ئەتوانرێ لـەباری لێکۆڵینـەوەوە بوترێ: یەکەیەکـە یەکیان پڕ کردۆتـەوە، ڕێکیی لەبەینی ڕیزی وشەکانا وەکوو هەڵقەی زنجیرێکی باریکی مروارییە لە گەردنی نازدارێکا!..

نیاز لە سـەرەتای هەڵبەسـەوە تا دواییەکەی وەکوو یەک هاتووە، لە ئەنجاما دوایی هاتنی نیازەکە بەوە دێت: کە وردەوردە لەگەڵ هیوایا هیوا پەیدا ئەکا و نیازی خۆیی بە تەواوی پێ ئەڵێ.

هەڵگێڕانەوەی لێچووەکان لە بەینی «عونناب لەبان»، «بادام چەم»، «پیاڵـەی غەبغەب» لەباری بەلاغەتی ئەدەبیدا زۆرتر نمایانە، تا «لەبی عونابـی»، «چـاوی بادامیی» و «غەبغەبی پیاڵەیـی». چونکە هەموو دەم لێچوواندنی هەڵگەڕاوە بەهێزترە تا ڕاستەوڕاست، بەتایبەتی ئەمە بۆ چەشەی یەکێکی بێئاگا لەم ڕەوشتە، زۆرتر جێگای شایانە!.. جا ئەمە ئەوە پیشـان ئەدا: کە ئەم جۆرە چەشەیە لەناو ڕەمەکیی کورددا وادیارە باو بووە، بەبێ ئەوە ئاشنا بن بە ئەدەبێکی بێگانە!..

کەوابـوو، چەمکـی هەسـت و ئەندێشـە بەپێـی چـەرخ ئەگۆڕێ، چەمکیـان ئـەوان لـەو سـەردەمەدا بۆ تاقە کەسـێک بووە، لـە دوای ئەو سـەردەمە ئـەو چەمکانە گۆڕان؛ چەمکی هەسـت لە نووسـاندن

بە «تاک»ـەوە گەیشتە نووساندنی بە «گەل»ـەوە، لە گێتی خەم و خەفەت لا درا و خرایە سەر جیهانی جوانی؛ جوانی لە هەموو شتێکا، نەوەک هەر تەنها لە یەک شتدا کە ئادەمیزادێک بێت!!..

هەروەها ئەندێشەش گۆڕا؛ لە نووساندن بە تاقە کەسێکەوە بوو بە بیرکردنەوە لەو شتانە کە ئاشنایەتییان لەگەڵ هەموو کەسێکدا هەیە، تەنانەت نەک هەر لەگەڵ چینێکیشدا، بەڵکوو ئەبێ بەرەکەی بۆ زیاتر لە چینێک بێ، ئەبێ هاتەهاتەیەکی وای تێدا بێ کە هەرکەسە لە شوێنی خۆی بۆی بکەوێتە جووڵە و بکشێ!!..

جا لەبەر ئەم ناساندنە، ئەم پارچە «هەڵبەسە» ـهۆنراوەی ئەحمەدبەگی کۆماسی ـ لە هەموو سووچێکەوە جۆری ئەدەبی کوردی ئەو سەردەمەمان لە باری لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەوە پیشان ئەدا، بەتایبەتی بۆ ئەدەبی ئەدیبێکی سادەی دوور لە فرەخوێندەواری ئەو سەردەمەوە، ئەتوانین بیکەین بە شابەڵگە لەلایەن ئەو شتانەوە کە ئاشنایەتییان بە ڕامیاری و یاسای لێکۆڵینەوەوە هەیە.

# مەولەوی

## ١٨٨٢ ـ ١٨٠٦

سـەدەی هەژدەهەم سـەدەیەک بوو لە گەلێ لە شوێنەکانی گێتیدا پـەردە هەڵگێڕرایەوە و دیوێکی‌تری ئەدەب کەوتە ڕوو!.. وا دیار بوو لەم سـەدەیەدا وردەوردە تاک هەستی کرد بە بوونیەتی خۆی و هەستی کرد بـەوە: کە بیری ئـەو، ئەبێ لە جەرگەی بیری گەلـەوە پەیدا ببێ، نابێ ببەسترێ بە دەستەیەکی تایبەتییەوە!...

ئـەم بیرە بەم جۆرە لە هەموو شـوێنێکا بڵاو بـووەوە، بۆیە هەر لەم چەرخەدا چەشـنی بیروباوەڕ لەناو کوردیشـدا پەیدا بوو!. کە ئەم جۆرە بیرانە هاتنە ناوەوە، بێ‌گومان ئەدەب لەگەڵیانا ئەبێ، پەردەی ئەدەبیش بـەو جۆرە ئەگۆڕێ. کەوابوو سـەدەی هەژدەهەم دائەنرێ بە یەکەم پلە بـۆ ئـەم گۆڕانە؛ گۆڕان لە باری وەسـپەوە، لە باری سروشـتەوە، لە باری ئەندازەیەک دەرکەوتنی ترووسکەی نەتەوایەتییەوە، بۆ تێکڕای مەردم، لە باری ئاوڕدانەوە بە لای گەلەوە.

لەبـەر ئەمانـە، لەم سـەدەیەدا هۆنەرێکـی بەرزی کـورد پەیدا بوو کـە «مەولەوی»ـیە. مەولـەوی لەبارەی وسـپ و دیمەنی سروشـتەوە مەشـخەڵێکی هەڵکرد. بە گوزارەیەک گوزارە و وشـەی هۆنراوی گۆڕی، بیری تازە کردەوە، ئاسۆی چەمکە فراوانەکەی هۆنراوی بە تەواوی لێک کشـاندەوە. قوتابخانەیەکی تایبەتـی بۆ دەرزی هۆنـراو دانا، هۆنراوی لە وشەوە خسـتە سەر گوزارە، سـەلماندی بە قوتابیانی قوتابخانەکەی: کە

هۆنراو گوزارەیە، نەوەک تەنها وشـە؛ گوزارەیە گیان ئەهەژێنێ!. کەواتە ئەبـێ لە پێشـا گوزارە بـەرز بێ، ئەمجا وشـە!.. مەولـەوی ئەمانەمان هەموو تێئەگەیەنێ، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

(١) هـام دەردان ئامـان ئەر مەندەن هۆشـم
سـەدایێ وەشـەن مەیـۆ نـە گۆشـم!
(٢) چمـان زیلـەی زەنـگ زەواریـی مەیۆ
زرنگـەی قافڵەکـەی وەهاریـی مەیـۆ!
(٣) قافڵەچـی! ئامـان، داڎەن دەخیلـم
بنەکـداری خـەم، خەیلـی زەلیلـم![1]
(٤) نـە ڕای تیجـارەت ئەمیـر وەلـی
تـۆ مایـەی ڕەواج عەبـاس و عەلـی
(٥) سـاتێ قافڵەکـەت سـاکن نە سـەیر بۆ
یـەک عـەرزێ دێـرم، ئۆغـرت خەیـر بـۆ
(٦) گێـج «زرێوار» هەرسـم مـەوج وەردەن
سـارای «مەریـوان» تەمام هەڕ کـەردەن!
(٧) بازەش هەناسـەم سـوب وەنـەش دەرۆ
یـەخ کـەرۆ، قەتـار ئاسـان بویـەرۆ!
(٨) ئەمجار وە سۆزەن موژەی جۆش وەردەم
سـەرنووک قەڵـەم ئـاخ سـوراخ کـەردەم!

---
١. من لام وایە ئاخری ئەم دوو نیوە هۆنراوەیە «دەخیلەن» و «زەلیلەن»ـە.

(٩) وە بەنـد دووبـاد مەینـەت جگـەر
بـورازە تـا تـای جـەواڵان یەکسـەر
(١٠) قەیاسـەی قایش پۆسـەکەی جەسـتەم
حەڵقـەی چەڵەمەی پێشـەی شکەسـتەم
(١١) ڕەگ تـەن تاڵـی تاڵوەردەی سـێوەنگ
بفەرمـان یـاران بـاران بـدەن تەنـگ!
(١٢) زەنگ دڵەی تەنگ، زایڵەی سـەدڕەنگ
پێکیای تای دەرد ڕیشـەی خـەم گوڵەنگ!
(١٣) وزان نەگـەردەن بـەرز پێشـاهەنگ
بشـۆ، بڎۆ دەنگ فرسـەنگە و فرسـەنگ[1]
(١٤) مەدەد یا عەلی! پەی سـەفەر کەر مەیل
مەنـزڵ وە مەنـزڵ، تـا مەنزڵگـەی لەیـل
(١٥) بـەڵام هـەر خاکـێ جـەو ئاسـانەکەن
گـەرد سـفتەی گیـان هەراسـانەکەن!
(١٦) ڕەحمـەت بۆ وادەی وسـتەی بارەکەت
نەبـۆ وە پاشـێل پـای قەتارەکـەت!
(١٧) جە زیڵەی ئەو دەنگ چون خەبەر دارەن
مەیـۆ مەشناسـۆش ئاخـر دیـارەن!

---

١. «بشۆ، بڎۆ دەنگ فرسەنگ وە فرسەنگ» (نوسخە).

(١٨) مەپەرسۆ: ئازیـر پـڕ وەفـا و بەینەت
کۆن تجارباشـی؟ سـەر قافڵـەی مەینەت!
(١٩) واچـە مـەر نەدیـت نەمـام بـێ گەرد
چێگـە پارچەی گیـان پایەندازیـت کەرد؟!
(٢٠) یـاد پایەنـداز سـەودای سـەرش بـێ
مامەڵـەی پارچـەی گیانێوتـەرش بـێ!
(٢١) بـەڵام جـە تەئسـیر جـۆش بۆتەی دڵ
دەمـەی هەناسـەی دەروون پـڕ چـڵ!
(٢٢) سـیم قـاڵ هـەرس شـەوان بێداریش
ئەشـرەفیی پاکتـاو ڕەنـگ ڕوخسـاریش
(٢٣) ڕووکـەش بی وە کفت هـوون گوڵناری
وە مـس مەنمانـا جـە لای بـازاڕی!
(٢٤) بـازاڕش کەسـاد، ڕای بەنـدەرش بەند
کـەس نمەواچـۆ سـەرمایەش وە چەنـد؟!
(٢٥) وە بـازاڕەدا وە بانـگ بێشـەرم
مەگێـڵا و مـەوات وە زایەڵـەی گـەرم:
(٢٦) مایـەم نـاڕەواج، دەروونـم تەنگـەن
قافڵـەم تـا قـام قیامـەت لەنگـەن!

**

## گوزارەی هۆنراوەکان یەکەیەکە:

(١) ـ هـاودەردەکان هـاوارە، ئەگـەر هۆش ماوە و مابـێ، دەنگێکی خۆشە، کە دێتە گوێم!...

(٢) ـ وەکوو بڵێـی هەرای زریـک و هۆڕی زەنگی زەوارەیەک دێت ـزیارەتکەرـ، زرنگەی کاروانەکەی بەهاریی دێت!..

(٣) ـ سـەرقافڵەچی! ئامانـە، دادە، دەخیلـە. بنەکـداری خەم زۆر پەرێشـان و زەلیلە!. «بنەکدار»: ئەو کەسـەیە کە بنە و بارگەی قافڵە و کاروانەکەی بەدەسـتە. دیارە ئەم قافڵەیە کە مەولەوی دروسـتی کردووە قافڵەی خەم و مەینەتە؛ بنەکدارەکەی خۆیـەتی!.

(٤) ـ لە ڕێگای تیجارەتی ئەمیری وەلیدا، تۆ ئەی قافڵەچی! مایەی ڕەواجی ناوی ئیمامی عەبباس و ئیمامی عەلیت!.

ئەمە دەنگ و ڕەوشـتی کاروانچی کوردە، کە دەنگ لە کاروانەکەی ئـەکا ئەڵێ: «یا عەبباس، یا عەلی». ئەم دەنگەی بۆ داواکردنی یارمەتی فەڕ و بەرەکەتە.

(٥) ـ ساتێ قافڵەکەت بوەستێنە با نەڕوا، شتێکم هەیە پێت ئەڵێم و پاش ئەوە ئۆغرت خێر بێ بڕۆ.

(٦) گێژ و گێژاوی دەریاچەی «زرێبار»ی فرمێسـکم شـەپۆلی داوە، دەشتی «مەریوانی» هەموو کردووە بە قوڕ.

«زرێبـار» دەریاچەیەکـە لە خاکی «مەریوان»ـی کـوردەواری کە ئێستە کەوتۆتە بەشی وڵاتی ئێرانەوە.

(٧) ـ لیێی گەڕێ! با «با»ی هەناسـەی ساردم ـکە وەک بای فێنکی

بەری‌بەیان وایە- لێی بدا؛ واتە: لەو گۆمی زرێباری فرمێسکەم؛ ببێ بە سەهۆڵ و قافڵە و قەتارەکە بە ئاسانی بەسەریا تێپەڕێ... مەبەستی ئەوەیە: ئەم قافڵەیەت کە بۆ لای یار ئەچێ، بەسەر چاوی منا بڕوا!..

(٨) - ئەمجا بە سووژنی برژانگی جۆش خواردووم؛ واتە: لەبەر گڕە و کڵپەی دەروونم، ئەو برژانگە بە پێڵووەکانی چاومەوە جۆشی خواردووە. کە بە سەر نووکی قەڵەمی ئاخ و داخ ئەو سووژنە کون کراوە!!.

(٩) - بە بەندی دووبادی مەینەت و ژاری جگەر -واتە: جگەری خۆی کردووە بە بەنەکە، چونکە جەرگەکەی لەبەر خەم و خەفەت وا باریک بووەتەوە بە یەک لایی هێزی نییە ئەبێ دوو لایی بێ!- بدروو تا تای جەواڵەکانت هەموو لەم سەرەوە تا ئەوسەر!..

(١٠) - قەیاسەی قایش - تیماجی پێستەکەی لەشم، ئەڵقەی چەڵەمەی ئێسقانی شکاوم.

(١١) - دەماری لەش کە تاڵی ئەو، تاڵخواردوویەکی پەیوەستە. «تاڵ»: مازوو و پێستی هەنارە (کەمکۆڵ) کە بەن و مەشکە و ئەمانەی پێ تاڵ و دێز ئەکەن بۆ ئەوە بتەو ببێتەوە. «سێوەنگ» بە گوزارەی پەیوەست و پەیوەندە.

واتە: دەماری لەشم کە تاڵ دراوە بەو تاڵەوە، کرژ بووەتەوە بیکە بە گوریس، کە ئەمانە هەبوو، بفەرموو بە دۆستان کە بارەکان شەتەک بدەن!..

لێرەدا مەولەوی لەو کاروانەدا شتومەکی ڕێک خستووە؛ پێستی خۆی کردووە بە قەیاسە. «قەیاسە»: قایشێکی پانە و باری پێ ئەبەستن. ئەم قەیاسەیە ئەبێ هەڵقە وەیا چەڵەمەیەکی لەسەر بێ!. ئێسقانی

شکاوی کردووە بەو چەڵەمەیە. دەمارەکانی لەشی کە تاڵ درا کرژ ئەبنەوە، کردوونی بە گوریسی ئەو باربەستنە!. ئەمەش بۆ ئەوەیە چونکە بە تەنها قەیاسەکە باربەستنەکە تەواو نابێ!!...

(١٢) ـ زەنگی دڵی تەنگ ـکە ئەو زەنگە سەد جۆرە هەرا و دەنگی لێوە دێ ـ کە ئەنگاوتراوە بە هەودا و تاڵی دەردەوە، ڕیشەی خەمیش بووە بە گوڵەنگ بۆی!..

(١٣) ـ بخەنە گەردنی بەرزی پێشاهەنگی قافڵەوە ـکە پێشەنگەکەیەتی ـ ئەمجا بڕوا و دەنگ بداتەوە فرسەخ بە فرسەخ[1].

مەولەوی دڵی تەنگی خۆی کردووە بە زەنگ، چۆن زەنگ بە سەد جۆرە دەنگ، دەنگ ئەداتەوە، دڵی ئەمیش لەبەر پەژارە بەو جۆرە دەنگ ئەداتەوە!. ئەو دڵە کام دڵە کە بەو جۆرە دەنگ ئەداتەوە؟. دڵێکە کە پێکراوە بە هەودای دەرد و مەینەتەوە. دەرد و مەینەت گەلێ

---

١. «فرسەخ» کە ڕاستییەکەی «فرسەنگ»ـە، لەپاش لێکدانەوەی من: بریتییە لە شەش هەزار گەزی «شا». کە «٢٧٣٦» مەتر، وەیا شەش کیلۆمەتر و «٧٣٦» مەترە.

هەر فرسەخێک «سێ» میلە، هەر میلێک دوو هەزار گەزی شا، وەیا «٢٢٦٦» مەترە. گەزێکی شا بریتییە لە «١/٠٣٥» مەتر. هەروەها گەزێکی شا «١٦» گرێیە. مەترێک «١٤» گرێ و چواریەکی گرێیەکە.

فرسەخێک «سێ» میلە، میلێک چوار هەزار هەنگاوە، هەنگاوێک «سێ» پێیە، دوو پێی گەزێکە ـنەک گەزی شا ـ گەزێک «٢٤» پەنجەیە، پەنجەیەک «٦» دەنکە «جۆ»ی مامناوەنجییە، هەر جۆیەک «٦» مووی وڵاخە.

میلی ئنگلیزیش هەیە کە بریتییە لە «١٦٠٩» مەتر. بەڵام میلی دەریاییان بریتییە لە «١٨٥٢» مەتر.

لە لێکدانەوەی کوردەواریدا: هەر فرسەخێک سەعاتە ڕێگایەکە بە ڕێگەی کاروان، شەش فرسەخ ڕۆژەڕێگایەکە.

هـەودای لێ ئەبێتەوە، تاکەتاکەی ئەو هەودایانە، یا هەموویان ڕوویان کردۆتە ئەم و پێکاویانە!..

ئەمجا «گوڵەنگ»ـێکیش بۆ ئەو پێشـەنگی کاروانە دروسـت ئەکا ـدیارە پێشـەنگەکەش هـەر خۆیەتی ـ ئـەو گوڵەنگە ڕیشـەی خەمە، ڕیشەی دار و دەوەن هەوداهەودایە، گوڵەنگیش هەروا هەوداهەودایە. جـا ئەو گوڵەنگە کە ئەیخاتە ملی ئەو پێشـەنگە، خەم نییە، ڕیشـەی خەمە!!...

(١٤) ـ کـە ئـەم ئیشـانەت کرد بە «مـەدەد یاعەلی» بـەڕێ کەوە بۆ سەفەرەکەت؛ بڕۆ قۆناغ بە قۆناغ تا ئەچیتە هەوارگەی لەیل!.

(١٥) ـ بـەڵام ئەوەنـدە هەیـە هـەر خاکوخۆڵـێ لەو ئاسـتانەیەدا هەیـە ـئاسـتانەی یارـ گەردی سـاواوەی لەگیان بێزارەکـەن؛ واتە: هەر خاکوخۆڵێ کە لەبەر بەرزایی دەرگاکەی یاردایە، هەموو لەشـی منی لـە خـۆم بێزار بووە، ئەوەندە لەوێدا کەوتووە و ئەو پێی ناوە بەسـەریا، بووە بە گەرد و تۆز!!...

(١٦) ـ ڕەحمەتت لێ بێ لە کاتی وەستانی بار و قافڵەکەتا، ئەو گڵە نەبێ بە پێشێلی پێی قەتار و قافڵەکەت!..

(١٧) ـ لەبـەر هـەرا و زایەڵـە و دەنگی ئـەو زەنگە لەبـەر ئەوە کە ئـاگادارە، دێـت و ئەیناسـێتەوە و ئەزانـێ ئەمـە دیاری ئاخـرە و ئیتـر نایبینێتەوە!!...

(١٨) ـ ئەپرسێ ئەو یاری خاوەن بەینەت و پەیمانە: کوا تجارباشی؟ کە سەرقافڵەکەی پەژارە و مەینەتە!!..

(١٩) ـ بڵـێ: مەگەر چاوت پێی نەکـەوت! ئەی نەمامی بێگەرد؟.

لێرە پارچەی گیانی خۆی کردە پایەنداز و فڕێی داوەتە بەر پێت!...

(٢٠) ـ یادی پایەندازیی سەودای سەری بوو، مامەڵەی پارچەی گیانێکی تریش بوو..

(٢١) ـ بەڵام بەهۆی کاریگەریی جۆش و خورۆشی «بۆتە»یەک ـکە دڵەـ بەهۆی دەمینی «دەمە»یەک ـکە هەناسەی دەروونی پڕ چڵەـ... «چڵ ـ تڵ» واتە سۆزش.

(٢٢) ـ لە کاریگەریی ئەوانەوە زیوی قاڵکراوی فرمێسکی شەوانی بێداریی ئەو ـواتە خۆیـ ئەشرەفیی پاک تواوەی ڕەنگی ڕوومەتی.

مەولەوی لێرەدا بۆتەیەکی دروست کرد کە دڵی خۆیەتی، ئاگری ئەو بۆتەیە هەناسەیەتی، ئەو شتانەی کە تیایا قاڵ ئەکرێنەوە زیو و زێڕە؛ زیوەکەی فرمێسکیەتی و زێڕەکەی ڕوخسار و ڕوومەتیە. لەم شوێنەدا بیروردییەکی زۆری بەکار هێناوە! «ئەشرەفی» لیرەیەکی پچووکی ئێرانە کە لە زێڕ دروست ئەکرێ.

(٢٣) ـ ڕووکەش بوو بە «کفت»ی وەکوو گوڵ هەنار، لە لای ئەهلی بازاڕی بە «مس» ئەینواند!..

هەر جۆرە دەرمانێک کە بدرێ لە شتێک و ڕواڵەتی ئەو شتە وەکوو خۆی لێ بکا، ئەوە پێی ئەڵێن: «کفت» وەکوو: زەڕکفت.

(٢٤) ـ بازاڕی ئەو تجاڕباشییە کەساسە و ڕێگای بەندەری لێ گیراوە، کەسێ پێی ناڵێ سەرمایەت بەچەند؟!..

(٢٥) ـ لە بازاڕا بە بانگەوازێکی زۆر ئاشکرا و بێشەرم ئەگەڕا و ئەیوت بە سۆزی دەنگێکی گەرمەوە:

(٢٦) ـ سەرمایەکەم هیچ برەوێکی نییە و دڵ و دەروونم زۆر تەنگە،

قافڵە و کاروانەکەم تا هەستانی ڕۆژی قیامەت شەل و پەک کەوتووە و ڕاست نابێتەوە!!...

✽✽

مەولەوی بابەتێکی گرتووە بە دەستەوە کە ڕاز و گلەیی کردنێکە لەگەڵ دۆستێکدا، دیمەنێکیشی پێ داوە کە دانانی ئەو بابەتەیە لەناو چوارچێوەی ئەو وشانەدا، نیازێکیشی هەیە کە تێگەیاندنی دۆستەکەی و مەردمی‌تره لەو نیازەی خۆی، داڕشتنی ڕستەی هەیە کە شێوەیە لەگەڵ زنجیرەی بیردا و وردیی ئەندێشەدا!. خۆ ئەگەر قسە لە باری کلاسیک و ڕۆمانتیکی پارچەیەکی وەکوو ئەم پارچەیەوە بکەین -کە هی مەولەوییە- ئەوە هیچ کە نەچووەتە ناو هیچ پێستێکی کلاسیکەوە، بەڵکوو ئەدەبێکی بەرزی وایە کە لە ڕۆمانتیکیش تێی پەڕاندووە و لەوانەیە لەگەڵ دراماتیکدا تێکڵاوی کردووە!!...

بەڵێ! لەوانەیە هەموو کەس ڕاز و گلەیی لەگەڵ دۆستیا بکا، وەیا بە کەسانی‌تر بڵێ کە دۆستێکی هەیە و لەگەڵ ئەم دۆستەیا داستانێک هەیە لە بەینیانا، بەڵام ئایا چۆن ئەتوانێ؟. وەیا چۆن پێی ئەکرێ وەکوو مەولەوی کاروانێکی وا ڕێک بخا لە خاکی وڵاتێکەوە -کە مەریوانە- و بەسەر دەریاچەی «زرێبار»دا بیپەڕێنێتەوە؟!...

لەمەش کاریگەرتر شتومەکی ئەم کاروانەی لە لەشی خۆی دروست بکا، سووژنی لە برژانگی خۆی بۆ دروست بکا!...

هۆنەرە کلاسیکەکان برژانگیان ئەکرد بە تیر و لە مەیدانی دۆستایەتیدا ئەیانهاویشت بۆ یاری نازدار!. ئەم، برژانگی کردووە بە سووژن بۆ دروونی

جەواڵــی دەرد و مەینــەت!. بــە چیش بدروێ؟. بە بەنــی جگەر!!. کێ توانیویە بیر لەوە بکاتەوە کە لە پێستی لەشی قەیاسەیەک دروست بکا و لە ئێسـقانی شـکاوی چەڵەمە و لە دەماری تاڵدراوی بەندی دووباد و لە دڵی پڕ لە پەژارەی زەنگ و لە ڕیشـەی خەم گوڵەنگ بۆ پێشەنگی ئەو کاروانە و بۆ باروبنەی ئەو کاروانە دروست بکا؟!...

وەیا ڕاسـتە «بۆتە» هەیە و تۆ وا تێئەگەی پارچە مەعدەنێکە و زێڕ و زیـوی تێئەخـرێ و بە مووشـەدەمە[1] جۆش ئەدرێ. تـۆ دیمەنێکی وات بەرچـاو ئەکـەوێ، کەچی کاتێ مەولەوی باسـی ئەو دیمەنە ئەکا بـە جۆرێکی‌تـرت تێئەگەیەنێ؛ ئەو، دڵ ئەکا بە «بۆتە» و هەناسـە بە مووشـەدەمە و فرمێسک بە زیو و ڕوخسـار بە زێڕ!. ئەمە گەلێ جیایە لەگەڵ ئەو بیروباوەڕەدا کە ڕەمەکیی مەردم لە بازاڕی زەڕەنگەرەکانیان وەرگرتووە!. وەیا گەلێ جیایە لەو چەمکە کە لەو بازاڕەدا هەیە.

دارِشـتن و شێوەش هەر بەو جۆرە ئەتوانرێ دابڕێژرێ کە مەولەوی دایڕشتووە، ڕستە هەروا ئەتوانێ هەستی خوێنەر و گوێگر ڕاکێشێ.

لەبـەر ئـەوە قسـەی لێوە ناکەیـن کە لە شـێوە و دەسـتووری زمانی عەرەبیدا «مُضاف» و «مُضافُ إلَیهِ»، وەیا سیفەت و مەوسووف هەیە؛ لەبەر ئەوە نایڵێین، چونکە ئەمانە لە هەموو زمانێکا هەن. یەکێک لەو زمانانەش زمانی کوردییە، لە شێوەی بەجێهێنانی ئەم ڕەوشتەدا بەرانبەر بـەم زمانە ئـایا کەس ئەگاتە مەولەوی؟. نەوەک هـەر ئەوەندە، بەڵکوو ئەو سەردەقی شکاندووە و ئەم جۆرە قوتابخانەیە داناوە.

ئاشـکرایە، کە بیرەکەش لە سـەرەتای چامەکەوە تا دوایی چامەکە

---

١. [مووشەدەمە: ئامێری ئاور دەماندن، کوورەی ئاسنگەر].

لەگەڵ وشەکانا بە ڕیز هاتوونەتە خوارەوە. بەرزیی ئەندێشە و سۆزیش بە جۆرێکە: کە لە ئەندێشەکەدا ئەزانین بەرزە، وە لە سۆزەکەشا خۆمان ئەزانین کە عاتفەبزوێنە. ئەندێشە و سۆز لە زۆر شتا هەیە، بەڵام لێرەدا جوانیی ڕستەکەی کە لە پاڵدایە، بە تەواوی دەری‌ئەخا کە بەرزییەکی‌تری هەیە زیاتر لە هۆنەرانی‌ترا!..

بەڵێ! ئێمە ئەتوانین بێژین: ئەم هۆنراوانەی مەولەوی ڕاستەوڕاست گوزارەکانیان ئەوەبوو کە وتران، ئەو چەرخە و ئەو ڕۆژە و ئەو شوێنە ئەم جۆرە شتانەیان لە دڵی مەولەویدا جێ کردۆتەوە!.. کاروانێکی وا بەو جۆرە پڕ لە دەرد و مەینەت، کاروباری کۆمەڵایەتیی ئەم شتانەی بەو فێر کردووە، لە ناخی ڕەوشتی کۆمەڵەکەوە گوزارەی هەڵێنجاوە!. لە سروشتی دیمەنی خاکەکەوە پەپوولەی ئەندێشەی کەوتۆتە فڕین!. ئەگەر ئەو جۆرە کاروانە و ئەو جۆرە ڕابواردنە لەو سەردەمەدا نەبووبێ کە هەوای سارد بەو چەشنە فرمێسکی گەرم بکا بە سەهۆڵ، هۆنەرێکی وەکوو مەولەوی پێی ناکرێ ئەم شتانە هەڵتاشێ!!...

دیسان ڕاستە ئەمانە هەبوون؛ واتە: ئەو ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەو سروشتی خاک و ئاوە هەبووە؛ بەڵام وەکوو ئەمە هەبووە، زۆر کەسی‌تریش لەو ئاو و هەوایە هەڵمژیوە و لەناو ئەو کۆمەڵایەتییەدا ژیاوە وەکوو مەولەوی، بۆچی ئەوان ئەو دیمەنە کاری تێ‌نەکردن و هەر مەولەوی بوو کە بوو بە دامەزرێنەری ئەو جۆرە قوتابخانەیە لەو سەردەمەدا؟!.. هەروەها ئەم پرسیارە وەکوو بەرانبەر بە مەولەوی ئەکرێ، بەرانبەر بەو هۆنەرانەی‌تریش ئەکرێ کە ڕێگای‌تریان گرتووە.

لە سۆزی هۆنراوەکانی مەولەوییەوە و لە وردیی گوزارەکانیانەوە و لە

گوزارشــت بەو جۆرە وشـانەوە، ئەوە دەرئەکەوێ کە مەولەوی لە گەلێ ڕووەوە خۆی تێکڵاوی ئەو ئەشـکەنجانە بووە؛ واتە: ئەو ئەشـکەنجەی چەوسـانەوانە لـە گەلــێ لاوە مەولەوییـان خسـتۆتە ژێـر جەزرەبەی خۆیانەوە؛ لە لایەکەوە کاروانی خۆی بە شـار و گوندەکانی کوردەواریـدا لەسـەر ڕەوشـتی کاروانی ئەو سـەردەمە. لـە لایەکەوە چەوسـانەوەی نەفسـیی بەهۆی دەسـت تێوە ژەندنـی مەعنەویاتـی تەرێقەتەوە ـکە ئەمـە بۆ ئەو جۆرە کەسـانە کە بەڕاسـتی ئەو ڕێگایـە ئەگرن ئازارێکی بەتینە!ـ. لە لایەکیترەوە پەیدابوونی هۆنەرانیتر هەر لەو سەردەمەدا و ئارەزووکردنی نەفسیەتی مەولەوی بۆ زاڵبوون بەسەریانا، بە دۆزینەوەی گوزارەی وردی شتی بەسۆز، مەولەوی و هۆنراوی مەولەوییان گەیاندۆتە ئەو پایەیە!!..

❀❀

ئەو وشـانە کە یەکێکی وەکـوو مەولەوی لە لاپەڕەی ژیانیا کردوونی بە گوزارشـت بۆ ئەو گوزارانە، وشە، با لە ڕواڵەتا هەر ئەو وشەیەش بێ کە من و تۆ ئەیڵێین، لە ڕاسـتیدا وشـەیەکیتری جیایـە لەوانەی من و تۆ!.. لە شوێنێکی وەکوو ئەو چامەیەدا ـبە وێنەـ ئەو ناو و وشەی:

«قافڵە، زایڵە، هەرس، زرێبار، مەریوان، قەیاسە، چەڵەمە، جەستە، شکسـتە.» و... شـتیتریش هێناوە. ئێمە و بێجگە لە ئێمەش، تەنانەت هەر لەو سەردەمەی مەولەویشدا ئەو وشانەمان وتووە و وتوویانە، بەڵام جیایـی زۆرە لـە بەینی دوو وشـەکانا!. وە بەڵکوو هەر یـەک نین!. ئەو گوزارشـتی بە جۆرە ئازارێکی بەتین بەو وشـانە داوەتەوە، کە بەتەواوی

جیایە لەو گوزارشتە کە ڕاستەوڕاست ئێمە وشەکەی بۆ ئەڵێین!..

ئـەو، ئازارەکـەی لـەناو جەرگـەی سروشـت و کۆمەڵـەوە هێناوە و وشـەکەی بۆ وتووە، ئێمە وشـەکە بـۆ گوزارەیەک ئەیژیـن کە هەروا بە سـادەیی بـۆ بـەکار دێنین. ئـەو «ئێلاخ» و «لەیلاخ»ـی ـبـە وێنەـ بۆ دیمەنی سروشتێک وتووە کە هەموو «پێزە ـ زەڕە»[کانی] سروشت ئەو شوێنەی دروست کردووە، لەگەڵ ئەوەدا ئێمە کە ئەیڵێین، بە جۆرێک ئەیژیـن کـە ناوێکی سـادەیە بۆ شـوێنێکی سـادە، بەبێ ئـەو هەموو گوزارانە کە ئەو وەری‌گرتوون!..

مەولەوی «هاماویان ـ کُلّیات»ـی خستۆتە ناو «پاژان ـ جُزئیّات»ـەوە، کە باسی پاژێکی کردووە، هەموو وەسپی «هاماو»ەکەی داوەتێ؛ لەوەی دەرکردووە کە ئەمە باسـی «پاژ»ێک ئەکا، بەڵکوو «هاماو»یەکەی باس کردووە بۆ ئەوە تۆ لەناو ئەو «هاماو»ەدا «پاژ»ەکەت بۆ دەرکەوێ!.

ئـەو وای پیشـان داوە: کـە هەمـوو «پاژ»ی «بوویـش ـ کەون» لە ترۆمێکدا ئەڵقەی زنجیرە، وەسـپی یەکێک وەسپی هەموو ئەڵقەکەیە!. دیارە ئەمـە لە ڕەوشـتی هۆنەرەکانی‌تری ئەو سـەردەمەدا نییە. بە وێنە ئەو گوزارشتە کە ئەو لە:

**قەیاسـەی قایش پۆسـەکەی جەستەم**
**حەڵقەی چەڵەمەی پێشەی شکەستەم**
**ڕەگ تـەن تاڵـی تاڵوەردەی سـێوەنگ**
**بفەرمـا یـاران، بـاران بـدەن تەنـگ**

ئەداتەوە گوزارشـتێکە کـە هۆنەرێکی‌تر، وەیا من و تـۆ ناتوانین بەو

جۆره گوزارەی ئەو گوزارشتە بە دڵمانا بێت!.

جۆری «قەیاسە» و ترۆمی «پۆس» هەمووی چووەتە پێستی ئەووەوە!. چی حەڵقەی «چەڵەمە» هەبووە و هەیە، هەمووی لە پێشەی شکستەی ئەوا جێی بووەتەوە!. چ شتێک هەیە کە تاڵ درابێ و تاڵ بدرێ، گشتی لـە پێزی دەمـاری ئەوا کۆ بووەتـەوە!. «یاران» و «باران» دۆسـتایەتی و بارسایەتی کەونی گرتۆتەوە!!...

کەوابوو، لە سەروبەری ڕووناکیی ئەم شتانە، ئەوە بۆ ئێمە دەرکەوت: کـە هۆنەرێکی وەکـوو مەولەوی لەو چەرخەدا وشـەکانی مێژوویەکن بۆ ژیانی خۆی، بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی سـەردەمی خۆی، بۆ بیروباوەڕی چاخـی خـۆی، بـۆ ئاوێنەی سروشـتی دیمەنـی مەڵبەندی خـۆی لەو گێجەدا.

ئەمـە لـە لایەکـەوە، لەلایەکیتریشـەوە سـەردەمێکی ڕومانتیکی ئەدەبـی کـوردی پیشـان ئـەدا، کە بـە هـۆی لێواولێوبوونی لە سـۆز و ئەندێشـە، بـە تـەواوی دووری خسـتۆتەوە لـە کلاسـیک، وە گێجێکی تیشکداری لە پلەی ئەدەبی کوردیدا دەرخستووە...

# حاجی قادری کۆیی

## ١٨١٥ - ١٨٩٢

سەدەی نۆزدەهەم وەکوو سەرەتای گۆڕانی بیروباوەڕی نەتەوایەتی بوو بەرانبەر بە ژێردەستەکانی وڵاتی عوسمانی بە تێکڕایی و بەرانبەر بە کورد بەتایبەتی؛ هەروەها بنچینەیەکیش بوو بۆ دامەزراندنی بناغەیەکی نوێ لەبارەی گۆڕانی ئەدەبی کوردییەوە لە دەوری کلاسیکەوە بۆ دەوری ڕومانتیک، بەرانبەر بە زۆرتر لە ڕۆشنبیرەکانی کورد.

تێکڵاوبوونی باوەڕی نەتەوەکان بەناو یەکا، کردیە کارێ: کە ئەدەب وردەوردە پاڵ بنێ بە دامودەزگای خۆخەریک کردن بە زانیاریی عەرووزەوە و دەرگایەکی تر بخاتە سەر گازی پشت بۆ زۆرتر بەنرخ زانینی گوزارە، تا وشە؛ وە لە دەروونیشەوە بەو چەمکانە کە کاروباری کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی پیشان ئەدەن. ئەمانەش بە تەواوی لە ئەدەبی هۆنراودا دەرئەکەون.

وەکوو یەکێ لە خاوەنی هۆنراوەکانی ئەو گێجە «حاجی قادری کۆیی»ـیە، ئەم پەردەیە لەم پارچە هۆنراوانەی خۆیا پیشان ئەدا، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

**تا ڕێک نەکەون قەبیلی ئەکراد**
**هەروا دەبنە خراپە ئاباد!**

ئەنواعــی میلەل گــەورە تا بچــووک[1]
خەملْیــوە مەمالکــی وەکــوو بــووک
یــەک بەرگن و یەک زمان و یەک ڕەنگ
بێ غەیبــەت و عەیب و عار و بێدەنگ
دنیــا بــە تــڕان دەخــۆن و دەیــدەن
هــەر چۆنــێ مەرامیانــە دەیکــەن!
هــەر کــوردن ئەگەرچی پاکــی مەردن
پامالْــی زەمانــە مەحــوی کــردن!
هــەر مانــەوە بێنــەوا و مەزلْــووم
وەک بوومــی خەرابــەزار مەشــئووم!
گــەر باعیســی ئــەم دەپرســی کامــە؟
شــەرتێکە، کــە بــۆ هەمــوو تەمامــە
ئــەو شــەرتە بــە کوللــی ئیتتیفاقــە
گــەر مەرعــەش و وان و گــەر عێراقــە
قەســرێکە یەســاغی ئــەو نیفاقــە[2]
گــەر وا نەبــێ هــەر بەتاقــە!

١. «لە گەورە تا چووک» (نوسخە).

٢. «قەسرێکە سواخی ئەو تفاقە» (نوسخە).

**سـەد شـێخ و مـەلا و ئەمیـر و خانـی**
**بـۆ لەززەتـی عەیـش و زیندەگانیـی**
**لـەولاوە ئـەوان بـە حیلەسـازی**
**لەمـلاوە ئەمـان بـە تەقڵەبـازی!**
**قوڕیـان بـە هەمـوو وڵاتـەوە دا**
**تـا موڵـک و ڕەعییـە پاکـی فەوتـا**
**یەکیـان ئەمـی تـۆ دەکـەی نەیانکرد**
**غەمیان نەبوو کـورد ئەگەر هەموو مرد!**

**

حاجـی لـەم هۆنراوانـەدا بانگـی کـوردەکان ئـەکا بـۆ یەکگرتـن و لێک نەپچڕان. ئەڵێ:

وڵاتـی هەموو نەتەوەکان بـە هۆی یەکبوونیانەوە جـوان و ڕازاوەیە، هەمـوو خاوەنی سـەرباز و یەک بـەرگ و یەک ڕەنگن؛ زمانـی بەد لە عاسـتی یەک هەڵناهێنن؛ چۆن بیانەوێ، بەو جـۆرە ڕایئەبوێرن؛ بەڵام نەتـەوەی کـورد لەگەڵ ئەوەشـا کـە هەموو مـەرد و دلێرن، پێشـێلن!. گێجـی زەمـان هەمووی لـەناو بردن؛ بـە زۆرلێکـراوی مانـەوە، وەکوو «کوندەبەبوو»ی شـوومی شـوێن وێرانـە، ئەمانیش بەو جۆرە شـوێن و جێـگایان بووە بـە وێرانە و کەلاوە!. ئەگەر هۆی ئەم پەرێشـانییەش ئەپرسـی چییـە؟ یەک نەگرتـن و دووبەرەکییـە لـە بەینـی یـەکا، ئەم یەکبوونە قەڵایەکە، کـە دووبەرەکی ناتوانێ بچێتە ناویـەوە؛ ئەم قەڵایە

ئەگـەر بە چەکی یەکگرتن نەگیـررێ و نەپارێزرێ، هەموو دەم بە تاک ئەبێ و هەموو کەسی تێئەچێ!.

شێخ و مەلا و ئەمیر و خانەکان، بۆ ژیانی کامەرانی خۆیان قوڕیان بـە هەمـوو وڵاتـەوە دا؛ لـەولاوە دەسـتەی شـێخ و مەلا بـە فێڵبازی و لەملاوە دەستەی میر و خانەکان بە تەقڵەدەوان بۆ بەجێهێنانی مەرامی خۆیان، وڵات و دانیشتووی وڵاتیان هەموو لەناو برد!.. هیچیان ئەمەی تـۆ ئەیکـەی و من ئەیڵێـم -واتە: ئـەم یەک‌قسـەییە و یەکبوونە- هیچ مەبەستیان نەبوو، با ئەگەر کوردیش هەمووی بمرێ!..

**

ئـەم هۆنراوانـە چەنـد شـتێک لـە باری ئەدەبـدا بـۆ ئێمـە ڕوون ئەکەنەوە؛ پەردەیەکی پەرێشانیی ئەو ڕۆژەی کوردمان پیشان ئەدەن و کاروبارێکـی کۆمەڵایەتیی ئەو گێجەمان تێئەگەیەنن، کە چۆن پەرت و بـڵاو بوونەتەوە و چۆن ئەو چینەی کە دەسـەڵاتێکی «مایە»یی وەیا مەعنەوییان هەبووە، بە تەنگ ئەوانیترەوە نەبوون!.

دیسـان ئەوەشمان بۆ ڕوون ئەکەنەوە: کە سـەردەمی ڕۆمانتیک لە ئەدەبی کوردیدا بە تەواوی خەریک بووە پەیدا ببێ و لایەنی کلاسیک لە کزیدا بووە.

هەروەهـا ئەوەمان پیشـان ئەدەن: کە بیروباوەڕی پیشـاندانی بیر و هـۆش خەریـک بووە جووڵاوەتەوە. وشـەی قەڵـەو و زانیاریی عەرووز و سـەروا، ڕوو لە سـەرەولێژی بووە. هەرچەندە هۆنـراوی ئەو گێجەش -کـە بـڕە هۆنراوی‌تـری حاجیش بـەریان ئەکەوێ- هـەر پابەندی ئەو

شـتانە بوون!. بـەڵام ئەم پارچەیە ئەو نموونەیە پیشـان ئـەدا کە دەرگا بـۆ خۆنەبەسـتنەوە بەوانـەوە کراوەتـەوە و وردەوردە هۆنـەرەکان پێـی تێ ئەخەن.

**

ئەگـەر سـەیری زانیاریـی عەرووز بکـرێ، ئەم پارچـە هۆنراوەیە لە گەلـێ شـوێنا پێچەوانـەی ئـەو زانیارییەی تێـدا هەیە!. بـەڵام هۆنەر ویستوویە نیازی خۆی دەربڕێ؛ وە نیازی بەم هۆنراوانەشی، دەربڕینی بیروباوەڕیەتی، نەوەک دروسـتکردنی هۆنـراو؛ واتە: بیروباوەڕ بە هۆنراو دەربـڕێ ـکە نوختـەی کرۆکی بیروباوەڕەکەیە. هۆنـراو بڵێ بۆ هۆنراو و دەربڕینی باوەڕ، لە پایەی دووەما بێ بەچاو هۆنراوەکەوە!!...

هەروەها مەبەسـتی نەبووە سـەروا تەواو بێ یا تـەواو نەبێ، وەکوو ئەمـە بەتایبەتی لـە هۆنراوی پێنجـەم و سـیانزەهەمدا دەرئەکەوێ؛ لە هۆنراوی پێنجەمدا دوو وشـەی «مـەردن» و «کردن» ـ کە کردوونی بە سـەروا بۆ دواییهاتنی هەردوو نیوە هۆنراوەکە ـ. ئەمە بەچاو سـەرواوە تـەواو نییـە، چونکە لە «میم» و «کاف»ـەکەدا بزووتن گـۆڕا!. ئەمە بۆ سەروا زیانی هەیە.

وەیا لـە هۆنراوی سـیانزەهەمدا دوو وشـەی «نەیانکـرد» و «هەموو مرد» پێچەوانەی یاسای سەروایە!. وەیا هەر لەو هۆنراوەدا کە ئەڵێ:

**«یەکیـان ئەمـی تۆ دەکـەی نەیانکرد»**

تۆ هیچت نەکردووە تا پێت بڵێ «ئەوی تۆ ئەیکەی»!. بەڵکوو ئەبێ بڵێ: «ئەمی تۆ ئەیڵێی». هەرچەندە ئەگەر لەباتی «دەکەی» «دەیڵێی»

بێ، کێشی هۆنراوەکە تێک ئەچێ، بەڵام بەرانبەر بە هۆنراوی هۆنەرێک ئەمە شوێنی ڕەخنەیە!...

دیسان ئەگەر مەبەست بە داڕشتن داکوتانی وشە بێ یەک لە بەرانبەری یەکەوە بۆ ئەوە کە هونەر بۆ هونەر دروست ببێ، ئەم هۆنراوانە ئەوەی تیا دەرناکەوێ!. چونکە ڕێختەکەی ئەوی هونەر داوای ئەکا ئەوەی تێدا نییە!. بە تایبەتی لەم پارچەیەدا؛ وشەکان لێک پچڕاون، لەگەڵ سەردەمی بزووتنەوەی هەستی نەتەوایەتیدا، ئەبێ هەستی ئەوەش ببزوێ کە وشەی خاوێنی ئەو زمانە بخرێتە ئاوێنەی ئەدەبەکەیەوە.

بەڵام ئەگەر مەبەست بە هۆنراو لەسەر ئەو بیروباوەڕە کە هونەر بۆ هونەر نییە و بەڵکوو گوزارە ئەهێنرێتە بەرچاو، ئەوە لێرەدا گوزارەی هۆنراوی داوە بە دەستەوە و ئەتوانێ سۆزی خوێنەر بێنێتە جووڵە، وە ئەتوانین بێژین ئەم هۆنراوانە وا ئەدەن بەدەستەوە: کە خاوەنەکەی خۆی بە گوزارەوە خەریک کردووە، نەوەک بە وشەوە.

خۆ ئەگەر بێینە لایەنی نیاز و زنجیرەی بیرەوە، ئەوە شوێنی خۆی پڕ کردۆتەوە و هەردوو مەبەستەکە هەیە؛ ئەو نیازی دەربڕینی هەستی نەتەوایەتییە، لە سەرەوە کە باسی ئەکا، بەبێ پچڕانی، زنجیرەکە ئەهۆنێتەوە تا دوایەکەی.

***

# پیرەمێرد

## ١٨٦٧ - ١٩٥٠

لــە نیوەی دووەمی سـەدەی نۆزدەهەمدا جۆری ئـەدەب بە تەواوی گۆڕا، چ لە شێوەدا، چ لە بیروباوەڕدا، چ لە ساز و ئاهەنگدا. ئەمانە هەتا ئەهاتن بەملاوە ڕواڵەتی گۆڕانەکەیان ڕووناکتر ئەبووەوە.

ئەم گۆڕانی ئەدەبەش لەبەر گۆڕانێکی بەگوڕی ژیان بووە کە ڕۆژبەڕۆژ لــە پلەیەکەوە ئەچووە پلەیەکی‌تر، لە باوەڕێکــەوە ئەچووە باوەڕێکی‌تر. ئـەم جۆرە شـتانە ئەبوون بــە دەریایــەک و ئەدیبەکان بــە مەلەوانیی ئەکەوتنە ناویەوە و هەریەکەیان جۆرە دوڕێکی لێ‌دەرئەهێنا.

دیارە کــە ژیانی تێکڕایی گۆڕا، ژیانی تاکیش ئەگۆڕرێ؛ ئەدیبەکەش کــە تاکێک بــووە، گۆڕانــی ژیانەکەی ئــەو بەهۆی بینینی شــتی تازەی لەسەریەک لەسەریەک و بەهۆی گەڕان و پشکنینی لە کەلێنی گەلێ لە شـوێنەکانەوە، لەوانە بوو بەتینیتــر بێ لە ژیانە تێکڕاییەکە. کەوابوو، گۆڕانــی ئــەدەب لەو چەرخە بــەدواوە دوو ئــەوزار کاری تێ کرد: یەکێ گۆڕانی ژیانی تێکڕایی، یەکێ گۆڕانی ژیانی تاکەکە.

جا یەکێک لەوانە کە شۆڕشـێکی لە گۆڕانی ئەدەبی کوردیدا خستە ناوەوە، «پیرەمێرد» بوو.

وێنەیــەک لە ئەدەبی ئەو، کە وێنەیەکە بۆ گۆڕانی ئەدەبی کوردی، ئەم پارچەیەتی کە ئەڵێ:

(١) ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بە شەو
وەک من بەداخەوەن، نە سرەوتیان هەیە نە خەو
(٢) چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێدارییی یەکترین
وەک سەرسەرین، شەوێ سەرێ ناکەینە سەرسەرین!
(٣) من خوار و ژوور لەدەستچووەکەی بێولەت، ئەوان
وەک خێڵی خوار و ژوورکەری کورد، وێڵی ئاسمان!
(٤) شەو، شەونمی ئەوانە، چیمەن ئاو ئەخواتەوە
ڕۆژ، هەڵمی ئاوی چاوی منە، سەریەخاتەوە!
(٥) دوێشەو بەری بەیان بوو، دەگریان بەسەر منا
منیان کەساس ئەبینی لەناو دۆست و دوژمنا!
(٦) دڵسۆزی وام نەدیبوو کە بۆم بگری وەک خەشیم
فرمێسکەکەی ئەوان بوو، بە ئاونگی تێگەییم!
(٧) «با»م ڕاسپارد کە خەفەت بۆچ ئەخۆن ئەوان؟
وەک ئێمە نین، نزیکتری لای بارەگای خوان!
(٨) ڕاسپێرییان نووسیبوو بە شەونم لەسەر گیا
تا ئاسمان پڕیشکی بەدی ئێوە هەڵپژا!
(٩) هاواری کوردەکانی سەروو گەییە ئاسمان
بەو دووکەڵی هەناسەیە ئاو دێ لە چاومان!

**گوزارەی هۆنراوەکان یەکەیەکە:**

(١) ـ ئەو ئەستێرانە کە لەو ئاسمانە بەرزەوەن و بە شەو پرپیشک ئەهاوێژن و ئەدرەوشێنەوە، وەکوو من چۆن بەداخەوەم، ئەوانیش وانە؛ نە ئارامیان هەیە، نە خەویان هەیە!.

(٢) ـ دەمێ ساڵە! کە ئێمە و ئەوان ئاگامان لە بەئەگایی و شەونەنووستن و شەونخوونیی یەک هەیە، وەکوو یەکێ وێڵ و سەرگەردان بێ، هیچ شەوێک ڕێ نەکەوتووە کە سەرێک لەسەر سەرین دابنێین و تۆزێ بحەسێنەوە!!...

(٣) ـ من خوار و ژوور کردنم لەدەست چووە و گەرمیان و کوێستانم بۆ نەماوەتەوە!. ئەوانیش هەژار و بەدبەختن، هەر وەکوو ئەو خێڵە کوردانە کە هەر خەریکی هاتوچۆن، ئەوانیش بەو جۆرە سەرگەردانن لە ئاسمانا و هاتوچۆ ئەکەن!...

(٤) ـ بە شەو کە چیمەن ئاو ئەخواتەوە و ئاو ئەکەوێتە سەری، ئەوە شەونمی ئەوانە دائەڕژێتە سەری!. بە ڕۆژیش هەڵم و بوخاری فرمێسکی چاوی منە کەوا ئەو، سەری ئەخاتەوە؛ واتە: کوورەی ڕۆژ!...

(٥) ـ دوێنێ شەوێ لە دەمی بەیانا ئەگریان بەسەر منا؛ بۆیەش ئەگریان، چونکە منیان بە زەبوون و بێدەسەڵات چاوپێئەکەوت لەناو هەموو دۆست و دوژمنێکا!..

(٦) ـ قەت دڵسۆزی وام نەدیبوو کە وەکوو یەکێکی نەشارەزا و نەزان وا بە کوڵ بۆم بگری!. واتە: چۆن نەشارەزایەک دیمەنێکی دڵتوێنەرەوە ببینێ، بەبێ ئەوە لە دەسەڵاتیا بێ، دەست ئەکا بە گریان!. ئەوە فرمێسکەکەی ئەوان بوو ئەهاتە خوارەوە، کەچی من بە شەونمی

تێئەگەیشتم!!...

(٧) ـ ئەمجا «با»م کرد بە ڕاسپێر و چەپەرکە پێیان بڵێ: بۆچی وا خەفەت ئەخۆن؟!. خۆ وەکوو ئێمە نین. ئەوان نزیکترن لە بارەگای خوا لە ئێمە!..

(٨) ـ ئەوانیش وەڵامی ڕاسپێر و چەپەریان بە زوخاڵاوی شەونم لەسەر گیا نووسیبوو؛ نووسیبوویان: کە هەتا ئاسمان پریشکی خراپەی ئێوە هەڵپڕژا و بەرز بووەوە!!...

(٩) ـ هاواری ئاه و ناڵەی کوردەکانی ئەو سەرە ـ شیمال ـ گەیشتە ئاسمان، ئەوە دووکەڵی هەناسەی دڵ هەڵکرووزاوی ئەوانە کەوا ئەبێتە هۆی ئەوە ئێمە ئاو لە چاومان دێت و بە قوڵپ دەست ئەکەین بە گریان!!...

❀❀

ئێمە کە سەیری سەردەمی ئەم هۆنراوانە و سەردەمی پێش پەیدابوونی ئەم هۆنراوانە ئەکەین، بە تەواوی بۆمان دەرئەکەوێ: کە شۆڕشێکی ئەدەبیی لە ئەدەبی کوردیدا پەیدا بووە.

بەڵێ! لەسەر ئەو قسانە کە ئەکرێن، ئەم هۆنراوانە ئاشنایەتییەکی تەواویان لەگەڵ زانیاریی عەرووزدا هەیە؛ بەڵام شێوە و دارشتنیان گەلێ جیایە لە شێوە و دارشتنی ئەدەبی پێش ئەو سەردەمە. بگرە دەروازەیەکە و خراوەتە سەرگازی پشت بۆ دانانی ئەدەبی کوردی بە کوردی پەتی لەسەر ئەو شێوەیە.

لە پارچە ئەدەبییەکانی ئەو گێجەدا کە کلاسیک باڵی کێشابوو

بەسەر ئەدەبدا، ئێمە نموونەیەکمان بەرچاو ناکەوێ کە چۆن لە بیردا تازە بێ، بەو جۆرە لە وشەشا هەر تازە بێ.

بیر دیارە تازەیە، چونکە گونجاندنی دوو شتی لە دیمەن دووردا و لە سیفەت نزیکدا بە یەک‌کردن بۆ مەبەستێکی تایبەتی -کە سەرلێشێوان بێ بەهۆی بێ‌لانەییەوە- وە بەتایبەتی‌تر بێ‌ئارامیی بێ لە نیشتماندا و باسکردنی نیشتمان بەم جۆرە؛ ئەمە جێی گومان نییە کە بیرێکی تازەیە و ئەو جۆرە بیرە بەم جۆرە شێوەیە لە پێشترا نەکراوە.

ئەم بیرە کەمتر کراوە کە گەڕانی ئەم، لەبەر بێ‌لانەیی، چ داخێکی داوەتێ؛ گەڕانی ئەستێرەش چەشنی داخی داوە بە ئەستێرەکە!. هەردوو لایان لە یەک نوختەدا بوون بە یەک.

وەیا کۆچەری بێ‌جێگای کورد، چۆن وێڵە لەسەر ئەم زەوییەدا، ئەوانیش بەو جۆرە لەو ئاسمانەوە سەرگەردان و لانە شێواون!...

ئەم لەتاو دەردی بێ‌لانەیی ئەگرییێت و لە ڕۆژی ڕووناکا فرمێسک هەڵئەڕێژێ، کەچی گەرمایی ڕۆژ ئەو فرمێسکە ئەکا بە هەڵم و ئەیبا بۆ ئاسمان!. کە کەوتە شەوێ، ئەبێتەوە بە شەونم و ئەڕژێتەوە سەر زەوی. کەوابوو، بە ڕۆژ ئەم و بە شەو ئەو، هەردوو لایان هەر لەبەر ئەو دەردە هاوبەشییە لە گریاندان!!...

کە بەم جۆرە من لە دەردی ئەوان تێگەیشتم و بۆم دەرکەوت کە زاریی ئەوانیش لەبەر ئەو شتەیە کە منیشی پێ‌گیرۆدەم، بە چەپەری «با»م وت پێیان بڵێ: لەبەر ئەوە ئەوان نزیکترن بە لای خواوە نیازیان زووتر گیرا ئەبێ، داوای لێ‌بکەن هەردوو لایان لەو لانەشێواوییە ڕزگار بکا. کەچی ئەوان وەڵامیان دایەوە: پڕیشکی خراپەی ئێوە ئێمەشی

گرتـەوە!. چونکـە ناڵە و هاواری هەنـدێ لە کوردەکانی ئێوە لە دەسـت جـەور و سـتەم، ئـەو ناڵەیە دووکەڵـی بەرداوەتە دڵی ئێمـەش و لەبەر گریان کاتی پاڕانەوەمان بۆ نەماوەتەوە!!...

بەڕاسـتی ئەم بیرە تا ئەوپەڕی تازەیی تازەیە. ئەمجا وشـە: ئەیژین وشـەکانیش تازەن. مەبەسـت ئەو نییە کە ئەم وشـانە دروستکراو وەیا تازەکـوورەن و خراونەتـە ناو زمانـی کوردییەوە؛ مەبەسـت ئـەوە نییە، چونکـە ئەم وشـانە لەگەڵ بناغەی زمانەکەدا هـەر هەبوون و هاتوون، بـەڵام داڕشـتنیان بە وجـۆرە خسـتنە ناو چوارچێوەی هۆنـراوەوە، ئەمە تازەیـە و بەو جۆرە تا ئەو سـەردەمە نەکراوە. هەر ئەم داڕشـتنەیە کەوا بەو چەشـنە شێوەیەکی ئەدەبیی بەرزی لە زمانەکەدا دروست کردووە؛ لە دروستکردنی، شێوە ئەدەبییەکە بە تەواوی سۆزی تیا کەوتۆتە جووڵە، وەکوو چۆن پەردەیەکی ڕۆمانتیکیش لە بیر و داڕشتنەکەوە پەیدا بووە و زنجیرەی بیری هۆنیوەتەوە!..

وەیا بە جۆرێکی تێکڕایی ئەتوانین بڵێین: وشـەی «ئەدرەوشێتەوە» لەگەڵ ئەسـتێرە و شـەودا چەندە شوێنی خۆی گرتووە، وشەی ڕستەی «نەسـرەوتنیان» لەگەڵ داخ و دەردی نەنووسـتندا زیاتر ئەو شوێنەی گرتووە!..

لـە نیوەی دووەمی هۆنراوەی دووەمدا دوو ڕسـتەی «سەرسـەرین» ڕەگەزدۆزییەکی تەواو دروست بووە بە دوو وشەی کوردی پەتی.

سـۆز هەر ئەوەنـدە ئەتوانێ بجووڵێ کـە دوو «خـواروژوور» لە دوو شوێنی هۆنراوەی سێیەمدا بە دوو بارا جووڵاندوویەتی!...

«شەو» و «شەونم» و «چیمەن» وەکوو دانانی نقێمی ئەڵماسن لەناو

ئەنگووسیلەی زێڕدا!!...

دارِشـتنی: «فرمێسکەکەی ئەوان بوو، بە ئاونگی تێگەییم!» بەرانبەر بە «دوێ شـەو بەری بەیان بوو دەگریان بەسـەر منا» بە تەواوی مافی داوە بە فرمێسکێک کە ئاونگێکە و لە بەرەبەیانی شەوێکی سافی دوور لە هەموو تەمێکەوە ئەبێ!!...

چ ئەندێشەیەکە کە خاوەنی ئەم پارچەیە کردوویەتی بۆ دروستکردنی «ڕاسپێرییان نووسیبوو بە شەونم لەسەر گیا؟» کە یەکە یەکەی وشەکان بە تەواوی شـوێنی خۆیانیان گرتووە و ڕێکەوتنیان بە تەنیشت یەکەوە بۆ ڕاکێشانی گوزارە، بە تەواوی ئەیسەلمێنن: کە هۆنراو جادووە!!..

ڕاستە دووکەڵ ئاو لە چاو دێنێ، بەڵام هەتا چەشنی دووکەڵەکە جیا بێ، ئاوی چاوەکەش جیا ئەبێ؛ ئەو چەشـنە دووکەڵەی لەو هۆنراوەدا هەیـە ـکە دووکەڵـێ هەناسـەی هەڵقرچـاوی دەرد و مەینەتـە- ئەبێ چ جـۆرە ئاوێک لە چاو بێنــێ؟!.. جۆرە ئاوێک دێنێ کە وشـەکانیش بەرانبەر بە گوزارەکە هەر زۆر کورتن، مەگەر پەنا بەرینە بەر مەزهەبی ڕەمزیــی، بۆ ئەوە تۆزێ بتوانرێ شـوێن و جێگای ئەم وشـە و گوزارانە بزانرێ...

کەوابوو، ئێمە ئەتوانین بڵێین: ئەم هۆنراوانە لەبەر ئەم شتانە کە باس کران، دەرگای سـەردەمێکی ڕومانتیک لە ئەدەبــی کوردیدا ئەکەنەوە، کـە ئەم دەرگایە، بەم جۆرە پێش ئەم گێجە نەخراوەتە سـەر گێجەنە تا ئێستە...

***

# سەلام

## ١٨٩٢ - ١٩٥٩

ئـەو دیرەکـە کە ئەدرایـە ژێر دەواری ئەندێشـە و بیـروباوەڕ، وەکوو دیرەکی ژێر ڕەشـماڵی خانەدانان کە هەر ڕۆژە بە جۆرە نەیجووڵێک[1] ڕواڵەتەکـەیان ئەگـۆڕڕێ، ئەمیـش بەو جـۆرە لەم چەرخـەدا بە جۆرە وشـەیەکی‌تر ئەو دەواری ئەندێشـە و بیرە هەڵئەدرا؛ وشەی سادە کەوتە باو بـۆ دەربڕینـی ئـەو هەسـتە ناسـکانە کە لـە دەروونـی هەندێ لە هۆنەرانی ئەم گێجەدا پەنگی خواردبووەوە!.. وەکوو ئەندێشـەی ناسک ئەخرایە بەرچاو، وشەی ساکار زیاتر ئەدرایە بەر بیستنی پەڕەی گوێ!..

ئەمانـە هەموو لەبـەر ئەوە بوون: کە سروشـت لە عاسـتی خۆیـدا هەسـتی بە گـۆڕان کردبـوو، وەیا ئەیەویسـت ئـەو دیمەنـە هەیەتی و لەگـەڵ چۆنیەتیدا یەک شـتن، ئەو دیمەنە بە ڕاسـتی و ڕەوانی چۆنە، هەر بەوجۆرە بکەوێتە بەر بیبیلەی چاوی هەموو کەسێکەوە!..

جا وێنەیەک بۆ ئەم وەسپە کە ئێمە باسمان کرد، ئەم پارچە «زیادکراو ـ مُسـتزاد»ەی «سەلام»ـە، کـە لە دیمەنی وشـەی سـادە و خەیمەی ئەندێشـەی بـەرزدا هیـچ لەگەڵ دیمەنی ڕاسـتیدا جیـا نەبووەتەوە، لە کاتێکا کە ئەڵێ:

---

١. [نەیجووڵ: جۆرێکە لە قامیش، زەلێکی باڵابەرزە کە پاییزان گوڵ دەکا].

(١) دڵـە! کوورەی خـەم کۆمەڵـی زووخاو
سا دەی خورۆشێ
مووشـەدەمەکەی هەناسـەی پـڕ تـاو
دەخیلە جۆشێ

(٢) گۆمـی خوێنینـی چەمـی گریانـم
هانا خوێناوێ
بناوانەکـەی جۆگـەی چاوانـم
ئاوێ، لافاوێ!

(٣) سـا دەی بـا بـڕوا پڕیشـک بـە تـاو
شەرارەی ئاگر
بـۆ جـەرگ و دڵ و نـاو سـک و هەنـاو
یەک گڵپەی یەک گڕ

(٤) تیـر لەسـەر تیرە ئـەو هـەردە و دەورە
چڕەیە جەنگەڵ
قامیشـەڵانە، بێشـەیە، نـەورە
بۆچەکە دووکەڵ!

(٥) سـەر بکا پێچ پێچ دووکـەڵ لە دەروون
وەکوو هەوری تار
تاریـک و نووتەک ڕووی سـەما گەردوون
چەرخی کردگار

(٦) بـدا بەیەکـدا هەورەکـەی بەهـار
سەرشاخ و سەرشاخ
ڕووبـەڕووی چیـا و هـەردە و کۆهسـار
لەیلاخ و ئێلاخ

**(٧) «پیرەمەگــروون» و «گۆیژە» و «زمناکۆ»**
**«بێزەل» و «بەمۆ»**
**«پەیکولّــی»، «زەردە»، «کاژاو»، «دالّەهــۆ»**
**«شندروێ»، «شاهۆ»**

**(٨) یەکســەر دابگــرە سەراســەر بــە تــەم**
**وەکوو دڵ بەخەم**
**بــاران، بڕێــژە تاوتــاو بــە خــوڕەم**
**فرمێسکەکەی چەم!**

**(٩) تەپونــم داکــە بــە شــارەزوورا**
**نەک بە ڕەهێڵە**
**هــەواری «شــەم» بوو، لــە خــوار و ژوورا**
**ڕێپێڵگەی خێڵە!**

**(١٠) کــەی ڕژا بــاران بــە کوردوســتانا**
**گوڵگوڵی خوێنین**
**هەناســەی منــە لــە بەربەیانــا**
**دەمی گریە و شین!**

******

سەلام لەم پارچەیەدا زۆر بە ساکاری دێتە ناوەوە و ڕوو ئەکاتە دڵی بەخەم و خەفەتی خۆی و ئەڵێ:

(١) ـ ئەی دڵەکەم! کەوا بوویت بە کوورەخانەیەکی خەم و خەفەت و ئاخ و داخ و زووخاو، ئادەی خورۆشێکی سادە بنوێنە!.. ئەی دڵەکەم! لەبەر بوونت بە کوورەخانەی خەم، ئەو کوورەخانەیە مووشەدەمەی ئەوێ، مووشەدەمەکەت هەناسەی گەرمی بەتینمە! دەخیلت بم

جۆشێک بدە و بجۆشێ!!..

(٢) ـ گریانە زۆرەکەم کە ڕووبارێکی خوێنینی دروست کردووە، دەخیلە دەسا تۆیش خوێناوێک!!.. ئەی بنج و بناوانی جۆگەی چاوەکانم!. ئادەی ئاوێک، لافاوێک با بێت!!...

(٣) ـ ئادەی! دڵە پڕ تاوەکەم دە با بڕوا پڕیشک بە خێرایی، کام پڕیشک؟ پڕیشکێک کە ئاگری بڵێسەی ئەو کوورەی دەروونمە و هەناسەکەم لێی داوە و کڵپەی سەندووە و کردوویە بە وەکوو زمانەی ئاگر!. بۆ کوێ بڕوا؟ بڕوا بۆ ناو جەرگ و ناو دڵ و ناو سک و ناو سپڵ!. چی بڕوا؟ گڕە و کڵپەیەک!!..

(٤) ـ ئەو دەروونە! ملەملە و تیرەتیرە و هەردەبەهەردەیە، پێچە و دەورەیە، چڕە، بێشەڵان و دارستان و دەوەنی پڕە، کوورەی دڵە کە بۆچەکی سووتان و دووکەڵی لێ هەستاوە!.

(٥) ـ دووکەڵی ئەو دەروونە پێچپێچ و لوول‌لوول بێت و ببێ بە وەکوو هەوری تاریک؛ لەمانەوە ڕووی چەرخی ئاسمان قەتمەر و تاریک بووە و چەرخی گەردوون؛ چاو، چاو نابینێ!!..

(٦) ـ هەوری بەگوڕی بەهار بیدا بەیەکا و بیبا شاخەوشاخ و چیابەچیا، بیبا ڕووبەڕووی هەردە و کێوەکان و ڕووبەڕووی سەردەسێر و گەرمەسێر ـ کوێستان و گەرمیان ـ.

(٧) ـ بڕوا ڕووبەڕووی شاخی «پیرەمەگروون» و شاخی «گۆیژە» و چیای «زمناکۆ» و کێوی «بێ‌زەل» و زەردی «بەمۆ»!. لەوێشەوە هەر بڕوا دەشتی «پەیکوڵی» و چۆڵی «زەردە» و کێفی «کاژاو» و ماهی «داڵەهۆ» و وڵاتی «شندروێ» و مای «شاهۆ» بکرێتەوە!..

(٨) ـ ئـەم شـوێنانە هەموو بـە تەمومژ دابگرە وەکـوو چۆن دڵ بە خـەم دائەگری، بـەو جۆرە بـە!. بارانی بـە خـوڕی تاوتاو دابڕێژە ئەی فرمێسکەکەی چاو!...

(٩) ـ وردەوردە دایکـە بارانەکـەت بـە وڵاتـی شـارەزووردا، بەڵام نمەنمـە و هێدیهێـدی، نەوەک بە ڕەهێڵە و بە زۆری؛ ئەو شـارەزوورە کە هەوارگەی «شەم»ـی نازداری «وەلی دێوانە» بوو؛ ئەو شارەزوورە کە ڕێبازی خێڵ و عێلە!...

(١٠) ـ کەی وە چ وەخت باران ڕژا بە کوردوستاندا، ئەرزەکەی گوڵ گـوڵ کـردەوە بە خوێن، ئەوە هەناسـەی منـە لە بەری بەیانـدا، کاتی گریان و زارییە!!...

❀❀

قسـەکردن لـەم هۆنراوانـەوە، قسـەکردنە لـە ڕێختێکـی سـادەی ئەدەبی کـوردی، کە لەناو هۆنەرەکانی ئەم گێجەدا هۆنراوی «سـەلام» لـە هەمـوویان زیاتـر ئەم شـێوەیە پیشـان ئـەدا. هەروەها لـە هێنانی پارچەیـەک لـە هی هۆنەرێک لە لایەن چەشـەوە، ئـەوە دەرئەخا کە چەشە و ڕێگای ئەو هۆنەرە لە باری ئەندێشە و بیر و داڕشتن و نیازەوە چۆن بووە؟!..

دوو جـۆرە لێکۆڵینـەوە هەیە: یەکـێ لێکۆڵینەوە لـە هۆنەر کە چەند ڕێگای گرتووە و چۆن بووە لە گرتنی ئەو ڕێگایانەیدا؟. ئایا سـەرکەوتووە یان نـەء!.. جۆرێکی‌تـر لێکۆڵینەوەیـە لە تێکڕای شـێوەی ئـەو هۆنەرە بەرانبـەر بـەو ماوە ژیانە کـە تیایا ژیاوە، وە لەلایـەن ئەدەبەوە چ جۆرە

ڕێخت و وشە و گوزارەیەکی هەڵبژاردووە و چۆن توانیویە گوزارشت لە گوزارە بداتەوە؟.. ئەم نموونانە کە لەم کتێبەدا لە بەشی لێکۆڵینەوەکەیدا هێنراون، بۆ ئەم ڕێگای دووهەمەیە. جا قسەکردنەکەشمان لە هۆنراوی سەلامەوە هەر بۆ ئەم مەبەستەیە...

کەوابوو، پایەی ئەم هۆنراوانە بەرانبەر بە ئەدەبی کوردی ئەوەیە: کە هەتا ئەوپەڕی سادەیی سادە و ساکارە، هیچ عەزیەتێکی بۆ وشەدانان تێدا نییە، هەموو وشەکان وشەیەکن کە ڕاستەوڕاست لە جەرگی وشەی سەر زاری ڕەمەکی کوردەوارییەوە هەڵێنجراوەن؛ بەلای وشەی لادێیی و کۆچەریدا زیاتر ئەڕوا تا بەلای وشەی شاریی و تێکڵاو بە شارستانییەوە!. کاتێ کە ئەخوێنرێنەوە، وا ئەچێتە دڵەوە: کە هەموو کەس پێی ئەکرێ شتی وا دابنێ، کەچی واش نییە؛ دیارە ئەم وا نەبوونەی زیاتر لەبەر ئەوەیە: کە ئەو هێزی هۆنەرییە لە خاوەنی ئەم هۆنراوانەدا هەیە، لە یەکێکی‌ترا نییە؛ بۆیە وا بەو جۆرە پەردەکەی ـوەکوو ئەڵێن ـ ئەبێ بە «سَهْل»ی «مُمْتَنِع»!...

گەلێ وشە لەم هۆنراوانەدا هەیە کە بوونی بە گوزارشت بۆ گوزارەکەیان زۆرزۆر سادەیە و لەوانەیە من و تۆ کە بەرچاومان ئەکەوێ، لێمان تێک ئەچێ: ئایا ئەمە ئەو وشانەیە کە ئێمە گوزارەکانیان ئەزانین؟ یا وشەیەکی‌ترن بۆ ئەو گوزارانە کە ئێمە ئەم وشانەمان نەبیستووە؟!.. بە وێنە:

«کۆمەڵی زووخاو، هەناسەی پڕتاو، چەمی گریانم، جۆگەی چاوانم، سەر بکا پێچ‌پێچ، هەوری تار، سەرشاخ و سەرشاخ، لەیلاخ و ئێلاخ، سەراسەر بەتەم، وەکوو دڵ بەخەم، ڕێ‌پێڵگەی خێڵە، گوڵ‌گوڵی

خوێنین».

ئەمانە هەموو جۆرە وشەیەکن کە بەسەر زاری هەموو کەسێکەوەن، هەموو کەس ئەیانڵێ؛ بەڵام ئەو گوزارە بەسۆزەی لە کۆمەڵی زووخاو و هەناسەی بەتاوی گوزارشتی ئەم هۆنراوانەدا هەیە، ئەو گوزارەیە بەو سۆزە لە دڵی و من و تۆدا نییە!!. چەمی گریان و جۆگەی چاوان من و تۆ ناتوانین وا دای برێژین!.. دووکەڵی دەروون بەو پێچە و دەورەیە سەر بکا لەیلاخ و ئێڵاخ و سەرشاخە و شاخ بگرێتەوە؛ گەلێ جیایە لەو چەمکانەی کە ئێمە لە پێچ‌پێچ و هەوری تار لەسەر شاخ و لە ئێڵاخ و لەیلاخ وەری‌ئەگرین!!.

دڵ خەمی تێدا ئەبێ، بەڵام ئەو شوێنانە کە ئەم دایان بگرێ وەکوو چۆن خەم دڵ دائەگرێ، ئەمە بڕوا ناکەم جگە لە بیری هۆنەرێکی خاوەن چەشەی تایبەتی نەبێ، یەکێکی‌تر ئەم جۆرە چەمکە بخاتە بەر دەستمان!. «ڕێ‌پێڵگەی خێڵ» هەموو کوردێکی خێڵەکی ئەیڵێ، بەڵام هەموو کوردێک ناتوانێ ئەو سۆزەی تێدا کۆ کاتەوە!.. چەمکی «گوڵ‌گوڵی خوێنین» کە ئەم هۆنەرە تێکڵاوی کردووە بە ڕژانی باران و نووساندوویە بە گریە و شینی خۆیەوە، ڕاستە هەمووی پێکەوە جۆش داوە!!...

❋❋

لە سەرەتای پارچەوە تا دواییەکەی، چ نیازێک هەبووە بە زنجیرەی بیر هۆنیویەتەوە. ئەندێشە هەر بەو جۆرە ئەبێ کە لەم هۆنراوانەدا هەیە و فڕین هەر ئەوەندە بەهێزە کە ئەو فڕیوە!.. گومان نییە: سۆزەکەی

نەوەک خۆی، بەڵکوو هەموو کەس ئەجووڵێنێ. زیاتر لەمانە دارشتنی ئـەم هۆنراوانـە لە سـادەیی وشـەکانا بەجۆرێکـە: کـە چۆنیەتییەکی تـەواوت ئەخاتـە بەرچاو، کەچی خورۆشـەکەی دەمـاری گەلێ کەس ئەهەژێنێ!!...

لـە ئەنجاما، وەکوو بۆمـان دەرکەوت: ئەدەبی سـەلام ـکە پەردەی ئەدەبی کوردیی لەم چەرخەدا پیشان داوە- ئەدەبێکی ڕووتی کوردییە، دوورە لـە هەمـوو جۆرە عەزیەتێکـی هۆنراوەیی بەچـاو هۆنەرێکەوە؛ دیمەن و باسی پێکەوە دووریوە. ئەمانەی هەموو تێدا هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمانەشا ناتوانرێ بوترێ بە تەواوی لە کلاسیک دوور کەوتۆتەوە!..

بەڵکوو ئەگەر کلاسـیک و ڕومانتیـک تیایا بەراورد بکرێ ڕێچکەی کلاسیکی زۆرترە تا ڕومانتیک، وەلێ ئەتوانرێ بوترێ: لە سەردەمی ئەودا هێشـتا کلاسـیک گەلێ باوی هەبووە، بۆیە ئەدەبـی هۆنەرێکی وەکوو سـەلام ـلەگـەڵ ئەو هەموو کۆششەشـا کە کردوویە بـۆ خۆ لێلادان- هـەر نەیتوانیـوە خۆی لـێ لادا!.. وا دیارە ئەمەش لەبەر ئـەوە بووە: کە زۆرتـر چەشـەکەی لەسـەر چەشـەی هۆنەرانی پێشـوو بووە، لەسـەر زارا کۆششـی کـردووە بۆ ئەوە کە لەگەڵ ڕومانتیکـدا جووت بێ، بەڵام بێ‌کەڵک بووە!!.. ئەوەندە هەیە: بۆ هێنانی وشەی ساکاری کوردی دوور لـە هەموو عەزیەتێکەوە، ئەدەبەکەی ئەم یەکێکی بەبایەخە لە ئەدەبە بەرزەکانی کوردی.

***

# نووری شێخ سالْح

## ١٨٩٦ - ١٩٥٨

لـه سـەرەتای سـەدەی بیسـتەمەوە ئەدەبـی کـوردی بە تـەواوی ڕەنگێکی‌تـری وەرگـرت، هۆنـراو ـکـە بەشـێکی هـەرە بەبایەخـە لـە ئەدەبەکە- هەتا ئەهات سـنگی بۆ پێشـەوە زیاتر ئەنا، بۆ دۆزینەوەی شـتی تازە. بە تەکان کەوتە سـەر ئەوە: کە دەستی عەرووز لە یەخەی خۆی بکاتەوە، بژاری خۆی بکا لە وشەی بێگانە، باوەش بکا بە گوزارەی تازەدا. ئەو کۆششـە کە هۆنراوی ئەوە، پێشـی ئەخسـتە سـەر وەسپی یەکێک وەیا دیمەنی کەسـێک، ئەم خسـتیە سـەر وەسپ بۆ گشت و بـۆ کـرد و کردەوەی تێکڕایـی؛ ئەو کرد و کردەوانە کە ئاشـنایەتییان بە ژیان و بـە بـەری ژیانەوە هەبوو و هەیە!. هاتە سـەر ئـەوە: کە ژیان بـۆ هەموو کەسـێکە؛ ئەو هۆنراوانەی کە هۆنەرێـک دایانئەنێ، وەکوو ژیانەکـە ئەبـێ هەموو کەس بەشـی خـۆی لێیان وەرگـرێ؛ واتە: ئەو پارچـە هۆنراوەیە ـکە وەکوو گوڵجاڕێکە- ئەبێ لەوانە بێ هەر گوڵێکی بەر یەکێ بکەوێ.

یەکێ لەو کەسـانە کە هەندێ لەم ڕێگایانەی گرت «نووری شێخ سـالْح» بوو، ئەم، هۆنراوەکانی وا پیشـان ئەدەن کە لە شۆڕشـگێڕانی ئەدەبی کوردی سـەرەتای ئەم سەدەی بیستەمەیە. جا ئەمە یەکێکە لە پارچە هۆنراوەکانی، لە کاتێکا کە باسـی «ژیانی ئادەمیزاد» ئەکا و ئەڵێ:

لەنـاو شـەپۆلی غەمـا سـەرنگوون و بـێ ئـارام
بـە کێـوی سـەختی ژیانـا بـە پـێ، بـە چنگەڕنـێ
خەریکـی هەڵمەتـی سـەرکەوتنە بگاتـە سـەرێ[١]
لەپـڕ نشـێوی کوڵۆڵـی بـواری لێـی ئەتەنـێ
بـە داوی یەئس و ئەلـەم، تاروپۆی لە ئێـش و لە زام!

❋❋

زەبـوون و ڕێ‌هەڵەبووی دەشـتی چۆڵ‌وهۆڵـی ژیان[٢]
شکسـتەباڵ و شـپرزەی پـلاری دەسـتی قـەدەر
کەسـێ نییـە کـە لـە لاوە دەسـێ بداتـە دەسـی[٣]
یەکـێ نییـە خەفەتـی خـۆی لـە لا بـدا بە هـەوا[٤]
بـە لایـەکا بیـەوێ لا بـدا نییـە ڕەهبـەر!!

❋❋

لـە بەردەمیـوە تـەم و مـژ بـە سـوورەتێکی وەهـا[٥]
هەتاکـوو چـاو بـڕ ئـەکا تونـد و تـار و بیمـاوەر

---

١. [«بگاتە مەرام» (نوسخە)].

٢. [«چۆڵوهۆڵی بەڵا» (نوسخە)].

٣. [«نە دەستگیرێ لە لاوە» (نوسخە)].

٤. [«نە هاودەمێ خەفەتی خۆی» (نوسخە)].

٥. [«لە بەردەسیشیەوە تاریکە سێبەرێکی وەها» (نوسخە)].

**ئـەدا بــە لایــەوە بــۆی دێتــە پێکەنیــن بە گەمــە[١]**
**هــەوڵ ئــەدا کــە بچــێ بیگــرێ و لــەرێ لادا[٢]**
**چلــۆن ئەگیــرێ تــەم و مژ بــە ناتەوانــی وەهــا؟![٣]**

**✽✽**

**ئەمانــە؛ ئەم تەمــە، ئەم کێــوە، ئەم شــەپۆلە، یەکێ[٤]**
**نموونەیەکــی هیــوان و لــە ڕێگەدایــە بــە بــار[٥]**
**کــە چاوی پــێ ئەکــەوێ بۆی ئەچــێ بە ئستــیعجال**
**بــەڵام هیلاکییــە! ئەممــا ژیانــی ئادەمیــزاد:[٦]**
**بــە تەنگــەوە نییــە، ڕاهاتــووە لەگــەڵ ئیهمــال**
**هەتاکــوو ئــەو دەمــە ئەینێنــە گــۆڕی تیرەوتــار[٧]**

**✽✽**

جارێ بابەتی ئەم هۆنراوانە قسە لە تێکۆشانی ژیانەوە ئەکا، بەتایبەتی ئــەو ژیانە کــە ئادەمیزاد بە ســەریا دێت و ڕایئەبوێرێ. لــە باوەڕی ئەم

١. [«ئەدا بە لایەوە ئەخنێتەوە بە ئیستیهزا» (نوسخە)].

٢. [«هەوڵ ئەدا کە بچێ بیگرێ بەڵام سێبەر» (نوسخە)].

٣. [«چلۆن ئەگیرێ بە هێزی شەلێکی بێ سەر و پا» (نوسخە)].

٤. [«ئەمانە؛ ئەم کەژ و سێبە ر و شەپۆلە، یەکێ» (نوسخە)].

٥. [«نموونەیە لە هیوایە» (نوسخە)].

٦. [«یەعنی ژیانی نەوعی بەشەر» (نوسخە)].

٧. [«قەبری تیرە و تار» (نوسخە)].

هۆنــەرەدا ژیان دەریایەکــی خەم و پەرێشــانییە، شــەپۆلەکانی هەموو شت ڕائەماڵێ، ئێجگار ئەو ئادەمیزادە کە بە هیچ جۆر توانای نییە خۆی لەبەریا ڕابگرێ، وە بەڵکوو نقومی ئەکا و ئارام و ئاسایشی لێ ئەبڕێ!.

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە ژیان و گەڕان بەناو سارای ژیاندا، لە شــەپۆلی خەمەکە ســەختترە؛ بەو چیای هەڵدێری ژیانەدا بە پێ و بە چنگەکڕێ خەریکی پەلاماردانی ئەوەیە کە پیایا ســەرکەوێ، لەناکاو کولۆڵــی و بێبەختــی ـکە وەکوو ســەرەولێژێکەـ لەو ڕێگایــەدا ڕێگا و بــواری لێ دێنێتە یــەک و بە داوی ناهومێدی و ئــازار ـکە تان‌وپۆکەی ژان و برینەـ لێی ئەتەنێ و لێی ئەبێ بە کۆســپ و بە بەرهەڵســت بۆ هەڵەنگووتن!!..

ئەمجا لائەدا و ئەچێ ژیان ئەکا بە شــتێکی‌تر؛ ئەیکا بە دەشــتێکی چۆڵ‌وهۆڵی بێ ئاوەدانی!. ئەڵێ: لەو دەشــتەدا بە کەساســی و نالەباری و بە ڕێ لێ‌تێکچوون، وەکوو مەلێکی باڵشــکاوی پەرێشــانی تەریدەی پلاری دەســتی قەزا و قــەدەرە!. بەبێ ئەوە کەسێکی هەبێ کە لەناکاو لــە گۆشــەیەکەوە دەســتی بگرێ و لــەو تاریکییــە دەری بکا!. دیســان دڵســۆزێکی دەست ناکەوێ کە تۆزێ باری دڵی خۆی لەلا سووک بکا.. وەیا بیــەوێ بــە لایەکدا لەناو ئەو هەموو چەوســانەوەیەدا لا بدا و تۆزە پشــوویەک بــدا، یەکێک نییە بــۆی ببێ بە ڕابەر و ڕێگایەکی پیشــان بدا!..

ســەرباری ئەمانەش، لەو دەشــتە چۆڵ‌وهۆڵی بێ‌ئاوەدانییەدا، هەتا هەتەری چاو[1] تەم‌ومژ و تاریکســتانییەکە، کە بە تەواوی ترس ئەخاتە

١. [هەتەر: هانا، قەوەتی دیتن، سۆمای چاو، مەودای حوکمی چاو، بینایی].

دڵــی مرۆڤەوە، ئەمیش بە تەنیشــتیا تێ ئەپەڕێ و بــە گاڵتەپێکردنێکەوە زەردەخەنەیــەک ئەیگــرێ و کۆششــی ئەوە ئــەکا کە بیگرێ و لەســەر ڕێبــازی خــۆی لای دا!. بەڵام ئەقڵێکی ســەیرە؟!. تەمومژ بە بێهێزێکی وەکوو ئەو، چۆن ئەگیررێ؟!...

ئــەم تەمــی دەشــت و ئــەم کێــوی ژیانــە و ئــەم شــەپۆلی خەمە، هەریەکــە نموونەیەکــی هیــوا و ئومێدن و بە زۆریی لەســەر ڕێگادان. ئەم ئادەمیزادە کە چاوی بەم شــتانە ئەکەوێ، هەرچەندە کە بۆی ئەبن بــە مایەی شــەکەتی و ماندووێتــی، بەڵام هەر لەبەر ئــەو هیوایە، هەر بۆیان ئەچێ؛ چونکە ژیانەکەی گوێ بەم کۆسپانە نادا، ڕاهاتووە لەگەڵ خستنەپشــتگوێی ئەمانە؛ تا ئەو ڕۆژە ئەخرێتە گۆڕەکەوە هەر ئەچێ و هەر لە چنگەکرێدایە!!...

**

سەیر ئەکەین ئەم جۆرە ئەدەبە لە چاو ئەدەبەکانی پێش سەردەمی ئەمەوە، جیاوازییەکی تەواو هەیە لە بەینیانا.

جــارێ لە بیــردا، بیرێکی تازەیــە و هەموو ئادەمیــزاد لەگەڵ هەموو ژیاندا بەرەنگاری یەک بوون، وەکوو ئەدەبی پێشوو، وەنەبێ وەسپێک بــێ بــۆ یەکێک، بەڵکــوو جۆرە شــتی وا ئاشــنایەتی بە ژیانــی هەموو یەکێکی ئادەمیزادەوەیە، بەبێ جیاوازی لە بەینی کەسا.

ئەم، شێوەکەی لە پلەیەکدایە کە گوزارەی پێش وشە خستووە؛ واتە: ئــەو ڕێختەی کە هۆنەرانیتر لە ڕیزکردنی وشــەدا بــەکاریان ئەهێنا بۆ هێنانەوەی ســەروا، ئەم ئەوەی نەکردووە، بەڵکوو ڕێختی داوە بە گوزارە

بۆ ئەوە یەکیەتیی بابەتەکەی بە جوانیی بۆ بێتە بەرهەم.

زیاتر لەمەش، ئەو هۆنراوانە کە تا ئەم سەردەمە هەبوون، زۆر بەسترابوون بە سەرواوە، ئەم خۆی لەو خۆبەستنەوەیە ڕزگار کردووە و هۆنراوەکەشی تێک نەچووە؛ واتە: شتە تایبەتییەکانی هۆنراویشی تێدایە کە برێتین لە وشەی جوانی هەڵبژاردە، لە وێنەی ڕەنگاوڕەنگی ئەندێشە، لە گواستنەوەی وشە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر، لە دروستکردنی هونەر.

لەسەر باوەڕی ئەو کەسانەش کە ئەڵێن: سەروا بۆ هۆنراو دیمەنێکی هۆنراوییە و ئەبێ هەبێ، کەچی ئەم ئەوەی نەماوە!. ئەم قسەیەش وا نییە، بەڵکوو سەروایەکەش هەر هەیە، ئەوەندە هەیە ئەم وەکوو هۆنەر و هۆنراوی کۆن، خۆی نەبەستۆتەوە بەو پیتانەوە کە لە دوایی هەموو نیوە هۆنراوێکا بەکاریان بێنێ، بەڵکوو لەسەر شێوەیەکی تازەتر ڕۆیشتووە، کە بە گرتنی ئەم ڕێگایە، هۆنراوەکە جوانتر بووە..

لە دارشتنی هۆنراوەکانا بەرانبەر بە زانیاریی عەرووز و سەروا، ئەتوانین بڵێین: ئەم پارچەیە هیچ یەک لەو ڕێگایانەی نەگرتووە کە زانایانی هۆنراو لە بارەی «ترۆم»ـەوە دایان ناوە، بەڵکوو ئەمانە هەرچەندە لە ڕواڵەتا وەکوو تەرجیع بەندێکی پێنج خشتەکی و شەش خشتەکی وانە، بەڵام لەو یاسایەش لای داوە، چونکە سەرواکان لەسەر ئەو دەستوورە کە ئەویستری، نەهێنراونەتەوە...

تەماشا ئەکەی لە پارچەی یەکەمدا سەروای نیوە هۆنراوەی یەکەم و پێنجەم لێک نزیکن، لە هی دووهەمدا گۆڕی؛ هی دووەم و پێنجەمی کرد بە یەک، لە هی سێهەمدا دیسان گەڕایەوە بۆ یەکەم و پێنجەم، لە

هی چوارەمدا بۆ دووەم و شەشەم!..

گرتنی ئەم جۆرە ڕێگایە بۆ هۆنراوی کوردی، لە ڕۆژهەڵاتدا تا ئەوپەڕی تازەیـی تازەیە، مەگەر «توفیق فیکرەت» ئەم ڕچەیە شـکاندبێ، ئەگینا زۆر کەم بووە!...

❋❋

بـۆ باری لێکۆڵینەوە، ئـەو ڕەخنەیە کە لەم هۆنراوانـە بگیررێ، ئەوە نییـە کـە وشـەی بێگانەی لە وشـەی کوردی لـە هەندێ شـوێنا بەکار هێنـاوە، چونکە با ئەم هۆنراوانە لەسـەر شـێوەی ڕۆمانتیکیش چووبن، ئەو وشانە زیان بەو بوونی ڕۆمانتیکە ناگەیەنن. بە تایبەتی کە ئەمجۆرە هۆنراوانـە بە چەپەری بەینی دوو قۆناغ دائەنرێن؛ کە لە قۆناغی یەکەم دوور کەوتبێتـەوە و لووتی ژەندبێ بە قۆناغی دووەمەوە، واتە: لە بەینی کلاسـیک و ڕۆمانتیکـدا. ئەبـێ ئـەوەش بزانیـن: کـە برِینـی ڕێگای دوورکەوتنـەوە لـە قۆناغی کلاسـیک زۆرترە، هەتا مانی بـە ڕۆمانتیک. ئەمەشـمان بـە گوزارشـتەکانا بـۆ دەرئەکەوێ: کـە بە پوختـی چووەتە جەرگی گوزارەکانەوە و بە سـادەییەکی نزیـک بە سـاکارانە وشەکانی بۆ داناوە... لەگەڵ ئەوەشا گوزارشتەکانی‌تری:

«شـەپۆلی غـەم، ژیان بەکێوکـردن، هەڵمەتبـردن بۆ سـەرکەوتن، نشێوی کولۆڵی، تەنینی بوار بە تاروپۆی ئێش و زام، تەمومژ لەو دەشتی ژیانەدا، نەگرتنی تەمومژ لەو دەشتەدا، پلاری دەستی قەدەر، پێکەنینی گەمە، بە تەنگەوە نەبوونی ژیانی ئادەمیزاد بۆ ئەم جۆرە شتانە»؛ ئەمانە هەموو گوزارشـتێکن کە بەڕاسـتی شـێوەیەکی ژیانی داوە بـە داهاتنی

ئەدەبی تازەی کوردی.

بەڵکوو تەنها ئەوە هەیە: لە شوێنێکی وادا کە یەکێ بیەوێ بە هەرجۆر بووە بە هەورازێکا سەرکەوێ، بە «چنگەکرێ» سەرئەکەوێ، نەوەک بە «چنگەڕنێ»؛ چنگەڕنێ بۆ ئەو جۆرە سەرکەوتنانە گوزارشتی کوردی نایڵێ!!...

پاش ئەمانە، نیازی لە سێ پەردەدا جێ کردۆتەوە: لە دەریای خەما کە شەپۆل ئەدا، لە دەشتی چۆڵدا کە ڕێ لێی هەڵە ئەبێ، لە بۆشایی بەرچاودا کە لەبەر تەمومژ بووە بە بارساییەکی دووکەڵی تاریک!..

لەسەر ئەم سێ دیمەنە زنجیرەی بیر و دیمەنی ئەندێشەی هێناوەتە خوارەوە، بەبێ لێک پچڕان، وە بەبێ ئەوە گەردێک بنیشێ بە ئەندێشەکەوە.

# گۆران

## ١٩٠٤ - ١٩٦٢

گێتـی، زۆر بەگـوڕ بـۆ پێشـەوە تـەکان ئـەدا؛ ئـەم تەکاندانەی لە ڕەوڕەوەی گۆڕانـە، بـەڵام هەنـدێ جـار بێ‌هێزە، هەندێ جـار بەهێزە. ئەم چەرخـەی دوایی بەچاو ڕابوردووەکەیـەوە، چەرخە توندەکەیەتی. بەتایبەتـی لەدوای جەنگـی ١٩١٤ - ١٩١٨وە بەتایبەتی‌تر لەدوای ١٩٣٩ - ١٩٤٥ ئـەم توندوتیژییـە وەکوو لە ڕەوڕەوەی سـاڵدا هەبوو، لە ڕەوڕەوەی ئەو شتانەشا کە لەناو ساڵەکەدا هەبوون، هەر هەبووە.

بیروباوەڕ بەجۆرێ بۆ پێشەوە گوڕی ئەبەست، کە هیچ پێی نەئەکرا ئاوڕێک بداتەوە لە دواوە، بۆ ئەوە بزانێ چی لەشوێن بەجێ ماوە!!...

گەردوونەی ئەدەبیش بەو جۆرە کەوتە سـووڕانەوە؛ لە سستییەوە بۆ توندی، بۆ بەگوڕی. باوەڕەکانی گێتی لە هەموو لایەک خۆیان لە یەک هەڵسوو، سروشت کەوتە جووڵە؛ کەوتە ئەوە کە وەکوو چۆن لە ڕاستیدا لەگـەڵ هەموو شـتێکدا تێکڵاوە، بـەو جۆرە زۆر کەسـیش تێ بگا: کە ڕاستە تێکڵاوە!..

ئەم جۆرە شـتانە کە بەم جۆرە پەیدا بـوون، پەیدابوونەکە لە هەموو لایەکدا توانی خۆی بتەنێتەوە، بەتایبەتی بەشـی دووەم کە ئەدەبەکەیە. ئەو هەستی بەگوڕی گۆڕانە لە هەموو ڕوویەکەوە کەوتە ناو کوردیشەوە. کورد لە بیروباوەڕی ئەدەبیدا توانی شان‌بەشانی ئەم گۆڕانە بڕوا...

«عەبدوڵـڵا گۆران» کە یەکێک بوو لە هۆنەرانی کورد و هۆنەرەکانی

کوردیش کورد بوون، توانی ئەم بەڵگەیەمان بدا بەدەستەوە...

هۆنراوی «گۆران» باسی «جوانی» ئەکا؛ لە بیروباوەڕی ئەوا سیفەتی جوانیی کە «چ‌بوونی ـ ماهێت»ـێکی تا ئەوپەڕی ئەندێشـە، نەبینراوە و مەعنەوییـە؛ وەکـوو تەوژمێکـی بەتینـی کارەبا ئەکشـێ بـۆ «مایە ـ مادە»!. تەوژم و کشانەکەی لە هەندێکا بەتینترە، بە تەواوی لە مایەکەدا دەرئەکەوێ و مایەکە بە جوانی و شیرینی دێتە بەرچاو، لە هەندێکی‌ترا هەرچەنـدە جـوان نییە بـەلای تۆوە، بـەڵام بەلای یەکێکی‌تـرەوە هەر جوانـە!. جـا ئـەم جوانییەی لـە دیمەنی «ئافرەت»ـدا و لـە دیمەنی سروشـتدا داناوە. کـە باس ئەکا، هەموو جوانیی ئەدا بـە ئافرەتەکە، وە هەموو شیرینیی ئەدا بە دیمەنی سروشتەکە!!...

بـەم ئیشـەی، «عەبدوڵڵا گـۆران» توانـی ئـەدەب هەڵبگێڕێتەوە؛ ڕووپـەڕەی کلاسـیک بداتـە لاوە و بیـکا بـە ڕۆمانتیک!. وەکـوو لەم پارچـە هۆنراوەیدا سـەیر ئەکەین لە کاتێکا کە لـە ژێر ناوی «ئافرەت و جوانی»ـدا نیازەکەی دەرئەبڕێ و ئەڵێ:

(١) بـە ئاسـمانەوە ئەسـتێرەم دیـوە
لـە باغچـەی بەهـار گوڵـم چنیـوە
(٢) شـەونمی درەخـت لـە ڕووم پژاوە
لـە زەردەی زۆر کـەل سـەرنجم داوە
(٣) پەلکەزێڕینـەی پـاش بارانـی زۆر
چەماوەتـەوە بەرانبـەر بـە خـۆر

(٤) هەتـاوی نەورۆز، مانگـی جۆ درەو
زۆر هاتوون و چوون بە ڕۆژ و بە شـەو!
(٥) خوڕەی قەڵبەزەی کەفزیوینی چەم
لە هـەزار چەشـنە پرشـنگی نـاو تەم
(٦) میوەی گەیشتووی زەرد و سووری باخ
جریـوە و جووکـەی دارسـتانی شـاخ
(٧) لە گەرووی شمشاڵ، لە تەلی کەمان
گەلێ هەڵساوە ئـاوازی جـوان جوان
(٨) ئەمانـە هەمـوو جوانـن، شـیرینن
ڕۆشـنکەرەوەی شـەقامی ژینـن!
(٩) بـەڵام تەبێعـەت هەرگیزاوهەرگیـز
بێڕووناکییـە، بـێ بـزەی ئازیـز!
(١٠) بـێ ئاوازەیـە دەنگـە نەرمەکـەی
بـا نەیدا لە گوێـم، تێر نەڵێـم ئۆخەی!
(١١)کام ئەستێرەی گەش، کام گوڵی کێوی؟
ئاڵە وەک کوڵمی، گۆی مەمکی، لێوی؟!
(١٢) کام ڕەشـیی ئەگا بە ڕەشیی چاوی؟
برژانگی، بـرۆی، ئەگریجـەی خاوی!

**(١٣)کام بەرزیی جوانە وەک بەرزیی باڵای؟**
**کام تیشک ئەگاتە تیشکی نیو نیگای؟!**
**(١٤)کام تاسە؟ کام مەیل؟ کام چاوەنواڕی؟**
**تەلیسـماوییە وەک هـی دڵـداری؟!**

گۆران ئەیەوێ وەسـپی دیمەنی جوانیی ئافرەت وەیا ئافرەتێک بکا، بە سەرە پیا دێتە خوارەوە و ئەو شتە جوانانە کە بە لای ئەو و سروشتەوە جوانن و چاوی پێیان کەوتووە، ئەیانهۆنێتەوە، بۆ ئەوە لە ئەنجامدا بێتە سەر جوانیی مەبەستەکەی!.

(١) ـ لە ئاسمانی شینی ساماڵدا گەلێ جار ئەستێرەی چاوپێ کەوتووە، جوان بووە و جریوەیان هاتووە، ئەمانەی لە ئاسماندا دیوە، نەوەک لەناو ئاودا!. وەکوو ئەمەی دیوە و بەلایەوە جوان بووە، لە کاتی بەهاریشا زۆر جار لە باخان گوڵی چنیوە و بەلایەوە هەر جوان بووە!...

(٢) ـ ئەو خووناوەی کە لە بەریبەیانی تازە بەهاردا ئەکەوێتە سـەر هەمـوو گیا و درەختێـک، پڕاوە بـە ڕووی ئەما!. لە ئێوارانیشـا فرە جار سەرنجی داوەتە زەردەپەڕ!..

(٣) ـ هەر لە بەهاراندا ئەسـتێرەزێڕینە کە لـە دەمەدەمی ئێواراندا لـەپاش بارانێکـی هـەوری گـەوارە[1]، تیشـکی ڕۆژەکە لە بەینـی پەڵە هەورەکانەوە لێی ئەدا و ڕەنگەکانی دەرئەکەون، ئەمەشی بەلاوە جوانە..

(٤) ـ ئـەو هەتاوەی کە لە مانگی نـەورۆزدا ئەبێ و بە لای فێنکیدا زیاتـر لا ئەکاتەوە تا بەلای گەرمادا. ئەو مانگ و مانگەشـەوی مانگی

---

١. [گەوارە: پەڵە هەور، گەواڵ].

جۆدرەوە ـکە مانگی مایسەـ، ئەم دووە هەر لە هاتوچۆدا بوون؛ ڕۆژەکە بە ڕۆژ و مانگەکە بە شەو، ئەم دوو «بەن ـ ئایەت»ـە کەونییە لەو دوو کاتەدا، بەلایەوە ئەمەش زۆر جوان بووە!..

(٥) ـ خوڕەی تاڤگەی چەمەکان کە کەفەکەی وەکوو زیو وایە، وەیا ئەو پرشنگی بارانە کە لەناو تەمدا دیار ئەبێ و گزنگی هەتاو لێی ئەدا!. ئەمەش جۆرە جوانییەکی‌ترە بەلایەوە.

(٦) ـ ئـەو میوە، وەیا گوڵی زەرد و سـووری میوەکان کە لەناو باخدا ئەبـن، دەنگـی جریوەجریو و جووکەجووکـی باڵنـدە بچکۆلەکانی ناو دارستانی چیاکان، ئەم دیمەنەش جۆرە جوانییەکی‌ترە!.

(٧) ـ لـە دەنگـی گـەرووی شمشـاڵ و لـە دەنگی تەلـی کەمانچە گەلێ ئاوازی جوان‌جوان دەرچووە و هەسـتاوە، دیسان ئەمانەش جۆرە جوانییەکی‌ترن!..

(٨) ـ ئەم هەموو جوانییانە جوانن و ڕووناکی ئەدەن بە ڕێگاوبانی ڕێبازی ژین و ڕۆشنی ئەکەنەوە!..

(٩) ـ بەڵام ئەمانە کە تاپۆی سروشـتن، هیـچ ڕووناکییەکیان نییە و هەمیشـە کزن، تا زەردەخەنەی دۆسـتیان لەگەڵ نەبێ و تێکڵاوی ئەو لێوە بە بزەیە نەبن.

(١٠) ـ بێ‌نەوایـە دەنگـە نەرمـە جوانەکـەی، تا نەیەتـە گوێم و تێر «ئۆخـەی» بۆ نەکەم!. وەیا: تا ئەو دەنگـە نەیەتە گوێم و تێر ئۆخەی بۆ نەکەم، هەر بێ‌ئاوازەیە!...

(١١) ـ ئایا چ ئەستێرەیەکی گەشی پرشنگدار؟ ئایا چ گوڵێکی جوانی کێویی؟ ئاڵە و سـووری نیورەنگە وەکوو گۆنای یار؟؛ وەکوو مەمکی یار؟؛

وەکوو لێوی یار؟!...

(١٢) ـ چ ڕەشییەک هەیە لە گێتیدا بگا بە ڕەشیی چاوی؟؛ شان بدا لە ڕەشیی برژانگی؟؛ بتوانێ بگا بە ڕەشیی برۆی؟؛ خۆی هەڵسووێ لە ڕەشیی ئەگریجەی؟!..

(١٣) ـ ئایا چ بەرزییەک هەیە جوان و ڕێک بێ وەکوو بەرزیی باڵای ئەو؟؛ کام تیشک هەیە لە گێتیدا بتوانێ بگا بە تیشکی نیونیگا سەیرکردنەکەی ئەو، لە کاتێکا کە بە تیلایی چاو سەیر ئەکا؟!..

(١٤) ـ چ تاسە و ئارەزوویەک؟ چ مرخ و هەوەسێک؟ چ چاوەنواڕیکردنێک؟ بە سیحر و جادووە، وەکوو ئارەزوو و مرخ و چاوەنواڕیی دڵداری و چاو لە دڵبوون؟!...

❃❃

ئەم پارچەیە ئێمە لە دوو لاوە قسەی لێوە ئەکەین: لایەکی لەو ڕووەوە کە ئەدەبێکی بە هەموو «بەسە» تازەیە و لە وشە و گوزارەدا شۆڕشێکی ناوەتەوە؛ لە وشەدا سەیر ئەکەین هەموو وشەکان ساکار و کوردییەکی ڕووتن، بۆنی هیچ شتێکیتریان لێ نایە. ئەم وشانە دانراون بۆ جۆرە گوزارەیەک کە ئەوەندە فراوانن، چوار چمکی وشە نایانگاتێ؛ یەکەیەکە بەبێ خۆ عەزیەتدان سروشتی هۆنەر هۆنیونیەوە، هۆنینەوەیەکی وەها کە هەتا پیاو لێیان ورد بێتەوە زیاتر سەرنج ڕائەکێشن!!..

ئەمە لە لایەکەوە، لە لایەکیترەوە: ئەم هۆنەرە بەپێچەوانەی هۆنەرانیتر، هێناویە جوانیی لە چ جنسەشتێکدا کۆ بووەتەوە، هەموو جنسەکەی هێناوە و پاش ئەوە هەموویانی داوە بە باسکراوەکەی خۆی

ـکە ئەم باسـکراوەی بابەتی چامەکەیەتی ـ؛ وە بەڵکوو ئەڵێ: هیچ‌یەک لەو جنسـانە کە جوانییان تێکڵاو بووە، ناگەن بە جوانیی ئەو تاکە و بە تاکەکەی خۆی، کە مەبەستی باسی چامەکەیەتی.

وشە هەڵبژاردەکانی ئەم پارچەیە:

«لـە ڕووم پژاوە، چەمانـەوەی پەلکەزێڕینـە، کەف‌زیوینی چەم، پرشنگی ناو تەم، گەرووی شمشاڵ، گوڵی کێویی، ڕەشیی چاو، تیشکی نیونیگا، تاسە، تەلیسماوی» زیاتر ئەمانەن.

ئـەم وشـانە وشـەیەکی سـاکاری کوردیـن، بـۆ دانانەکـەیان هیـچ خۆعەزیەتدانێکـی تێـدا نییـە، بـەڵام کاتـێ کـە سـەیری گوشـادی گوزارەکانیان ئەکرێ لەم شوێنەدا، ئەوترێ ئەمە «پەرجۆ»یەکە و گۆران لە ئەدەبی کوردیدا دروستی کردووە!..

گوزارشتی کوردی بۆ شتێک کە بپژێ لە ڕوو هەر «ئاو»ی بۆ دائەنێ، هەنـدێ جاریش «گوڵاو». کەچی ئەم «شـەونم» ئەپژێنـێ بە ڕوودا!. کە ئەم شـەونمە «پێزە ـ زەڕە»ی جوانیی هەوای فێنکی ئاسـمانە و لە ڕەسـەنی شـتی تەڕی سروشـتیدا مەگەر هەر ئەو شـەونمە لە شـەونم جوانتر بێ، ئەگینا هیچی‌تر نییە!!...

«پەلکەزێڕینە» خـۆی بەتەنها هەیە، «چەمانەوە»ش دیسـان هەر هەیە، بەڵام ئەم گوزارشتە تا ئێستە بەم جوانییە کەس لێی نەداوەتەوە؛ کـە پەلکەزێڕینـە بەرانبـەر بـە خـۆر بچەمێتـەوە و لـە دوو دیمەنـی سروشتیدا سەردانەواندنی یەکێکیان بۆ ئەوی‌تریان پیشان بدا!!...

وشـەی «کەف‌زیوینی چەم» هەتا ئەوپەڕی ناسـکیی و جوانیی، دیمەنـی سروشـت دەرئەخـا!. لەگـەڵ ئـەوەدا وشـەکان بـە تاکەتاکە

هەمـوویان لـە زمانی کوردیـدا هەن، بەڵام ئەم سـەرنجی هەسـتە لە پێکەوە نووسـاندنی ئەم وشانەدا ڕائەکێشـرێ، بەم داڕشتنە لە تاکەکەدا وەیا لـە غەیری ئەم داڕشـتنەدا نییە!. بە تایبەتی جۆری داڕشـتنەکە لە پایەکدایە کە «کەف»ـەکە بە تەواویـی «زیو»ەکەیە، وە «زیو»ەکەش بە تەواویی «کەف»ـەکەیە؛ کە ئەمە جیایە لەو گوزارەیە کە تۆ بڵێیت «کەفی زیوینی چەم»!...

ئەو چۆنییەی لە پڕشـنگی ناو تەمدا هەیە بە هۆی تیشـکی ڕۆژ لە سەرەوە و گزنگەکەی لە ناوەوە، مەگەر هەر ڕستەی «پڕشنگی ناو تەم» ئەو گوزارەیە تەواو کا، ئەگینا شتێکی‌تر ئەوەی پێ ناکرێ!.. لە ناوهێنانی «گەرووی شمشاڵ»ـدا بە تەواوی تۆ هەست بەو سۆزە ئەکەی کە هەچ وردە دەمارێـک لە لەشـتایە بەو هۆیـەوە ئەکەوێتە جووڵـە و دەنگی نەوای دەمارەکانی تۆیش لەگەڵ دەنگی گەرووی شمشاڵەکەدا ئەبن بە یەک و خۆیان بۆ لەیەک جیا ناکرێتەوە!..

«گوڵـی کێویی» بەسـەر زمانی هەموو کەسـێکەوە هەیـە و هەموو کـەس ئەڵـێ: «گوڵی کێوی»!. بـەڵام ئەو گوزارەیە کە گـۆران بە «گوڵی کێوی» گوزارشـتی لێ داوەتەوە، گەلێ جیایـە لە هی من و تۆ، وەیا ئەو کەسـە؛ من و تۆ کە ئەیژین: «گوڵی کێوی» گوڵێ، وەیا ترۆمێک ئەبێ بە مەبەستەکەمان، کەچی ئەو هەچ گوڵێکی جوانی کێوی هەیە، واتە: هەچ ڕەسەنێک کە سروشـتی بێخەوەش تیایا دەرکەوتووە، ئەوە پیشان ئەدا و هیچ گوڵێکی‌تر نایەڵێتەوە کە بتوانێ خۆی لە دڵتا جێ بکاتەوە!..

بەڵێ! چاوی ڕەش هەیە، وە ڕەشـیی چاویـش هەیە، کە هەریـەکە گوزارەیەکی زمانیی خۆی هەیە و گوزارەیەکی‌تریشی بەپێی بیروباوەڕی

ئەدیــب هەیە؛ بەڵام گوزارەی ڕەشــیی چاوێک کە گۆران بەو وشــەیە گوزارشــتی لێ داوەتەوە، گوزارەکانیتر ناتوانــن بیگەنێ؛ چونکە ئەم بە گوزارشــتی «کام ڕەشبیی ئەگا بە ڕەشــیی چاوی» نەوەک هەر ڕەشیی چاوانیتــری گرتبێتــەوە، بەڵکوو ڕەســەنی ڕەشــیی کە لە کــەونا هەیە، گرتیەوە و خســتیە ناو پاژێکەوە کە ڕەشــیی چاوی دۆســتەکەیەتی!. وە هێشتا ئەم پاژە دیسان گرەوی لە هەموو هاماوەکان بردۆتەوە!!...

«تیشــکی نیونیــگا» وشــەکان بــە تاکەتاکــە خــۆیان هــەن، هیــچ تازەکوورەییەکیان تێدا نییە، بەڵام وەرە سەیری پێکەوە نووساندنەکەیان بکە و ئاوڕێک لەو گوزارەیە بدەرەوە کە ئەمانە ئەیدەن بە دەستەوە!..

ئایا هیچ جوانییەکیتر ماوەتەوە کە لە جوانیی تیشکی نیونیگا جوانتر بــێ؟ بــڕوا مەکــە!. چونکە «تیشــک» خۆی کــۆگای جوانییــە، نیونیگا «مەعنەوی»ــیە، لە تێکڵاوکردنی مایەیی و مەعنەوییەک جوانییەک هاتە دەست، کە ڕەمزی هەرچێ جوانییە لە کەونا!...

ئەزانی گوزارەی «تاسە» لەم شوێنەدا تا چ ئەندازە مەودای هەیە؟!. «تاســە» خۆی ئارەزووی دۆســتێکە بۆ دۆســتێک، یادێکی ســووتێنەری یارێکە بۆ یارێک. کەچی ئەم ئەوەندەی تۆزێ تاســەی نەهێشــتەوە بۆ یەکێکیتر کە بتوانێ ئارەزووی دۆستێکی پێ بکا!...

وشــەی «تەلیسماوی» وەکوو لە داڕشــتنی خۆیــەتی و داڕشتنەکشی بەجێیــە، بیرکردنــەوە لەوە: کە هیچ ئــارەزوو و مــرخ و چاوەنواڕییەک نییــە بتوانــێ پیــاو بخاتــە ناو داوی تەنــراوەوە، وەکــوو هــی دڵدارییی!. بیرکردنەوە لە پێکەوە نووساندنی چەمکی وا، گەلێ بەرزتر و جوانترە لە داڕشــتنی وشــەکە و لە ناوهێنانی ئەو چەمکانە کە کەسانیتر بە وشەی

«سیحراوی» وەیا «جادووگەری» ئەیهێنن!!...

**

ئـەم هۆنراوانـە لـە ڕاسـتیدا جـۆرە ڕێچکەیەکی‌تـریان گرتـووە و ڕێچکەیەکی وایان شکاندووە کە تا هەتا ئەوپەڕی تازەیی تازەیە بەچاو ئەدەبەوە. بە تایبەتی شێوەی گوزارە بە تەواوی باوەشی کردووە بە ئاسۆی سروشـتدا. وشـە، هەمـووی خۆماڵییە. ئەگەر وشـە بـە «تان» و گوزارە بـە «پۆ» دابنرێن لە شـێوەی ئەدەبدا، ئەتوانیـن بڵێین: ئەم تان‌وپۆیە، تان‌وپۆیەکـی ئاوریشـمە و «بەر»ێکی داوە بە دەسـتەوە، کە گەلێ لە ئاوریشم نازکتر و جوانترە؛ ئەو بەرەش ڕاکێشانی تەواوی هەستی گوێگر و خوێنەرە!.

بە تەواوی لە جۆری کلاسیک لای داوە و کەوتۆتە کۆشی ڕومانتیکەوە، ئەمیش بە هۆی چەند شتێکەوە:

باسـەکەیە؛ ئـەم باسـە کـە باسـی جوانیـی یەکێکـە و لـە دیمەنی «هەڵبەسـە»دایە، گەلێ کەس باسـی وای هەیە، بەڵام شـێوەکەی ئەم جیایە لە شێوەی هۆنەر و کەسانی‌تر؛ ئەم هەموو جوانیی داوە بەو کەسە ـکە باسکراوەکەیەتی ـ، هونەرەکانی‌تر لە جوانیی مەوسووفەکەیان داوە بە جوانییەکانی تر!..

بیر؛ بیرەکـە پوختەیە، چونکە تاپۆی وێنەکانی بە پوختی بۆ تۆ ڕوون کردۆتەوە و کردوونی بە پەیکەرێک لە بەرچاوتەوە!..

ئەندێشە؛ ئەندێشەکەی بەرزە، چونکە هەر لە وشە تاکە خۆماڵییەکان توانیویە جۆرە شـتی وا دروسـت بکا کە بە هەموو بەسـەیەک سـۆزی

هەمـوو کەس ڕاکێشــێ و وای لێ بـکا وەکوو ئەڵێن: ببێ بە ئاسـانێکی کەس پـێ نەکراو ـ «سَهْل»ــی «مُمْتَنِع»ـ دارِشــتنی ڕستەکانیشی لە زۆر شوێنا بە تەواوی شوێنی خۆیانیان گرتووە.

ئەگەر یەکێ بڵێ: هۆنراوەکانی گۆران تازەیە، چونکە خۆی لە کۆت و زنجیری عەرووز و سەروا ڕزگار کردووە. ئەم قسەیە بۆ ئەو کەسە ناچێتە سەر، چونکە ئەمە یەکێکە لە پارچە هۆنراوەکانی گۆران کەچی بە گوزارە تێکڕایی هەم عەرووزی تێدایە، هەم سەروا!. ئەوەندە هەیە: ئەوەی کە بە ســەرزارەکی بە عەرووزی ناو ئەبەین، لە ڕاســتیدا ژمارەی پەنجەیە، سەرواشی بێ شکە کە تێدایە!..

بەپێچەوانــەی ئەمــە: ئەگــەر هۆنراوێــک خاڵـی بــێ لــەو پــەردە ڕواڵەتییە کە عەرووزە بۆ هەندێ هۆنراو، وەیا ژمارەی پەنجە و سەروایە بۆ هەندێکی‌تر، ئەوە لە هۆنراویی دەرچووا!..

کەوابوو، تازەبوونی هۆنراوێک ئەوە نییە کە عەرووز و ســەروا، وەیا ژمارەی پەنجە و سەروای تێدا نەبێ، بەڵکوو ئەوەیە کە لە ڕێچکەدا، لە بیردا، لە ئەندێشــەدا، لە نیازدا، لە زنجیرەکەدا تازە بێ. ئەم هۆنراوانەی گۆران ئەمانەی هەموو تێدا هەیە، لەگەڵ ژمارەی پەنجە و سەرواشدا!..

لەبەر ئەمانە، ئەم پارچە هۆنراوەیە ئەوەی پیشـان داین: کە ئەدەبی کوردیی بە هەموو بەســەیەک توانیویە گۆڕان بەســەر خۆیا بێنێت، وە پەردەیەکی تازە پیشـانی ئەو کەسـانە بـدات کە ئەیانــەوێ لە ئەدەبی تازەی کوردی تێ بگەن و چەشەیەکی لێ وەربگرن..

✽✽

ئەمجا بێینە سەر ئەوە کە لەلایەن ڕێختی وشەوە لە هەندێکی‌تر لەم هۆنراوانە بکۆڵینەوە:

لە هۆنراوی دووەمدا ئەڵێ:

**«شەونمی درەخت لە ڕووم پڕژاوە!»**

لە شێوەی کوردیدا ناڵێ «شەونمی درەخت» بەڵکوو ئەوترێ «شەونمی گیا» وەیا «شەونمی گیاکان»؛ واتە: شەونمێ کە ئەکەوێتە سەر گیاکان؛ ئەوی ئەویش واتە: شەونمێ کە ئەکەوێتە سەر درەخت. «درەخت» دارە. وەختێ ئەتوانێ لە شێوە باوە کوردییەکە لابدا کە لە لادانەکەدا وێنەیەکی جوانتر بکەوێتە بەرچاو و زیاتر دڵ ڕاکێشێ؛ وەکوو لە شوێنە جوانەکانی‌تریا بە وێنە «کەف‌زیوینی چەم» کە لە شێوەی باوی کوردی لای داوە و جوانییەکی‌تری دروست کردووە. لێرەدا مووزیقای «شەونمی گیا» بۆ ڕاکێشانی دڵ جوانترە تا «شەونمی درەخت»!..

لە هۆنراوی شەشەمدا دیارە کە ئەڵێ:

**«جریوە و جووکەی دارستانی شاخ»**

مەبەستی جریوە و جووکەی مەلی دارستانی شاخە و موزافی «مُضافُ إلَیهِ»ـیەکەی نەوتووە. ئەمە زیان بە هۆنراو ناگەیەنێ، بەڵکوو جوانتری ئەکا..

لە هۆنراوی نۆیەمدا ئەڵێ:

**بەڵام تەبێعەت هەرگیزاوهەرگیز**

**بێ ڕووناکییە، بێ بزەی ئازیز!**

وشـەی «هەرگیـز» لـە زمانـی کوریدا بـۆ «نەبـوون ـ نَفی»ـیە لە ڕابـوردوو، وەیا لەمـەودوا وەکوو ئەڵێ: «هەرگیز ئەو ئیشـەم نەکردووە» وەیا «هەرگیز نایکەم». ئەم لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە بڵێ: «تەبێعەت هیـچ ڕووناکییەکی نییە بەبـێ بزەی ئازیز» ئەیـەوێ هەتاهەتایەکی بۆ بڵێت. ئەم گوزارەیە لە شوێنێکی وادا بە وشەی «هەرگیز» گوزارشتی لێ نادرێتەوە!. بەڵکوو بە وشەی «هەمیشە» ئەبێ بوترێ!..

«نەفی»ـش دوو جۆرە لـە باوی کوردیدا: نەبوونێک هەیە کە نەفی «کـردەوە ـ فِعْل» ئەکا لە خاوەن و بکەرەکەی ـفاعیلەکەـ. نەفیێکیش هەیـە کـە نەفی بوونـی فیعلەکە ئـەکا. کە ئەڵـێ: هەرگیز ئەو ئیشـەم نەکردووە، نەفی کردەوەکە ئەکا لە خۆی.

لێرەدا هۆنەر کە ئەڵـێ: «بێ ڕووناکییە» ئەمەش هەرچەندە نەفیە، بـەڵام نەفـی ئەسـڵی ڕووناکییەکە ئـەکا، نـەوەک نەفی نیسـبەتەکە!. کە نەفی ئەسـڵ کرا، ئەبێ گوزارشـتەکەی بە وشـەی «هەمیشە» بێ، نەوەک بە وشـەی «هەرگیز»!. هەروەها ئەگەر ئیسپاتی ئەسڵی «فِعل» بکرێ، دیسان هەر ئەبێ بە وشەی «هەمیشە» بێ...

لە هۆنراوی دەیەمدا ئەڵێ:

**بـێ ئاوازەیـە، دەنگـە نەرمەکـەی**
**بـا نەیدا لە گوێـم، تێر نەڵێـم ئۆخەی!**

کە بێ ئـاوازە بوو دەنگە نەرمەکەی، ئیتر چۆن ئەوترێ «با نەیدا لە گوێـم»؟. ئەوا وتمان قەیدی نییە، لەبەر ئەوە کە بێئاوازەیە با بڵێ: «با نەیدا لە گوێم». کە نەیدا لە گوێ، ئیتر چۆن ئەڵێ: «ئۆخەی»؟!..

ئۆخەیکـردن بۆ شـتێکە کە خۆشـی تیـدا هەبێ، ئەو خۆشـییە لە

بوونی کردەوەوە هەستێ، یا لە نەبوونی کردەوەوە. لە بوونی کردەوەوە وەکوو ئەڵێ: «ئۆخەی شاد بوومەوە پێی». لە نەبوونی کردەوەوە وەکوو ئەڵێ: «ئۆخەی کابرامان لە کۆڵ بووەوە».

کەوابوو، لەسەر ئەم لێکۆڵینەوەیە، ڕستەی «تێر نەڵێم ئۆخەی» لە هۆنراوەکەدا شوێنی خۆی نەبوو!. مەگەر بڵێین:

**بێ ئاوازەیە، دەنگە نەرمەکەی**
**تا نەیدا لە گوێم، تێر نەڵێم ئۆخەی**

گوزارەکەی وای لێ دێتەوە:

دەنگە نەرمەکەی هیچ ئاوازەیەکی لێوە نایەت، تا بەرگوێم نەکەوێ و نەڵێم: ئۆخەی. ئەگەر بەرگوێم کەوت و وتم ئۆخەی، ڕاستە ئەو وەختە دەنگە نەرمەکەی بە ئاوازەیە!..

کەواتە، هۆنراوەکە ئەبێ وا بێ و لە ڕاستیشدا «گۆران» هەر وای وتبێ. «تا» بە «با» کردن هەڵەی دەستنووس بێت!..

لە هۆنراوی یانزەدا ئەڵێ:

**کام ئەستێرەی گەش؟ کام گوڵی کێوی؟**
**ئاڵە وەک کوڵمی؟ گۆی مەمکی؟ لێوی؟**

ئاڵیی لە گوڵی کێویدا هەیە و زۆریشە، بەڵام «ئەستێرە» با گەشیش بێ، ئاڵ نییە؛ بە تایبەتی ئەستێرە، کە بەلای گەشیدا ڕوانی جۆرە سپیەتییەک ئەنوێنێ، ئاڵیی هەر تێدا نییە!. ئەمیش ڕەسەنی ئاڵیی هێناوە لە ئەستێرەی گەشدا و ئەڵێ: ئەو ڕەسەنە ناگا بە ئاڵیی ئەندامی تاقە باسکراوەکەی من. کەچی وەکوو بۆمان ڕوون بووەوە، ئاڵیی لە

ئەستێرەی گەشدا هەر نییە!!...

لەگەڵ ئەمانەشـدا ئەدەبی گۆران ئەدەبێکـی گوزارەیی کوردی زۆر بەرزی ئەم سـەدەی بیستەمەیە و وەکوو بۆمان دەرکەوت شۆڕشێکی لە گێجی ڕومانتیکدا ناوەتەوە و هۆنراوی لە هەموو دیلییەک: چ وشەیی، چ گوزارەیی، ئازاد کرد و دەروازەیەکی گەورەی لەم ڕووەوە خستە سەر گازی پشت و ئەدەبی کوردیی ئەم چەرخە بە نازەوە ناوی ئەبا...

# بێکەس

## ١٩٠٥ - ١٩٤٨

لـە سـەدەی بیسـتەما بە تـەواوی جیهانێکی تـر هاتە پێشـەوە، دوو جەنگـە گەورەکە کەوتە ناوەوە، ئەم جەنگانە هەریـەکە ڕووپەڕەیەکیان خسـتە ڕوو؛ جەنگـی یەکـەم ئاگـری شۆڕشـی نەتەوایەتـی تیژتر کرد، جەنگی دووەم سـازمانی پیشـە و پیشەسـازی زیاتر هێنایـە ناوەوە، بە هەردووکیانەوە تەنگی زەوییان هێنایەوە یەک و مەردمی هەموو لایەک لە کۆبوونەوە لە شوێنێکا وەکوو خێزانی ماڵێکیان لێ هات!..

لـەم نزیکبوونەوەیە هەموو جۆرە بیروباوەڕێـک گۆڕانەوە؛ وەیا ئەو بیرەی کە لە مێشـکی مەردەمی وڵاتێکا بوو، بە ئاسـانی کەوتە مێشـکی مەردمی وڵاتێکی ترەوە!...

ئەمانـە هەمـوو بـوون بـە هـۆی شۆڕشـی فیکـری لـەناو هەمـوو نەتەوەیەکدا. لە پەیدابوونی ئەم شۆڕشە فیکرییەوە، بە تەواوی شۆڕشی ئەدەب سـەری هەڵدا؛ بیروباوەڕ ئازادییەکی تری وەرگرت، ئازاد بوو لەو سـەردەمەی کە نەیئەوێرا هیچ ورتەیەک بکا!. بێگومان لەم ئازادییەوە ئازادی ئەدەب پەیدا ئەبێ، ئازاد ئەبێ بە تەواوی لەو شـتانە کە جاران پێی بەسترابووەوە!..

کـە ئەدەب بـە تێکڕایـی ئازاد بـوو، هۆنراویـش دیارە ـکـە لقێکی ئەدەبـە ـ ئەویش لـە هەموو جۆرە پێوەندێـک ئـازاد ئەبێ: چ لە بیردا، چ لە ڕێختدا، بەتایبەتی کە بیر گۆڕا، ڕێخت بەبێ خشـپە بە شـوێنیا

دێت. ئەمانە لە هەموو نەتەوەیەکدا ڕوویان دا، لە کوردیشدا وەکوو نەتەوەکانی تر پەیدا بوون. جا یەکێک لەو کەسانە کە لە هۆنراویا نموونەی ئەمانە دەرئەکەوێ، «فایق بێکەس»ـە؛ کە لە پارچە هۆنراوی «داری ئازادی»یەکەیدا، ئەو پارچەیە کە وەکوو ناوەکەی ئازادە، ئەڵێ:

**داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ، قەت بەر ناگرێ!**
**سەربەخۆیی بێ فیداکاری، ئەبەد سەر ناگرێ!**
**پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حەقی لە کوشتن سڵ نەکا**
**هەر «بڕووخێ» بەس نییە، تاکوو نەسەنرێ، نادرێ!**
**کورد ئەگەرچی موددەتێکە دیل و داماوە، بەڵام**
**باوەڕت بێ ڕۆحی میللیی هەر ئەمێنێ، نامرێ!**
**تۆ ئەگەر ئیسلاحی قەوم و نیشتمانی خۆت ئەوێ**
**لێت موحەققەق بێ بەبێ شۆڕش مەحاڵە، ناکرێ**
**بیری سەربەستی جیهانی گرتەوە توخوا بەسە**
**ئەم نیزامە کۆنە تاکەی؟! هیممەتێ کەن لابرێ**
**قەت مەڵێن دوژمن بەهێزە، تۆپ و تەییارەی هەیە**
**ئیتتیفاقتان گەر هەبێ زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگرێ!**
**ئەم عێراقە خۆشەویستە خاکی گوڵگوون بوو بە خوێن**
**تا هەقی دەسگیر نەبێ، لەم خوێنە دەست هەڵناگرێ**

**نێــر و مێ هەردوو بــە جووتە بۆ وەتــەن هەوڵێ نەدەن**
**دووره دەرچوونــی لە دیلــی، «مەل بە باڵــێ نافڕێ!»**
**هەوڵی هــەردوو لا بە پاکیــی کاری میللەت ســاز ئەکا**
**چونکە چەپڵە هەر بەیەک دەست دیارە قەت لێ نادرێ!**
**وا گوڵۆڵــەی کەوتــە لێــژی، بــاوی ئیســتیعمار نەمــا**
**هیچ کەســێ ئیتر بــە زوڕنــا و تەپڵی ئــەو هەڵناپەڕێ!**
**دۆســتیی کــورد و عــەرەب زۆر کۆنــە تاریخ شــاهیدە**
**ناحــەزی ڕووڕەش لــە داخا، با یەخەی خــۆی دادڕێ!**

ئــەم هۆنراوانە وێنەی مێژووی ڕۆژێکن کە بانگی ئازادیی سیاســی لــەو ڕۆژەدا دەنگی زەلاڵ بووە. لەناو ئازادیی سیاســیدا بانگی ئازادیی ئەدەبیــی دەرئەبــڕێ؛ ئەوە دەرئەبــڕێ: کە بیروباوەڕ بــۆ وەرگرتنی مافی ســەربەخۆیی کەوتۆتە جووڵە، پێی ناوەتە لێواری ئەو ڕۆژەوە کە داوای ئــازادی و نەتەوایەتی خۆی بە جۆرێکی ئاشــکرا بــکا. ئەیەوێ دیلیەتی بەسەر بچێ، لە قسەوە بچێتە ناو کردەوە، ئاگری شۆڕش هەڵبگیرسێنێ؛ خۆی ئیتر نەبەستێتەوە بە یاسای دەنگ نەکردنەوە؛ ئەو ترسەی نەمێنێ کە بڵێ: «دوژمنەکەم زۆر بەهێزە و پێی ناوێرم» ئەگەر یەکگرتن هەبێ، هێــزی دوژمن نموودێکــی نابێ؛ وەکووچۆن مــاف وەرگرتن و داواکردن لەسەر پیاوە بەو جۆرە، هەروا لەسەر ئافرەتیشە و پێکەوە بۆ ئەو ئامانجە ئەبێ شانبەشــانی یەک تەکان بدەن، لــەم تەکانەی ئەمان بێگومان داگیرکەر ئیتر باوی نامێنێ، با هەزار جاریش هەر هاوار بکا!.

لە ئەنجاما ئەوە ئەخاتەوە بیر: کە کورد و عەرەب زۆر لە مێژە پێکەوە

ژیاون، ئەگەر بیانەوێ، هەروا بەو جۆرە کە ژیاون هەر ئەژین، ناحەز و گێرەشێوێن ئیتر هیچی پێ ناکرێ و با بۆ خۆی لە داخا یەخەی خۆی هەڵدڕێ!..

✾✾

بەڵێ! ئەمە پارچەیەکە لە ئەدەبی سیاسی؛ ئەم پارچەیە ئەوەمان پیشان ئەدا: کە دیمەنی ئەدەب لەگەڵ ڕەورەوەی مێژوودا گۆڕاوە و ئەگۆڕڕێ. ئەو وشانە کە پێش ئەم سەردەمە بۆ گوزارەیەک ئەوتران، ئێستە بۆ گوزارەیەکی‌تر ئەوترێن. ئەو چەمکانە کە پێشووتر بەرانبەر بەم جۆرە وشانە باویان هەبووە، ئەوانە تۆماریان پێچراوەتەوە و دیمەنێکی تازە لەو چەمکانە هاتۆتە ناوەوە؛ وەیا بڵێین: وشەکان ڕەنگێکی‌تر ئەرێژن بۆ گوزارەی نوێ و نوێتر!!...

«داری ئازادی» و ئاودانی بە خوێن!؛ ئەم جۆرە گوزارشتە تا ئێستە نەکەوتۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. «دار» لە پێشا هەبووە، ئەو دارە بە «ئاو» ئاو ئەدرێ بۆ ئەوە بەرەکەی بێتە ئەنجام. کەچی ئەم، ئەو دارە ئەکا بە ئازادییەک ـکە شتێکی نەبینراوەـ و ئاوی ئەو دارە نەبینراوە، ئەبێ چی بێ بۆ ئەوە بەری سەربەخۆیی بدا بە دەستەوە؟ ـکە ئەمیش هەر نەبینراوەـ؛ ئەو ئاوە هیچی‌تر نییە تەنها خوێن نەبێ ـکە لەبەرچاوەـ لە تێکڵاوکردنی بینراوێک و نەبینراوێک بەرێک دێتە بەرهەم کە کرۆکی ژیانی ئەو نەتەوەیەیە!!...

گوزارەی «برووخێ»یەک کە هۆنەر بەو وشەیە گوزارشتی لێ داوەتەوە، گەلێ جیایە لەو گوزارەیە کە تا ئەو سەردەمە لە دڵدا هەبووە؛ ئەو کەسەی تا ئەو وەختە و ئێستەش لە غەیری ئەم شوێنەدا

گـوێ لە وشـەی «بڕووخـێ» بوایە و ببـێ، خێرا ئـەوەی وەرئەگرت کە «دیوار»ێکـە و ئەبـێ بڕووخێ!. کەچی ئەم، ئـەو گوزارەیە هەر ناوێ!؛ بەڵکـوو «بڕووخێ» بـۆ داگیرکەری ئەوێ و بۆ ئـەوەی داناوە: کە ئەبێ ئـەو داگیرکەرە بڕووخێنرێ و لەناو ببرێ، بۆ ئـەوە ئەو مافەی تۆ داوای ئەکـەی و ئـەو زەوتی کـردووە، وەربگیرێتەوە. ئەگینا ئـەو بە ئارەزووی خۆی ناتداتەوە..

هەمـوو جار زمانی کـوردی ئەڵێ: «مەل بە باڵـێ نافڕێ!». ئەمە کە ئەوترێ، تۆ وا ئەچێتە دڵتەوە کە «باڵندە»یەکە، باڵێکی پێکراوە و ماوەتەوە سـەر باڵێکی، دیارە بەو باڵەی ناتوانێ بفڕێ. کەچی گوزارشـتەکەی ئەم بۆ ئەو وشەیە، زۆر دوورە لە گوزارە بێخییەکە!..

ئەم، نیشـتمانی کردووە بە لەشـی باڵندەیەک، باڵەکانی ئەو باڵندەیە ئـەو پیاو و ئافرەتانەن کە لەو نیشـتمانەدان، ئەم پیـاو و ئافرەتە ئەبێ هەردووکیان بکەونە جووڵە ئەو وەختە لەشەکە ئەکەوێتە خۆی!. ئەگەر یەکێکیان وەسـتان، هەم باڵەکە و هەم لەشەکە هەموویان ئەوەستن!.. دیارە ئـەم گوزارشـتە گەلـێ جیایە لەگەڵ گـوزارەی بێخیی وشـەکەدا، کەچی وشەش هەر یەک وشەیە!!...

بەڵـێ! ئەوتـرێ: «چەپڵـە بە دەسـتێ لـێ نادرێ» بـەڵام لادانی لە چەمکـە بێخییەکـەی خـۆی و دانانی بۆ قۆڵ بـە قۆڵیەکاکردنی کوڕ و کچی ئەو نەتەوەیە، بۆ تەکاندان بۆ پێشـەوە، وە گونجاندنی لەگەڵ ئەو دیمەنەدا، وە پاشـان پشتیوانی ئەو سـنگ بۆ پیشەوە بردنە بکا بەوە کە بڵـێ: ئەمە ئەگـەر وا نەبێ هیچ دەنگ و سـەنگێکی لێوە نایە، چونکە وەکـوو ئـەوە وایە کە چەپڵە بە دەسـتێک لێ بدرێ، خـۆ چەپڵەش بە

یارمەتی دەستەکەی‌تر نەبێ، لێ نادرێت و ئەنجامێک نادا بە دەستەوە. کەواتە، کوڕ و کچی میللەتەکەی ئەبێ وەکوو ئەو دوو دەستە وابن بۆ گەیشتن بە ئەنجام. بەبێ شک ئەمە گوزارەیەکی نوێیە لە وشەیەکی تازەدا، بووکی ئەندێشەی ئەو هۆنەرە ئەمەی دروست کردووە!..

وە یا «گولۆڵەی کەوتە لێژی» ئەم گوزارشتە هەیە لە زمانی کوردیدا بۆ غەیری گوزارەی بناغەیی خۆیشی. تۆ کە ئەو ڕستەیەت بەرگوێ ئەکەوێ، یەکێ لەو دوو گوزارەیەت بە دڵا دێت: یا گولۆڵە بەنێکی ڕاستەقینە کە کەوتبێتە سەرەولێژییەک و نەوەستێتەوە، وەیا ئەوەت دێ بە دڵا: کە یەکێک نەگبەتیی گرتوویەتی و گولۆڵەی بەختی کەوتۆتە لێژی و ناوەستێتەوە و هەر لێی دوور ئەکەوێتەوە.

ئەم دوو گوزارەیەت بە دڵا دێت، چونکە چەرخ، یەک‌لەدوای‌یەک ئەم دووەی بۆ ئەو تاقە وشەیە داناوە. کەچی ئەمەی هۆنەر هیچ‌یەک لەو دووە نییە، بەڵکوو گولۆڵەی بەختی داگیرکەر بۆ تۆ باس ئەکا کە تا ئەو سەردەمە ئەو داگیرکەرە بە هەموو جۆرە پڕوپاگەندەیەک خۆی بردۆتە پێشەوە و لەو ڕێگایەوە بۆ پێشەوە لە تەکانا بووە. کەچی ئێستە هەرچەندە سنگ ئەنێ، هەر لە دواوەیە و نایگاتێ. کەواتە گولۆڵەی فڕوفێڵی کەوتۆتە لێژی و ئیتر ناتوانێ بەرەو سەرکەوتن بڕوا!!..

✽✽

ئەمجا دیمەنی بیر و ئەندێشە و نیاز لەم هۆنراوانەدا:

دیمەنی پارچەکە باسی سەربەخۆیی و ئازادی ئەکا، ئەو نیازەی خستۆتە ناو پەیکەری ئەو تازە وشانەوە کە باس کران. ئەڵێین: تازە وشە، چونکە وەکوو لە فەلسەفەی وشە و گوزارەدا دەرئەکەوێ: وشەیەک کە

دوو جـار وترا -بە وێنە- جاری دووەم، با لە ڕواڵەتا هەر ئەو وشـەیەش بێ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەو نییە!.. چونکە گوزارەکەی گۆڕاوە.

جا ئەم نیازە هەر لە سەرەتای پارچەکەوە بە ڕێکیی هاتۆتە خوارەوە تا دوایـی پارچەکە. بیر ئیشـی خۆی کردووە، چونکـە گوزارە و چەمکی تازەی بـە تـەواوی وەرگرتووە. دیارە ئەندێشـەش دەسـتێکی باڵای هەیە لـە پارچەکەدا؛ توانیویە هەموو جۆرە تاپۆیـەک بخاتە بەرچاو بۆ ئەوە: سۆزی خۆی و گوێگر و خوێنەر بە پوختی ڕاکێشێ!..

سـەرەی ڕومانتیکیشـی هەم لە وشـەدا و هەم لە گوزارەدا نواندووە؛ لە وشـەدا لەبەر ئەو شـتانە کە وتمـان، لە گـوزارەدا: چونکە لە خاڵ و خـەت لای دا و کەوتـە مەیدانێکی‌تـرەوە!. چوونـە ناوەوەی زانیاریـی عەرووز و دەسـتگرتن بە سـەرواوە و لە دیمەنی زاراوەی هۆنراودا بوونی ئـەم پارچەیە بە هەڵبەسـە لە ترۆمـدا، ئەمە ئەوە نادا بە دەسـتەوە: کە بووە بە کلاسیک، چونکە ئێمە پلەی کلاسیک و ڕومانتیک لە گوزارەدا وەرئەگرین ئەمجا لە وشەدا، نەوەک لە زاهیرەی هۆنراودا کە سەروایە!.

کەوابـوو، ئـەم پارچە هۆنـراوە لـە هەمـوو ڕوویـەکـەوە پەردەیەکی ئەدەبی کوردی سـەدەی بیسـتەمی دەرخست، بەتایبەتی ئەدەبێک کە لایەنگری شۆڕش بێ و هەستی نەتەوایەتی لە بارەی شۆڕشەوە ببزوێنێ. وەکووچۆن ئەوەی دەرخست: کە خاوەنی ئەم پارچەیە «تاک»ـێکە لە نەتەوەیـەک. باوەڕی ئەم، باوڕی نەتەوەکەیە و لەو سـەردەمەدا ئەوەی ئەم دەمی بۆ بردووە، باوەڕی هەموو نەتەوەکە بووە!..

ئەمەش لەبەر ئەو دەسـتوورەیە: کە ناسـینی «پاژ» ناسـینی «هاماو»ە، تاکیش بەرانبەر بە نەتەوە پاژە!. کەوابوو بەهۆی ئەم پاژەوە هاماوەکە ناسرا!..

❋❋❋

# سەرچاوە

**بۆ دانانی ئەم کتێبە تەماشای ئەم سەرچاوانە کراوە:**

١ـ «خلاصة تأريخ کورد و کوردستان ـ محمد امین زکی» ـ چاپی قاهیرە ـ ١٩٣٦.

٢ ـ «ایران فی عهد الساسانیین ـ (گریستنسن) ترجمة: یحیی الخشاب و عبدالوهاب عزام» ـ چاپی قاهیرە ـ ١٩٥٧.

٣ـ «بُلدان الخلافة الشرقیة ـ (کی لسترنج) ترجمة: بشیر فرنسیس و گورگیس عواد» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٥٤.

٤ـ «کُرد و پیوستگی نژادی و تاریخی او» ـ رشید یاسمی.

٥ـ «تأریخ مردوخ ـ شیخ محمد آیت اللّه مردوخ».

٦ـ «مێژووی ئەدەبی کوردی ـ عەلائەددین سەججادی» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٥٢ ـ.

٧ ـ «فی النقد الأدبی ـ الدکتور شوقی ضیف ـ دارالمعارف ـ ١٩٦٢».

٨ـ «قصّة الأدب فی العالم ـ احمد امین و زکی نجیب محمود» ـ چاپی قاهیرە ـ ١٩٤٣ ـ ١٩٤٥.

٩ـ «قواعد النقد الأدبی ـ (لاسل آبر کرمبی) ترجمة: محمد عوض محمد» ـ چاپی قاهیرە ـ ١٩٥٤.

١٠ـ «منهج البحث فی الأدب و اللغة ـ (لانسون ـ مابیه) ترجمة: الدکتور محمد مندور» ـ چاپی قاهیرە ـ ١٩٤٦.

١١ـ «الرومانتیکیة ـ (ڤان تیجم) ترجمة: بهیج شعبان ـ بیروت ـ ١٩٥٦».

١٢- «فصول فی الأدب و النقد - الدکتور طه حسین - دارالمعارف - ١٩٤٥».

١٣- «فنون الأدب - (تشارلتن) ترجمة: دکتور نجیب محمود - لجنة التألیف و الترجمة».

١٤ - «فی تأریخ النقد و المذاهب الأدبیة - طه الحاجری - اسکندریه - ١٩٥٣».

١٥- «إحیاء علوم الدین - الغزالی - قاهرة - ١٣٠٢هـ».

١٦- «البیان و التبین - الجاحظ - قاهرة - ١٩٦٠».

١٧. «مختصر المعانی - التفتازانی - ١٩٥٤».

١٨- «مذاهب الأدب - عبدالمنعم خفاجی - ١٩٥٣».

١٩ - «ثقافة الناقد الأدبی - الدکتور محمد البویهی - ١٩٤٩».

٢٠ - «الرمزیة فی الأدب العربی - الدکتور درویش الجندی - ١٩٥٨».

٢١ - «أسرار البلاغة - عبدالقاهر الجرجانی - قاهرة».

٢٢- «نظریة الانواع الأدبیة - ترجمة الدکتور حسن عون - ١٩٥٨».

٢٣ - «الاسلوب - احمد الشائب - قاهرة ١٩٥٦».

٢٤ - «أصول النقد الأدبی - احمد الشائب - القاهرة ١٩٥٥».

٢٥- «النقد الأدبی - سیّد قطب - ١٩٥٩».

٢٦- «النقد الأدبی - (ستانلی هاپمن) ترجمة: الدکتور احسان عباس و الدکتور محمد یوسف نجم».

٢٧- «دلائل الإعجاز - عبدالقاهر الجرجانی - ١٣٦٧هـ».

٢٨- «بین الفلسفة و الأدب - علی ادهم - ١٩٤٥».

٢٩- «الصوفیة فی الاسلام - نیکلسون - ترجمة نورالدین شریبة - قاهرة

- ١٩٣٩».

٣٠- «نقد الشعر - قدامة بن جعفر - ١٩٣٤».

٣١- «نقد النثر - قدامة بن جعفر - ١٩٣٩».

٣٢- «ثورة الأدب - محمد حسين هيكل».

٣٣- «ميزان الذهب فى صناعة شعر العرب - سيد احمد الهاشمى - ١٩٦١».

٣٤- «شرح كتاب نصاب صبيان - محمد حسين طالقانى».

٣٥- «جامع التواريخ - رشيد الدين فضل الله».

٣٦- «برهان قاطع - محمد حسين تبريزى».

٣٧- «فەرهەنگ مەردۆخ - محمد آيت الله مردوخ».

٣٨ - «گاتها - پورداود».

٣٩- «دينكرد - محمد جواد مشكور».

٤٠- «تأريخ ادبيات ايران - ادوارد براون - ١٣٤١ ش».

٤١ - «تأريخ ادبيات در ايران - دكتر ذبيح الله صفا - ١٣٣٨ ش».

٤٢- «سبک شناسى - بهار».

٤٣ - «دەستوور وە فەرهەنگى زمانى كوردى، عەرەبى، فارسى» - علاء الدين سجادى - ١٩٦٢.

٤٤- «شيعر و ئەدەبياتى كوردى» - رفيق حلمى - ١٩٤١ - ١٩٥٤.

٤٥ - «كۆمەڵە شيعرى شاعيرانى كورد» - چاپى بەغدا - ١٩٣٨.

٤٦ - «گۆڤارى گەلاوێژ» - چاپى بەغدا.

٤٧ - «گۆڤارى ڕۆژى نوێ» - چاپى سولەيمانى.

٤٨- «ڕۆژنامەى ژين» - چاپى سولەيمانى.

٤٩ ـ «ڕۆژنامەی پێشکەوتن» ـ چاپی سولەیمانی.

٥٠ ـ «ڕۆژنامەی کوردوستان» ـ چاپی تاران.

٥١ـ «دیوانی بابەتاهیر».

٥٢ـ «گەنجینە ـ دڵزار» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٦٠.

٥٣ـ «دیوانی مەم و زین ـ هەژار» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٦٠.

٥٤ ـ «دیوانی مەلای جزیری» ـ دەستنووس.

٥٥ـ «دیوانی مەم و زین ـ بەشیر شێخ حەسەن» ـ چاپی عامودە ـ ١٩٤٧.

٥٦ ـ «دیوانی مەولەوی ـ مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیس» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٦١.

٥٧ ـ «دیوانی ناڵی» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٣١.

٥٨ ـ «دیوانی ئەحمەد حەمدی بەگ» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٥٧.

٥٩ ـ «دیوانی حاجی قادری کۆیی» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٢٥.

٦٠ـ «دیوانی سەلام» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٥٨.

٦١ـ «دیوانی گۆران (بەهەشت و یادگار ـ فرمێسک و هونەر)» چاپی بەغدا ـ ١٩٥٠.

٦٢ـ «دیوانی شێخ ڕەزا» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٤٦.

٦٣ـ «دیوانی مەحوی» ـ چاپی سولەیمانی ـ ١٩٢٢.

٦٤ـ «دیوانی سالم» ـ چاپی بەغدا ـ ١٩٣٣.

٦٥ـ «کەشکۆڵەکەی مەحموو پاشا» ـ دەستنووس.

***